# ئیسلام و دەوڵەتداریی

بەرگی یەكەم

تەوەری یەكەم

قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك

عەلی باپیر





# ئیسلام و دەوڵەتداریی


نوسینـــــــــــــــی | عەلی باپیر
بڵاوکردنـــــــــەوەی | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
خـــــــــــــــە ت | نەوزاد کۆیی
نەخشەســازی بــەرگ : | أمین مخلص
نەخشەسازی ناوەرۆك: | جمعە صدیق کاکە
نــۆرە و ســاڵی چـاپ: | یەکەم ١٤٣٥ك - ٢٠١٤ز
تـــــــــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپیاردنی ( 2612 ) ساڵی 2013 پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob: +964 750 460 51 22
Tel: +964 750 818 08 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ
وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ .... ﴿٢٥﴾ ﴾ الحديد

# پێشکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی هێنده لەئیسلام تێگەیشتوون، کە دڵنیابن بەبێ هەبوونی دەستەڵاتو قەوارەیەکی سیاسیی، ناگونجێ وەك بەرنامەی گشتگیری ژیانو گوزەرانی تاكو کۆمەڵ جێبەجێ بکرێو، هەتا باڵا دەست نەکرێ، بۆی نالوێ، وەك درەختێکی پڕ سێبەری بەپیتو فەڕ، سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا لەبن سێبەری خۆی بگرێو، بەرو میوەی تەبایىو ئازادیىو یەکسانیىو دادگەرییو، بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی قیامەتیان بۆ بگرێ.

# پێناسەی ئەم کتێبە

خوێنەری بەڕێز!

ئـەم کتێبـە بەهـەر چوار بەرگەکەیـەوە کـۆی پـەنجاو شـەش (٥٦) ئاڵقـەی: ((بەرنامـەی سـەرنج))ە کـە لـە کـەناڵی ئاسمـانیی پـەیامو لـەماوەی سـاڵانی: (٢٠١٠و٢٠١١ز)دا هەفتانە پـەخش دەکرا، کـە دیـارە پاش هێنرانـە سـەر کاغـەزو تایـپ کرانیـان، ئـەو پـەنجاو شـەش وتـارە، خۆیـان لـەدوو تـوێی ئـەم کتێبـەدا بینیوەتەوە.

شایانی باسیشە ئـەم کتێبـە بەگشتیی بـۆ چوار تـەوەری سـەرەکیی دابـە دەبێ:

**تەوەری یەکەم: قـەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنـانی، سروشـتو بناغـەی فیکریـی، پێناسـەی چـەند وشەو زاراوەیەك.**

کە دیارە ئەم تەوەری یەکەمە وەك ڕێ خۆشکردن وایـە بـۆ سـەرجەم باسو بابەتەکانی دیکەی ئـەم کتێبـە، کە لەسێ تەوەرەکەی دیکەدا دێن.

**تەوەری دووەم: بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا:**

شایانی باسیشە ئـەم تەوەرەیـە گرنگترینو گـەورەترین تـەوەری ئـەم کتێبەیەو زۆرترین پانتایی بەرکەوتوەو، کە تێیدا بەدرێژیی قسە لە

دە (١٠) بنەمای گەورەو گرنگی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی (أسس نظام الحكم الإسلامي) کراوە.

**تەوەری سێیەم: سێ دەستەڵاتەکانی: یاسادانان، جێبەجێکردن، دادوەریی لە قەوارەیەکی سیاسیی ئیسلامییدا:**

لەم تەوەری سێیەمەدا تیشك دەخەینە سەر هەرسێك پێکهێنەرە سەرەکییەکەی دەوڵەتو قەوارەی ئیسلامیی:

١- دەستەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية).

٢- دەستەڵاتی جێبەجێکردن (السلطة التنفيذية).

٣- دەستەڵاتی دادوەریی (السلطة القضائية).

**تەوەری چوارەم: نامسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا:**

لەم تەوەری چوارەمو کۆتایی ئەم کتێبەدا، لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامییەوە لەگەڵ نامسوڵمانێك کە لەژێر سایەیاندا دەژینو هاووڵاتیانن، دەدوێین.

هەرلێرەشەوە بەپێویستی دەزانم سوپاسو پێزانینی پڕ بەدڵی خۆم پێشکەشی سەرجەم ئەو برا دڵسۆزانەم بکەم، کە ئەركو ماندووبوونی زۆریان بەم کتێبە کێشاوە، خوا بە باشترینو چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو نموونەیان زۆر بکات، بەتایبەت:

١- **کاك (هیوا حاجی نجم الدین)**، کە مشوور خۆرێکی باش بوو بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری هێنرانە سەر کاغەزو تایپ کرانی بەرنامەکان.

٢- **کاك (یعقوب کاکل)** کە زۆربەی ئەرکی تایپکرانی بەرنامەکانی خستە سەرشانی خۆی.

٣- **کاك (مەلا بیلال قەلادزەیی)**، کە ئەرکی پێداچوونەوەی سەرجەم بەرنامەکانی پاش تایپکرانیانی بەئەستۆوە گرت و کارئاسانییەکی باشی بۆ کردم.

٤- **کاك (حیدر مظفر)**، کە پاش پێداچوونەوەی خۆم، ئەرکی هەڵە ڕاستکردنەوەی سەرجەم بەرنامەکانی کێشا.

سەرچاوەکانی ئەم کتێبەشم بەهەرچوار تەوەرەکەیەوە، پاش قورئان و سوننەت و سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو کتێبانەن کە هەوڵمداوە هەرشتێکم لێوە هێنابن ئاماژەیان پێبکەم و لەپەراوێزدا دەیاننوسین.

لە کۆتایی پێناسەی ئەم کتێبەشدا دەڵێم:

ئەم کتێبە بەرهەمی چەند ساڵێك تێفکرین و موتالاو لێکۆڵینەوەیەو، هیوادارم بەوردییش بخوێندرێتەوەو فام بکرێ و بەهرەی لێوەربگیرێ و، هەروەها بابەتییانەش لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ و، بەهەمو ولایەکیش هەوڵی پراکتیزە کردن و جێبەجێکردنی نێوەڕۆکەکەی بدرێ.

ئاشکراشە کە بابەتی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی، گرنگترین و هەستیارترین بابەتە لەژیانی مرۆڤدا بەگشتیی و، کاریگەریی لەسەر تێکڕای لایەنەکانی دیکەی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ هەیەو، جوڵاوترین و زیندووترین بابەتیشەو، زۆرترین گۆڕان و نوێبوونەوەی بەسەردادێ، بۆیە پێویستە هەموولایەکمان بەتەواویی چاو و گوێی عەقڵ و دڵمان لەتەك ئەو بابەتە گرنگ و هەستیارەدا بکەینەوە، چونکە ئەگەر وانەکەین و وانەبین، هەرچی زیاتر دینمان لەژینمان بەجێ دەمێنێ!

ماوەتەوە بڵێم:

هەرچەندە ناوونیشانی زنجیرە وتارەکەی بەرنامەی (سەرنج) بریتیی بوو لە: {ئیسلامو دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی} بەڵام ناو و نیشانی کتێبەکەمان بەمەبەستی کورتکردنەوە بەمجۆرە لێکرد: ((**ئیسلامو دەوڵەتداریی**)).

خوایە! بەم کتێبە خوێنەرانی بەڕێز بەهرەمەندو بەرچاوڕوون بکەو، تا تەرازووی خێرو چاکەکانی بەندەشی لەقیامەتدا پێ قورس بکە، ئامین

٢٣/ ڕەجەبی/ ١٤٣٤ کۆچی

٢/حوزەیرانی/٢٠١٣ زایینی

هەولێر

**الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمران

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾النساء.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

**أَمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةِ فِي النَّار[1].**

خوێنەری بەڕێزو سەنگین !

هەرکەس بەئەلف و بێی مێژووی بەشەر ئاشنابێ، دەزانێ کە هیچ کاتێك "لەوەتەی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی ژیاوە" ژیانی لەکێشمە کێش و تێکگیران و شەڕو هەرا خاڵیی نەبووە، جا چ بەهۆکارو پاڵنەری سیاسیی، یان ئابووریی، یان

[1] - ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەرێزی فێردەکرد پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیلێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

کۆمەڵایەتیی، یان عەقیدەییو فیکریی،.... یان... هتدەوە بووبێ.

ئنجا هەر ئەوەشە کە داوای لە عاقڵمەندان کردوە، کە پێویستبوونی هەبوونی قەوارەو دەستەڵاتێکی سیاسیی "بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان" لەنێو هەر کۆمەڵگایەکی بەشەرییدا، بەشتێکی ڕوونو بێ چەندو چوون دابنێن.

خوای کاربەجێش (سبحانه وتعالى) زۆر بەڕوونو ڕاشکاویی ڕایگەیاندوە کە تێکڕای پێغەمبەرانی پایەبەرزو هەڵبژاردەی خۆی بۆ ئەوە ڕەوانە کردوون، کە دادگەریی لەنێو خەڵکیدا بچەسپێنن، وەك فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾﴾ الحديد.

واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە ڕەوانە کردوونو، کتێبو تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك دادگەریی بەڕێوەبەرن، وەئاسنیشمان ناردۆتە خوار هێزێکی زۆرو سوود گەلێکی بۆ خەڵکی تێدایە، وە" خوا پێغەمبەرانی خۆی بەو شێوەو بۆ ئەو ئامانجە ناردوون" تاکو خوا بزانێ (بەزانینی دەرکەوتن لەواقیعدا) ئایا کێ خۆیو پێغەمبەرانی بەنادیاریی (بێئەوەی خوا ببینێ) سەردەخات؟ بەدڵنیاییەوە خوا بەهێزی زاڵە.

هەڵبەتە شتێکی ئاشکراشە کە چەسپاندنی دادگەریی "کە ئامانجو مەبەستی تێکڕای پێغەمبەرانی خوایە (علیهم الصلاة والسلام والبركات)" لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەراندا: نەتەوەیی، سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، "چونکە خوا بەگشتیی باسی دادگەریی (قسط)ی کردوەو نەیبەستۆتەوە بەلایەنێك یان چەند لایەنێکەوە"، بەڵێ چەسپاندنی دادگەریی

گشتگیرو هەمەلایەنە، بەبێ هەبوونی دەستەڵاتو قەوارەیەکی سیاسیی نایەتەدی، هەربۆیەش خوای بەرزو مەزن پاش خستنە ڕووی ئامانجو مەبەستی ڕەوانەکرانی پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ ...وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ... ﴾ الحدید، واتە: ...وەئاسنیشمان دابەزاندوە هێزێکی زۆری تێدایە، وەسوودو کەڵکی زۆر بۆ خەڵك...

کە پێم وایە ﴿ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ﴾ ئاماژەیە بە هەرکام لە: تەکنۆلۆژیای سەربازییو مەدەنیی.

کەواتە:

بەبێ هەبوونی هێزو دەستەڵات ناگونجێ دادگەریی بچەسپێو، دیارە هێزو دەستەڵاتیش پەکی لەسەر قەوارەیەکی سیاسیی دەستڕۆیشتوو و گوێ بۆ گیراو و فەرمانبەریی بۆ کراو، کەوتوە.

ئنجا ڕەنگە یەکێك لێرەدا بپرسێ:

ئەدی مادام تێکڕای پێغەمبەران بۆ چەسپاندنی دادگەریی نێرراونو ئەویش بەبێ دەستەڵاتو قەوارەی سیاسیی نایەتە دی، بۆچی لەمێژوودا نابینین هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەستەڵاتو قەوارەی سیاسیی بنیات بنێن؟!

وەڵامەکەشی ئەوەیە کە بێگومان پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەوڵی هێنانەدی قەوارەی سیاسییان داوە، بەڵام دیارە زۆربەیان بۆیان نەلواوە قەوارەی سیاسیی دروست بکەن، چونکە بێگومان دروستبوونی قەوارەی سیاسیی "وەك لەباسێکی تەوەری یەکەمی ئەم کتێبەدا دەیخەینەڕوو" پەکی لەسەر بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی کەوتوە، ئەویش پاش ئیقناعکردنی خەڵکێك کە ئەو ئەرکەیان پێ ئەنجام بدرێ، چونکە بێگومان شەرعییەتی

خـــوایی‌و ئاسمـــانیی "کەهـــەموو پێغەمبـــەران هـــەیانبووە" بـــەس نیـــە بـــۆ دروســـتبوونی قـــەوارەی سیاســـیی، بـــەڵکو پێویســـتە شـــەرعییەتی زەمینیـــی‌و خـــەڵکیش هـــەبێ، کـــە دیـــارە زۆربـــەی پێغەمبـــەران "علـــیهم الســـلام" ئـــەوەی دووەمیـــان بـــۆ دەســـتەبەر نـــەکراوە، بۆیـــەش ســـەرەنجام قـــەوارەی سیاســـییان بـــۆ بنیـــات نـــەنراوەو، لەســـۆنگەی ئەوەشـــەوە دادگـــەریی (عـــدل ــ قســـط)یـــان بـــۆ نەچەسپێنراوە.

بەڵام ئایا ئەوە مانای وایە کە نێررانی زۆربەی پێغەمبـەران (علـیهم الصـلاة والسلام والبرکات) بێ ئاکام‌و ئەنجام بووە؟!

بێگومان نەخێر، چونکە:

خوای بەرزو مـەزن "عزوجل" کە باسـی حیکمـەت‌و ئامـانجی ڕەوانـەکرانی پێغەمبـــەرانی خـــۆی کـــردوە، دووشـــتی کردوونـــە حیکمـــەت‌و ئامـــانجی ڕەوانەکرانیان:

یەکـــەم: بەنســـبەت پەیوەنـــدیی مرۆڤەکانـــەوە لەگـــەڵ خـــوادا، هـــەموو پێغەمبەران هاتوون کە مرۆڤەکان خوا بە یەکگرو تەنیا خوا پەرست (مُوحِّد) بن، وەك خـوای زانـاو شـارەزا فەرموویـەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنبیـــاء، واتـــە: وە لـــەپێش تـــۆدا "ئەی موحەممەد!" هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر پێمـان ڕاگەیانـدوە کە جگە لەمن هیچ پەرستراونین، دەجا بەس من بپەرستن.

دووەم: بەنســبەت پەیوەنــدیی مرۆڤەکانــەوە لــەنێو خۆیانــدا، وەك پێشــتر گوتمان، تێکڕای ئەو زاتە بەرزو بەڕێزانـە بـۆ ئـەوە نێـرراون، کـە خـەڵکی وادار بکەن لەنێو خۆیان دادگەریی بچەسپێنن.

ئنجا ئاشکراشـە کـە یەکتاپەرسـتیی (توحیـد)و تـەنیا بەنـدەی خـوا بـوونی مرۆڤەکان، بناغەیەکی یەکجار پتـەو و مەحکـەمی تـەبایی‌و پێکـەوە برابـوون‌و

سەرەنجام بەدادگەریی بەڕێوەچوونیانە، وەلە ڕاستییدا پێکەوە تەبابوونی مرۆڤەکانو پاشان بەدادگەریی بەڕێوەچوونیان، هۆکارو ئامرازی سازاندنی زەمینەو کەش و هەواو ژینگەی ئامانجی گەورەو گرنگی هاتنی پێغەمبەرانە، کە یەکتاپەرستو خوا بەیەکگر (موحد)کردنی مرۆڤەکانە.

لەسۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤەکان لەژێر سایەی قەوارەیەکی پیادەکەری دادگەرییدا، ئازادانەو سەربەستانە دەتوانن تاقیکردنەوەی ژیانی دنیایی خۆیان بدەنو، ئیمان بەخوا بێنن و بەندایەتیی بۆ بکەن، یان بێ ئیمان بنو بەندایەتیی بۆ خوا نەکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، واتە: وەبڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جا کێ حەزدەکات با ئیمان بێنێو، کێش حەزناکات با بێبڕوابێ...

بەڵێ خوێنەری سەنگین!

ئەوەی گوتمان بناغەی فیکریی دەوڵەتو قەوارەی سیاسییە لەئیسلامدا، بەڵام لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ:

ئەدی کوا شێوەو فۆرمو چوارچێوەو هێڵە گشتییەکانو بنەما سەرەکییەکانی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی لەئیسلامدا چییەو چۆنو چەندن؟!

لەوەڵامدا دەڵێین:

وەڵامی ئەو پرسیارانە هەویرێکی ئاو خوازەو، لەڕاستییدا کۆی باسو بابەتەکانی ئەم کتێبە بەهەر چوار تەوەرە سەرەکییەکەیەوە، بۆ ئەوە خرانە ڕوو کە وەڵامگۆی ئەو پرسیارانەو پرسیار گەلێکی دیکەی هاوشێوەیان بن، بەڵام لێرەدا هەر بەکورتیی و گوشراویی دەڵێین:

لەسۆنگەی ئەوەوە کە بابەتی دەوڵەتداریی و حوکمو سیاسەت بەگشتیی لەبازنەی عادەتو هەڵس و کەوتەکاندایەو، لەبواری عادەتو هەڵسو

کەوتەکانیشدا چونکە عەقڵ و توانای ئەسپی خۆتاودان و قسەکردنی هەیە، خوای کاربەجێ بەدانانی چوارچێوەیەکی فراوان و چەند هێڵێکی گشتیی و بنەمایەکی سەرەکیی وازی لێهێناوەو، بۆشاییەکی زۆری لەو بوارەدا بەجێهێشتوە، چونکە زانیویەتی کە عەقڵ دەتوانێ بەگوێرەی پێداویستی کۆمەڵگاکان لەرۆژگارە جۆراوجۆرەکاندا، پڕی بکاتەوە.

هەڵبەتە هەربۆیەش زانایانی قووڵبووەوە لەوبارەوە بنچینەیەکیان داناوە بۆ هەرکام لەخوا پەرستییەکان (العبادات)و هەڵس و کەوتەکان (العادات ــ المعاملات) کە دەڵێ:

**(الأصل في العبادات الحظر، الاّ ما ورد عن الشارع تشريعه، والأصل في العادات الإباحة الاّ ما ورد عن الشارع تحريمُهُ)**[1].

واتە: بناغە لەخوا پەرستییەکاندا قەدەغەبوونە، مەگەر ئەوەی شەرعدانەر دایبنابێ دەنا ڕەوا نیە، بەلاّم بناغە لەعادەت و هەڵس و کەوتەکاندا ڕەوایی و ڕێ پێدرانە، مەگەر ئەوەی شەرعدانەر قەدەغەی کردبێ، ئەگەرنا قەدەغەنیە.

شایانی باسیشە کە زانایانی قووڵبووەوەی ئیسلام هەر زوو هەستیان بەو ڕاستییە کردوە "کە لەبواری دەوڵەتداریی و حوکم و سیاسەتدا دەقەکانی شەریعەت کە من و بۆشایی زۆر بۆ عەقڵ و ئیجتیهاد بەجێهێڵراوە"، بۆ نموونە:

١- (إمام الحرمين الجويني) کە لەنێوان ساڵەکانی: (٤١٩ــ٤٧٨)ی کۆچییدا ژیاوە لەکتێبی: {غياث الأمم في التياث الظلم (الغياثي)}دا لەوبارەوە گوتوویەتی:

**(ولا مطمع في وجدان نصٍّ من كتاب الله تعالى في تفاصيل الإمامَةِ**

[1] - بڕوانە: أصول الفقه المهمة، للعلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي: ص١٠٥،١٠٦، هەروەها بڕوانە: القواعد الفقهية النورانية، لشيخ الإسلام ابن تيمية، ص١١٢، کە هەمان بنچینەی بە بێژەیەکی دیکەی درێژهێناوەو دواتر بەتەواویی دەیهێنین.

**والخَبَـرُ المتـواتر معـوز**[1] **أيضـاً، فَمـآل الطلـب في تصـحيح المـذهب الى الإجماع...)**[2]، واتە: وەهیچ ئومێدێك نیە بۆ دۆزینـەوەو پەیـداكردنی دەق لــە كتــێبی خــوای بــەرزدا لەســەر وردەكارییــەكانی پێشــەوایەتیی (حوكمڕانیی)، هەروەها فـەرموودەی موتـەواتیریش لـەوبارەوە هەرچـنگ ناكەوێ، بۆیە ناچارین لەوبارەوە پەنا بەرینەبەر كۆدەنگیی..

٢- (ابن قیم الجوزیة) ئەمیش كە لەنێوان ساڵەكانی: (٦٩١ــ ٧٥١)ی كۆچییدا ژیـاوە، لـەوبارەوە لەكتێبـە ناودارەكـەی خـۆی (إعـلام المـوقعين عـن رب العالمين)دا لەوبارەوە گوتوویەتی:

**(الرأي في العمل بالسياسة: وَجَرت في ذلك مناظرة بين أبي الوفـاء ابـن عقيل وبين بعض الفقهاء، فقال ابن عقيل: العمل بالسياسة هو الحَزمُ ولا يخلو منه إمامٌ، وقال الآخر: لاسياسة الاّ ما وافق الشرع، فقال ابن عقيل: السياسة ماكان من الأفعال بحيث يكون الناس معه أقـرب الى الصـلاح وأبعد عن الفساد، وان لم يُشَرِّعْهُ الرسول صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ ولا نزل به وحي، فإن أردت بقولك: لاسياسة الاّ ما وافق الشرع، أي: لم يخـالف مـا نطق به الشرعُ، فصحيح، وان أردت: مانطق به الشـرع، فغلـطٌ وتغلـيطٌ للصحابة...)**[3].

واتە: بۆچوون لەبارەی كاركردن بەسیاسەتەوە:

لــەوبارەوە وتوێــژێك لــەنێوان (أبــي الوفــاء ابــن عقيــل)و یــەكێك لەشەرعزاناندا بوو، (ابن عقیل) گوتی: كاركردن بەسیاسەت (مەبەستیان

---

[1] - أعوز الشيءُ فهو مُعْوِزٌ: عَزّ فلمْ يوجد، المعجم الوسيط، ص٦٣٦.
[2] - الغياثي، ص١٠٠.
[3] - ج٤، ص٤٦١،٤٦٠.

پێ عەقڵ‌و ئەزموون بووە) ڕای ڕاست‌و بەجێیە، وەهیچ حوکمڕانێك نەبووە ئەوەی نەبووبێ.

زانایەكی دیكەش گوتی: هیچ سیاسەتێك ڕەوانیە مەگەر بەپێی شەرع بێ.

(ابن عقیل)یش گوتی: سیاسەت (واتە: سیاسەتی شەرعیی ڕاست) هەر ڕەفتارێكە كە خەڵك بەهۆیەوە لەچاكسازیی‌و بەرژەوەندیی نیزیكترو لەخراپەو زیان دوورتربن، هەرچەندە پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) داینەنابێ‌و وەحیشی پێ نەهاتبێتە خوار، ئنجا ئەگەر مەبەستت لەوە كە دەڵێی: (هیچ سیاسەتێك ڕەوانیە مەگەر بەپێی شەرع بێ) واتە: دژ نەبێ لەگەڵ ئەوەی شەرع گوتوویەتی‌و تێكنەگیرێ، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر مەبەستت ئەوەبێ كە دەبێ شەرع گوتبێتی‌و دەقی لەسەربێ، ئەوە هەڵەیەو سەردەكێشێ بۆ بەهەڵەدانانی هاوەڵانیش.

پاشان (ابن القیم) باسی مەسەلەیەكی زۆر گرنگ دەكات كە پوختەكەی بریتیە لە: كەمتەرخەم بوونی زۆرێك لەزانایان بۆ هەڵهێنجانی یاسای تازەو، دۆزینەوەی میكانیزمی هاوچەرخ‌و گونجاو بۆ چارەسەری گرفت‌و كێشەكانی كۆمەڵگا بەپێی شەریعەت‌و، خۆناچار بینیی حوكمڕانان، كە بەبێ گەڕانەوە بۆ زانایانی شەرعزان، هەڵسن بەدانانی كۆمەڵێك یاساو بڕیاری سیاسیی‌و ئیداریی، بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری كۆمەڵگا..

ئەمەش دەقی قسەكانی ئەو كەڵە زانایەن:

**(قلت: هذا موضع مزلّة أقدام ومَضَلّة أفهام، وهو مقام ضنكٌ في معترك صعْب، فرَّط فيه طائفة، فعطَّلوا الحدود وضيَّعوا الحقوق وجَرَّءوا أهل الفجور على الفساد، وجعلوا الشريعة قاصرة لاتقوم بمصالح العباد، وسدُّوا على أنفسهم طرقاً صحيحة من الطرق التي يُعْرَفُ بها المُحِقُّ من**

**المبطل وعطّلوها مع علمهم وعلم الناس بها أنها أدلّة حقٍّ، ظناً منهم منافاتها لقواعد الشرع، والذي أوجب لهم ذلك نوع تقصير في معرفة حقيقة الشريعة والتطبيق بين الواقع وبينها، فلما رأى ولاة الأمر ذلك، وأن الناس لايستقيم أمرهم الاّ بشيء زائدٍ على ما فَهِمَهُ هؤلاء من الشريعة، فأحدثوا لهم قوانين سياسية ينتظم بها مصالحُ العالم، فَتَولَّدَ من تقصير أولئك في الشريعة، وإحداث هؤلاء ماأحدثوهُ من أوضاعهم السياسة، شرٌّ طويلٌ وفساد عريض وتفاقَم الأمر وتعذَّر استدراكه)**[1]

واته:

گوتم: ئەم مەسەلەیە شوێنێکە پێیەکانی لێ دەخلیسکێن و عەقڵەکانی تێدا بەهەڵەدا دەچن، وە ئەم مەسەلەیە وەك وەستانە لەشوێنێکی تەنگەبەر، لەڕووبەڕوو بوونەوەیەکی سەختدا، کە هەندێك تێیدا تووشی بەزایەدان و کەمتەرخەمیی بوون و، بەوهۆیەشەوە سزایەکانیان پەکخستوەو مافەکانیان زایەکردوە، وە خراپەکارانیان بۆ خراپە کاریی هانداوە، وەشەریعەتیان وا خستۆتە بەرچاو کە توانای هێنانەدی بەرژوەندییەکانی خەڵکی نیە، وەچەندان ڕێی ڕاستیان کە بابای خاوەن هەق و بابای ناهەقیان پێ لەیەك جیا دەکرێتەوە، لەسەر خۆیان بەستوون و پەکیان خستوون، هەرچەندە خۆشیان و خەڵکیش دەزانن کە بەڵگەی هەق و ڕاستن، چونکە گومانیان وابووە کە پێچەوانەی بنچینەکانی شەریعەتن، ئنجا هۆکاری ئەو هەڵوێستەشیان بریتیە لە کەم شارەزاییان لەناسینی حەقیقەتی شەریعەتداو جێبەجێکردنی بەسەر واقیعدا، ئنجا کاتێك حوکمڕان و کاربەدەستانیش ئەوەیان بینیوە، وەزانیویانە کە کاروباری خەڵك ڕێك نابێ و بەڕێوەناچێ مەگەر بەشێکی

---

[1] - إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج٤، ص٤٦١.

زیاتر لەوەی کە ئەو شەرعزانانە لەشەریعەتیان فامیوەتەوە، هەڵساون بەدانانی چەند یاسایەکی سیاسیی کە بەرژەوەندییەکانی خەڵکیان پێ دابین بکەن‌و کاروباریانیان پێ ڕێك بخەن.

وەسەرەنجام بەهۆی کەمتەرخەمیی ئەو زانایانەوە لەتێگەیشتنی شەریعەت‌و داهێنانی ئەو حوکمڕان‌و کاربەدەستانەوە بۆ یاسا سیاسییەکان، خراپەیەکی بەردرێژ‌و زەرەرو زیانێکی بەرفراوان پەیدابووەو، ڕەوشەکە زۆر تێکچووەو چاککردنەوەی زۆر قورس بووە.

وەك دەبینین:

(ابن القیم) نیزیکەی حەوت سەد (٧٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەرکی بەو ڕاستییە کردوە، کە بەبێ چاوی عەقڵ‌و دڵی خۆکردنەوەی زاناو شەرعزانان لەبواری سیاسەتی شەرعیی‌و بابەتی حوکمڕانییدا، دین لەژین بەجێ دەمێنێ‌و حوکمڕان‌و کاربەدەستان ناچار دەبن، یان بەلای کەمەوە بەهانەیان چنگ دەکەوێ، کە بۆ چارەسەری گەلێك کێشەو گرفتی تازە کە بەرۆکی کۆمەڵگا دەگرن‌و، ڕێکخستنی گەلێك کاروبار کە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ڕۆژگاردا سەرهەڵدەدەن، پەنا بەرنە بەر خواستنەوەی یان داهێنانی گەلێك یاساو بڕیار بەبێ گەڕانەوە بۆ شەریعەت‌و پرسکردن بەشارەزایانی شەریعەت!

هەڵبەتە ئێستاش لەهەندێك لەو قەوارەو حکوونەمانەدا کە خۆیشیان بە پابەند بەشەریعەتەوە دەزانن، ئەو حاڵەتەی بەجێمانی دین لەژین بەزەقی دیارە، بۆ وێنە: قەوارەی وا هەیە کە شەرعزان لەدنیاو ژین بێ خەبەرەکانی بەناوی ئیسلامەوە: هەڵبژاردن، هەبوونی حیزب‌و ڕێکخراوی سیاسیی‌و مەدەنیی، خۆپیشاندان (المظاهرة)، ڕێپێوان (المسیرة)، بەستنی کۆڕو سیمیناری سیاسیی، مانگرتن‌و.. گەلێك شتی دیکەش، بەقەدەغە دادەنێن، هەر بەبیانووی ئەوەی گوایە ئەو شتانە لەڕۆژگاری پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی‌و پێشینەی چاك (السلف الصالح)دا نەبوون! بێخەبەر لەوە

کـە لـەبواری هـەڵس و کـەوت و عادەتەکانـدا، بناغـە دەسـتکراوەیی و ڕەوایـی و ڕێپێدرانە، مەگەر دەقێکی ڕوون و بێ چەندوچوونی شەریعەت ڕێمـان لێبگرێ، وەسـەنگی مەحـەك بریتیـە لـە چەسـپاندنی دادگـەریی (تحقیـق العـدل) و هێنانـەدی بەرژەوەنـدیی خـەڵك (تحقیـق مصـلحە النـاس)، وەك (ابـن القـیم) لەوبارەوە گوتوویەتی:

**(فإنَّ الله أرسل رُسُلَهُ وأنزل كُتُبَهُ ليقوم الناس بالقسط، وهو العـدل الـذي قامت به السماوات والأرض، فإذا ظهرت الحق وقامت أدلة العقل.**

**وأَسْفَرَ صُبْحُهُ بأي طريق كان، فثمَّ شَرْعُ الله ودينه ورضاه وأمره... ولا نقـول ان السياسة العادلة مخالفة للشريعة الكاملة، بل هي جزءٌ من أجزائها وبابٌ من أبوابها، وتسميتها سياسة أمر اصطلاحي، والاّ فـإذا كانـت عـدْلاً فهـي مـن الشرع...)**[1].

واتە: بێگومان خوا پێغەمبەرانی خۆی ناردوەو کتێبەکانی خۆی دابەزانـدوە تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن، ئـەو دادگەرییـەی کـە ئاسمانـەکان و زەوی پێوەی وەستاون، جا هەرکات نیشانەکانی حـەق دەرکـەوتن و، بەڵگەکانی عـەقڵ ئاشـکرابوون، وەبەهـەر ڕێیـەك بـێ بەرەبەیانەکـەی دەرکـەوت، ئـەوە شـەرع و ئایین و ڕەزامەندیی و فەرمانی خـوا لەوێیـە... وەناشڵێین: سیاسـەتی دادگەرانـە پێچەوانەی شەریعەتی تێروتەواوە، بەڵکو بەشێکە لەبەشـەکانی و دەروازەیەکـە لـەدەروازەکانی، وە نـاونرانی بەسیاسـەت شـتێکی زاراوەییـە، ئەگـەرنا مـادام دادگەرانەبێ، بەشێکە لەشەریعەت..

[1] - إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج٤، ص٤٦١، ٤٦٢.

ئنجا خوێنەری بەڕێز!

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێم:

**یەکەم:** مادام دەقەکانی شەریعەت لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا بەگشتیی و سیاسەت و حوکمڕانییدا بەتایبەت، کەم و سنوورداربن و، شەریعەت بەدانانی چوارچێوەی فراوان و کۆمەڵێك هێڵی گشتیی و بنەمای سەرەکیی لەوبوارەدا وازی هێنابێ و، بۆشایی (فراغ) زۆری بۆ عەقڵ و ئیجتیهادی بەشەر هێشتبێتەوە، تاکو بەگوێرەی گۆڕانی ڕۆژگارو بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگاو پێداویستییەکانی خۆی پڕی بکاتەوە.

**دووەم:** وە مادام سەنگی مەحەك و تەرازووی بواری هەڵس و کەوتەکان بەحوکم و سیاسەتیشەوە، بریتی بێ لە چەسپاندنی دادگەریی و هێنانەدی بەرژەوەندیی.

بەڵێ مادام حاڵ بەوجۆرەبێ:

هەم ناچارین و هەم پێویستیشە کە ئێمەی مسوڵمان لەم سەدەی پازدەیەمی کۆچیی و بیست و یەکەمی زایینیدا، پاش لەبەرچاوگرتنی ئەو چوارچێوە فراوانەی شەریعەت دایناوەو، ئەو هێڵە گشتیی و بنەما سەرەکییانەی دیارییکردوون لەبواری دەوڵەتداریی و حوکمڕانییدا، بەمانای وشە:

ئازادانەو ئازایانە چاو و گوێی عەقڵ و دڵمان بەتەواویی بکەینەوەو سەرنجی واقیع و هەل و مەرجی خۆمان بدەین و، پاشان لەئەزموونگەلی بەشەرەوە لەبواری حوکمڕانییدا ڕابمێنین و، کۆشش (إجتهاد) بکەین بۆ گەیشتن بەباشترین ئەو یاساو بڕیارو میکانیزمانە پێویستن بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکانمان، لەهەموو بوارەکانی سیاسیی و ئیداریی و ئابووریی و ..هتددا.

شایانی باسیشە من لەم کتێبەمدا هەوڵمداوە لەسەر ئەو بنەمایە کە ئاماژەم پێدا، باسی چۆنییەتی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی بکەم لەکۆمەڵگایەکی

ئیسلامییدا "چ لە هەرێمی کوردستانو عێراقو چ لەهەر وڵاتێکی دیکەدا" کە لە سەدەی پازدەیەمی کۆچییو بیستو یەکەمی زاییندا دەژی.

کۆتا قسەشم لەم پێشەکییەدا "کە تۆزێك درێژ بۆوە، بەڵام بەپێویستم زانی چونکە بۆ کۆی بابەتەکانی ئەم کتێبە بەهەر چوار تەوەرەکەیەوە نووسراوە" ئەوەیە کە:

دەبێ ئێمەی مسوڵمان دان بەو دوو ڕاستییە تاڵە دابنێین کە:

**یەك:** ئێمەی ئەهلی ئیسلام لەبواری فیقهو کەلەپووری سیاسەتو حوکمڕانییدا زۆر کەم تفاقو نەدارین، لەچاو مەزنییو بەرزیی ئیسلامو پەیامە مرۆڤایەتییەکەیو ئامانجە باڵایەکانیو، لەمێژە زۆربەی زانایانی ئیسلام لەبواری حوکمو سیاسەتدا خزێنراونە پەراوێزی کۆمەڵگاوەو، بەناچاریی هەر سەرگەرمی فیقهی تاکییو خێزانییو کۆمەڵایەتییو سەوداو مامەڵەو بازرگانیی بوون.

هەر بۆنموونە:

ئەگەر بەراوردێکی نێوان شووڕاو دیموکڕاسیی بکەین، کە یەکەمیان شێوازو میکانیزمی حوکمڕانیی ئیسلامییو، ئەوی دیکەشیان شێوازو میکانیزمی حوکمڕانیی ڕۆژئاواییە، جیاوازییەکی گەورە دەبینین، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە دیموکڕاسی بواری پێدرا گەشە بکاتو، لەسەر ئەرزی واقیع پیادەببێو، کۆمەڵێك ڕێساو یاساو میکانیزم کە پەکی لەسەریان کەوتبوو، بۆی دەستەبەر بکرێنو دابهێنرێن، بەڵام حوکمی میراتییو بنەماڵەییو خۆسەپێنەرانەی ئومەوییو عەبباسییو عوسمانییەکان، کە پاش چوار خەلیفە ڕاشیدەکان خوا لێیان ڕازی بێ دەستی پێکرد، ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلامیی "کەلە ئەسڵدا زۆر لە دیموکڕاسیی ڕۆژئاوایی فراوانترو فرە ڕەهەندترە" پەکخستو نەیهێشت ڕۆڵی خۆی لەبواری حوکمڕانییدا بگێڕێ، هەرچەندە لەبوارەکانی دیکەدا

بەتایبەت زانستو فیکرو فەتوا، لەسەر ڕۆڵگێڕانی خۆی هەر بەردەوام بوو.

**دوو:** واقیعی سیاسیی ئێستای دەوڵەتانی دنیا زۆر زۆر جیاوازە، لەو واقیعەی کە دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی "خوا لێیان ڕازی بێ" تێیدابوون، بگرە واقیعی سیاسیی ئێستای دەوڵەتان، زۆر لەواقیعی ڕۆژگاری ئومەوییو عەبباسییو عوسمانییەکانیش جیاوازە.

وە لەڕاستییدا دەوڵەتانی ئێستای دنیا بەتایبەت جیهانی ڕۆژئاواو زۆرێك لە وڵاتانی نا مسوڵمانی دیکە، بەرەو پێشچوونێکی گرنگیان لەبواری دەوڵەتدارییو حوکمڕانییدا بەخۆوە بینیوە، هەرچەندە بێگومان لە هەڵەو پەڵەی زل زلیش خاڵی نین.

بۆیە پێویستە لەپێگەی باوەڕو متمانە بەخۆبوونو، بەدوای هەقو ڕاستییو چاکەدا عەودالْ بوونو، چەسپاندنی دادگەرییو، دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیی پێ پێوەرو سەنگ مەحەك بوونەوەو، بەبێ هیچ جۆرە هەستیاریی (حساسية)یەکەوە، تەماشای ئەزموونی دەوڵەتدارییو حوکمڕانیی دەوڵەتانی پێشکەوتووی دنیا بکەینو، وەك جێبەجێکردنی فەرمانی خوا:
﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾ الزمر، واتە: دەجا موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، پاشان شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، وەهەر ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بەڵێ با وەك جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەی خواو، کارکردن بە: {**الحِكْمَةُ ضَالَّةُ المُؤْمِنِ فَحَيْثُما وَجَدَها فَهُوَ أَحَقُّ بِها**}، هەوڵبدەین چی چاكو بە کەڵکەو بەرژەوەندییەکانمان دێنێتەدی، بیخوازیینەوەو عەقڵو ئەزموونی خۆمان

بەهی خەڵك دەوڵەمەند بکەین‌و، لەمەشدا بێگومان چاو لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و چوار جێنشینە سەر ڕاستەکانی دەکەین، کە لەچوارچێوەی فراوانی شەریعەتدا، بۆ پەرەپێدان‌و فراوانکردو بەهێزو پێزترکردنی دەوڵەتەکەیان، زۆر ئاساییانە لە کەلەپوورو بەرهەم‌و ئەزموونی دەوڵەتانی ڕۆژگاری خۆیان "بەتایبەت ڕۆم‌و فارس" سوودمەندبوون‌و، پاشان مسوڵمانانیش ئەو بەرهەم‌و کەلەپوورو ئەزموونەیان، پاش تێکەڵکردنی هەوێنی ئیسلام‌و ڕوحی ئیمان‌و تام‌و بۆی بەها بەرزو جوانەکانی شەریعەت، زۆر فراوانترو دەوڵەنتر کردو هەموو بەشەرییەتیان پێ بەهرەمەندو دەوڵەمەند کردو، بەردی بناغەی دەستوورو یاسا (شەریعەت) سەروەربوون‌و، حوکم‌و دەسەڵات بەدەست خەڵك بوونیان دارشت‌و، زەنگی کۆتایی پێهێنانی بە پەرستراو دانانی حوکمڕان (تأليه الحاكم)و حوکمڕان بەپیرۆزدانان (تقديس الحاكم)یان بەگوێی خەڵکی دنیادا دا.

هیوادارم ئەم بەرهەمە ئەو ئامانجانەی کە بۆیان نووسراوە، بیانهێنێتەدی‌و، هەرکەسێکیش بەتێبینیی‌و سەرنج‌و ئامۆژگاریی‌و ڕەخنەی دڵسۆزانەی بەهرەمەندم بکات، با دڵنیابێ سوپاسگوزارو منەتبارم دەکات، ئاشکراشە کە هەریەکە بەسەهوو ناچێ‌و هەڵە ناکات "سبحانه وتعالى".

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين
والحمدلله رب العالمين

٢٤/ ڕەجەبی/ ١٤٣٤ی کۆچی
٣ی حوزەیرانی/ ٢٠١٣ زایینی
هەولێر

# تەوەری یەکەم

# قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا

بەڵگەکانی پێویستبوونی،

چۆنیەتی بنیاتنانی،

سروشتو بناغەی فیکریی،

پێناسەی چەند وشەو زاراوایەك



## پێشەکی ئەم تەوەرەیە

خوێنەری سەنگین‌و شیرین !

لەم تەوەرەی یەکەمی ئەم کتێبە (ئیسلام‌و دەوڵەتداریی)دا کە وەك زەمینە خۆشکەرو ڕێ ئاچووغکەر وایە بۆ سێ تەوەرەکەی دیکەو باس‌و بابەتە جۆراو جۆرەکانیان، هەوڵمانداوە لەچوار بەشاندا وەڵامی سێ پرسیاری گرنگ بدەینەوەو پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەکیش بکەین:

**بەشی یەکەم:** ئایا ئیسلام پێویستی بە دەوڵەت‌و قەوارەی سیاسیی هەیە، تاکو بەتەواویی جێبەجێبکرێ؟! وە ئایا سروشتی ئیسلام وەك ئایینێکی ئاسمانیی‌و بەرنامەیەکی خوایی، هەبوونی قەوارەی سیاسیی دەخوازێ؟ ئەگەر، بەڵێ، ئایا بەڵگەکانی ئیسپاتکەری ئەو (بەڵێ)یە چی‌و چین؟!

دیارە ئێمە شەش جۆرە بەڵگەمان لەوبارەوە خستوونە ڕوو.

**بەشی دووەم:** ئایا بەپێی ئیسلام، چۆن دەوڵەت‌و قەوارەی سیاسیی بنیات دەنرێ‌و شێوازو ڕێبازومیکانیزمەکانی چی‌و چین؟!

ئنجا ئێمە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پاش چاوپێداخشاندنێکی بیروڕای تەوژم‌و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان، لەمەڕ چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو بنیاتنانی قەوارەیەکی ئیسلامیی، لەدوو بڕگەدا باسی ئەزموونی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەگشتیی‌و پێغەمبەری کۆتایی بەتایبەتمان کردوە، بۆ چۆنییەتی پاکسازیی‌و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگاو، بەرقەرارکردنی ئایینی خواو پیادەکردنی شەریعەتی خوا.

**بەشی سێیەم:** سروشت‌و پێکهاتەو بناغەی فیکریی دەوڵەتی ئیسلامیی چییەو چۆنە؟!

دیارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش باسی هەرکام لە: (بوونناسیی ئیسلامیی)و (بیرو بڕوای ئیسلامیی)مان کردوە کە چاوگی لێوە هەڵقوڵێن و بناغەی فیکریی قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامیین.

**بەشی چوارەم:** پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك: دەوڵەت، حکوومەت، دەستوور، یاسا، سیستەمی حوکمڕانیی، فۆڕم و شێوەی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی..

شایانی باسیشە کە هەندێك لەو باس و بابەتانەی لەم تەوەرەی یەکەمدا بەکورتیی لەوبارەیانەوە دەدوێین، لەتەوەرەکانی دیکەدا، بەتایبەت تەوەری دووەم و سێیەم، بەدرێژیی لەوبارەیانەوە دەدوێین و، هەندێك جاریش هەندێك باس و بابەت بەبۆنەی جۆراو جۆرەوە دووبارە دەبنەوە.

خوێنەری بەڕێز! خوا یاربێ ئەم بەشە تەرخان دەکەین بۆ وەڵامی یە پرسیار کە زۆرجار دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە دەگوترێ: ئایا ئیسلام دەوڵەت دەخوازێ؟ وە ئایا ئیسلام یەکی لەسەر قەوارە و دەوڵەت کەوتوە؟ یان: ئایا دەگونجێت ئیسلام بەڕێوە ببرێ بە بێ هەبوونی دەستەڵاتی سیاسیی و بە بێ هەبوونی قەوارەیەکی سیاسیی؟! بۆ دەستپێکی ئەم بابەتەش وەکو پێشەکییەك دەمەوێ ئاماژە بە مەسەلەیەکی گرنگ بدەم، ئەویش ئەوەیە: بە درێژایی مێژووی ئیسلام، واتە لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) بەردی بناغەی دەوڵەتی ئیسلامیی دانا لە مەدینە لە ساڵی چواردەهەمی پێغەمبەرایەتییدا، واتە هەر ئەو ساڵە کە کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەوکاتەوە هەتا ساڵی (١٩٢٤)ز، پێم شك نایەت لە نێوان شەرعزانانو زانایانی ئیسلام دا مشتومڕ هەبوو بێ دەربارەی پێویست بوونی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی بۆ ئیسلام، هەرگیز ئەم باسە نەورووژێنراوە، ئەدی کەی ئەم باسە ورووژێنرا؟ بەوردیی ساڵێك یان کەمتر دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی کە دوایین ئاڵقەی دەوڵەتی ئیسلامیی بوو، لەگەڵ کەم و کوڕیی و نەخۆشیی و دەردی زۆریشدا کە پێیانەوە گیرۆدە بووبوو، وەئەوکاتە ناویان لە دەوڵەتی عوسمانیی نابوو: پیاوە نەخۆشەکە، چونکە گرفتاریی‌و دەردی زۆری تووش بووبوون، بەڵام ئەم مەسەلەیە کە ئایا ئیسلام دەوڵەتی دەوێ یان نا؟ یان ئەوەی کە ئێستا بانگەشەی بۆ دەکرێ، کە داواکردنی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەتە، ئەو باسە کە ئێستا بازاڕی گەرمە، پێشتر دەنگ‌و سەدای نەبیسترابوو و سەرەتاکەی لەو کاتەوە دروست بوو، واتە: لە ساڵی (١٩٢٥)زدا، وە بۆ زانیارییتان هەر لەو ساڵەشدا بوو کە یەکەمین کتێب لەو بارەوە لە لایەن نووسەرێکی ئەزهەرییەوە کە قازییەکی شەرعیی بوو، بەناوی (علي عبدالرازق)، یەکەمین کتێبی خۆی

نووسی، وە ئەوە كتێبە بوو بەسەرەتایەك بۆ دەستپێكردنی ئەو تەوژمە كە دەبێ دینو ژین لە یەك جیا بن (یان ئیسلام و دەوڵەت لە یەكجیابن).

بەڵێ (علي عبدالرازق) لە ساڵی (١٩٢٥)دا كە كتێبی: (الإسلام وأصول الحكم)ی نووسی، وە هەر دوابەدوای نووسینی كتێبەكەی، زانایانی ئیسلام، هی زانكۆی ئەزهەر و غەیری ویش، بە تایبەتی لە (مصر) كتێبی زۆریان لەسەر نووسی، یەكێك لەوانە: (شیخ یوسف الدجوي) كتێبێكی نووسی بەناوی: (الإسلام وأصول الحكم والرد علیه)، یەكێكی دیكە لەو زانایانە: (شیخ محمد الخضر حسین) كتێبی (نقض كتاب الإسلام وأصول الحكم)، كەدیارە ئەوانە هەموویان زانای ناودار بوون، بەتایبەت (شیخ محمد الخضر) سەردەمێك شێخی ئەزهەر بوو)، هەروەها (د. محمد البهي) كتێبێكی نووسی بەناوی: (حقیقة الإسلام وأصول الحكم)، هەروەها موفتی ئەوكاتەی مصر ( الشیخ محمد بخیت المطیعي) كە موفتی مصر بوو، ئەویش كتێبێكی نووسی بەناوی ( حقیقة الإسلام وأصول الحكم)، یەكێكی دیكە لەو زانایانە كە ئێستاش لە ژیان دا ماوە: (د.محمد عمارة )یە كە كتێبێكی نووسی بە ناوی: (معركة الإسلام وأصول الحكم)، هەروەها (محمد الطاهر بن عاشور) بەناو و نیشانی: (نقدٌ علميٌ لكتاب: الإسلام وأصول الحكم) نووسی، هەروەها زۆر لە زانایانی دیكەیش، بۆ وێنە: (د.یوسف القرضاوي) چ كتێبی سەربەخۆیان لەسەر نووسی بێ، وە چ باس و بابەتی تایبەت، وە بۆ زانیارییتان ئەو (علي عبدالرازق)ە كە قازییەكی شەرعیی و زاناكی ئەزهەریی بوو، زانایانی ئەوكاتە بە یەكدەنگیی بڕیاری (خلع اللباس)یاندا، واتە: بەرگی زانایەتییان لێ دارنی ، وە لە سەر كاریش لایان برد .

## هۆکارەکانی بانگەشەکەرانی جیاکردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەت لە ڕابردوودا:

پێموایە ئەو هەڵوێستەیان دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون:

**هۆکاری یەکەم:** یەکێك لەو هۆکارانە بریتیە لە نەشارەزایی بە ئیسلام، بەڵگەشم لەو بارەوە هەڵوێستی یەکێك لە نووسەرانی ناوداری جیهانی ئیسلامییە کە ئەویش (خالد محمد خالد)ە، ناوبراو مێژوونووسێکی ناودارەو کتێبی زۆری هەن، لە ساڵی (١٩٥٠)دا کتێبێکی نووسی بە ناوونیشانی: (من هنا نبدأ) {لێرەوە دەست پێ دەکەین} لەو کتێبەدا وەك چۆن (علي عبدالرازق) دەڵێ: ئیسلام تەنیا پەیامێکی ڕوحییەو هیچ پەیوەندیی بە حکوومەت و سیاسەتەوە نیە، وە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرۆکی دەوڵەت نەبووەو حکومڕانیی نەکردوە، بەڵکو پەیامی ڕووحیی خوای بە خەڵك ڕاگەیاندوە، بە هەمان شێوە (خالد محمد خالد)یش لەو کتێبەدا ئەوە دەڵێت، بەڵام ئەو (خالد محمد خالد)ە، دوایی بەڕاستی هەڵوێستێکی جوامێرانە تۆمار دەکات و لە کۆتایی تەمەنیدا کتێبێك دەنووسێ بەناوی: (الدولة في الإسلام) وە لەو کتێبەدا زۆر بە ڕوونیی دان بەهەڵەی خۆیدا دێنێت، وە هۆکاری بەهەڵەداچوونەکەیشی دەخاتە ڕوو.

بۆیە دەڵێین: هۆکاری سەرەکی ئەو حاڵەتە بریتیە لە بێ ئاگایی لە ئیسلام، ئەوانەی کە دەڵێن ئیسلام سیاسەتی تێدا نیەو، ئیسلام دەوڵەتی ناوێ و پەکی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی نەکەوتوە بۆ جێبەجێکردنی

بەرنامەکەی، لە ئیسلام نەشارەزاو بێ ئاگان، (خالد محمد خالد) دەڵێ: من هۆی بەهەڵەدا چوونم ئەوە بوو کە دەوڵەتی دینیی و دەوڵەتی ئیسلامییم تێکەڵکردبوون، دەوڵەتی دینیی کە لە ئەوروپا هەبووە (ثیۆکراسیی)، دەڵێ: من لە ئەنجامی ئەوەدا کە مێژووی ئەورووپام زۆر خوێندبۆوە، تەماشام دەکرد خەڵکی ڕۆژئاوا بە دەست حوکمی دینییەوە زۆر گرفتار بوو بوون و لەلایەن قەشە و پاپاکانەوە ستەمیان لێدەکرا، وە ئیسلامیشم قیاس کردبووە سەر نەصرانییەت و جیهانی ئیسلامییشم قیاس کردبووە سەر جیهانی ڕۆژئاوا، هۆی بەهەڵەداچوونەکەم ئەوەبوو، بەڵام دوایی هەڵەکەی خۆی ڕاست دەکاتەوە.

**هۆکاری دووەم:** بریتیە لە پیلانگێڕیی پیلانگێڕان لەسەر ئیسلام، پێم وایە ئەو کتێبەی (علي عبدالرازق) کە زۆر لە مێژوو نووسان دەڵێن: مەرج نیە هەمووی هی خۆی بوو بێت و وا پێدەچێت هەندێك لە خەڵکی ڕۆژئاوایی لە ئینگلیز و فەرەنسیی و...هتد، دەستیان تێیدا بووبێت، بۆچی؟ چونکە ساڵێك دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی ئەو کتێبە دەکەوێتە بازاڕەوە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان دوای ئەوەی کە دوا دەوڵەتیان یان دوا ئاڵقەی زنجیرەی دەوڵەتەکانیان نەما، کە دەوڵەتی عوسمانیی بوو، جارێکی دیکە بیر لە دەوڵەت نەکەنەوەو، ڕازی بن بەوەی کە دینەکەیان سیاسەت و حوکمی لێ دابڕنرێ، وە ڕازی بن بەوەی کە لەوەمەدوا لە ژێر سایەی حوکمی دینەکەی خۆیاندا نەژین، بۆیە بۆ برەوپێدان (ترويج)ی ئەو بیرۆکەیەو ئەو تەوژمە، ئەو کتێبە کرایە دەستەچیلەو دەستپێك، وە من بۆ خۆم پێموایە هەڵوێستی نەرێنیی و نەیارانەی زۆر لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی سەردەمی خۆشمان بەرانبەر بەئیسلام، زۆرێکی دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزایی بێ ئاگاییان، لەئیسلام.

بەڵام بێگومان برەوپێدانی ئەو بیرۆکەیە پیلانێکیشە بۆ ئەوەی مسوڵمانان نەزانن‌و بێ ئاگابن لەوە کە لەسەریان پێویستە لە ژێر سایەی قەوارەیە ئیسلامییدا بژین، هەروەکو کاتی خۆی زۆر باسی جەنگ و جیهادی ئیسلامیی کراوە، کە ئیسلام بە زەبری شمشێرو بە چەك بڵاوبۆتەوە! بۆ ئەوەی مسوڵمانان بۆ دوورخستنەوەی ئەو تۆمەتە لە خۆیان‌و ئایینەکەیان، بیر لە بەرهەڵستیی کردن‌و جەنگ‌و جیهادو فیداکاریی نەکەنەوە، کە ئەوەش جۆرێکە لە فێڵ و پیلان‌و نابێ مسوڵمانان پێی بە سەهوو بچن.

## جیاوازیی بنەڕەتیی نێوان حوکمی ئیسلامیی و تیۆکڕاسیی

خاڵی جەوهەریی جیاوازیی نێوان حکومەتی ئیسلامیی‌و حکومەتیی دینیی یۆکڕاسیی) ئەومیە کە دەوڵەتی ئیسلامیی یان حوکمی ئیسلامیی بە دەستی خەڵکەوەیە واتە: حکوومەتێکی مەدەنییە، بەڵێ لە سەر بناغەی ئیسلام بنیات دەنرێ، بەڵام بە دەستی خەڵکەوەیە، واتە شەرعییەت لە خەڵکەوە وەردەگرێ‌و، خەڵك کاربەدەستان دیاریی دەکات، وە پاشان خەڵك کاربەدەستەکان دەخاتە ژێر چاودێرییەوە، وە خەڵك دەتوانێ کاربەدەستەکان، لە سەرۆکیانەوە هەتا دواییان لابەرێ، واتە ئێمە لە ئیسلام دا چینێکی دیاری کراومان نیە، بۆ حوکمڕانیی‌و شەرعییەت پێدانیی، وەکو لە ڕۆژئاوا هەبووە، لەوێ چینی (ئەکلیرۆس)، {پیاوانی دینیی} هەبوو، هەر ئەوان بۆیان هەبوو باسی دین بکەن، وە ئەوانیش بۆیان هەبوو شەرعییەت بدەن بەو کەسانەی کە حوکم دەگێڕن‌و، پادشایەکان دەبوو پاپا دیارییان بکات، بەڵام لە ئیسلام دا هیچ کەس نوێنەری خوا نیە، وە لە ئیسلام دا ویلایەت و حکومڕانیی بە دەست خەڵکەوەیە، نەك بەدەست کەسێکەوە بەناوی (الولي الفقیە)یان توێژێکەوە بەناوی: ئەکلیرۆس، پیاوانی ئایینی! بەڵکو ئەوە تەنیا خەڵکە کە حوکمڕان‌و

اربەدەستان دیاری دەکەن، هەڵبەتە ئەو جیاوازییە جەوهەرییەو وردەکاریی دیکەشی هەن کە لە باسەکانی داهاتوودا دەیانخەینەڕوو.

## بۆچی ئیسلام دەبێ دەوڵەتی هەبێ؟

لەو بارەوە شەش جۆر بەڵگە دەخەینە ڕوو:

١- (عەقڵ و واقیع) ناچارمان دەکەن کە بڵێین: ئیسلام پێویستی بە دەوڵەتە.

٢- دەقەکانی قورئان وسوننەت ناچارمان دەکەن، بڵێین: ئیسلام خوازیاری قەوارەی سیاسییە.

٣- سروشتی ئیسلام دەوڵەت دەخوازێ.

٤- مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام بە بێ دەوڵەت بەڕێوە نابرێ.

٥- ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئۆممەتەکەی کە دەبێت لە خۆیان وریا بن دینەکەیان حوکم و سیاسەتی لێ دانەڕنرێ.

٦- زانایانی ئیسلام و یەکدەنگییان لەوبارەوە کە ئیسلام دەبێ دەوڵەت هەبێ، بە درێژایی ڕۆژگار هەتا ئەمڕۆ .

ئێستاش دێینە سەر خستنە ڕووی بەڵگەکان:

### ١- ( عەقڵ و واقیع) هەبوونی دەسەلاتی سیاسی و دەوڵەت بۆ ئیسلام پێویست دەکەن:

عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قسەیەکی هەیە کە (ابن کثیر) لە (البداية والنهاية)دا نەقڵی کردووە

لە زۆربەی کتێبەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە دەڵێت: **(إنَ الله يَزَعُ بالسلطان ما لا يَزَعُ بالقرآن)**[1] واتە: بێگومان خوا ئەوەی بە دەستەڵات قەدەغەی دەکات و دەیگێڕێتەوە، بەهۆی قورئانەوە نایگێڕێتەوە، واتە: دەستەڵات دەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵك واز لە ستەم و خراپە بێنن، زیاتر لەوەی کە قورئان ئەو کاریگەرییەی هەیە، ئنجا یەکێك لە شاعیرەکان کە شیعرێکی زۆر باوە لە سەردەمی نەفامییدا دیارە گوتوویەتی: دەڵێ:

لا يصلح الناس فوضى لا سَراة لهم

ولا يصلحون إذا شرارهم سادُوا

واتە: خەڵك چاك نابن کە کاروباریان بێ سەرو بەریی بێتو هیچ مشوور خۆرو سەرکردەیان نەبن، وە باشیش نابن ئەگەر خراپەکارەکانیان بکەنە کاربەدەستیان.

وە (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە کتێبی (السياسة الشرعية)دا کە کتێبێکی ناوداری خۆیەتی وە (ابن عثيمين) ڕەحمەتی خوای لێ بێ شەرحێکی لەسەر کردوە، دەڵێ: **(فإنَّ بني آدم لا تتم مصلحتهم الا بالإجتماع لحاجة بعض الى بعضٍ، ولا بُدَّ لهم عند الإجتماعِ من رأس)** واتە: ئادەمیزادەکان بەرژەوەندییان نایەتە دی، مەگەر بەوە کە پێکەوە کۆببنەوەو کۆمەڵگا دروست بکەن، چونکە هەندێکیان پێویستییان بە هەندێکیانە، وە کاتێکیش کۆ دەبنەوە دەبێت سەرێکیان هەبێ.

کە دیارە ئەو قسەیەی (ابن تيمية) بەڵگە هێنانەوەیەکی عەقڵییە.

ئنجا زانایانی ئیسلام پاش یەك دەنگبوونیان لەو بارەوە کە پێویستەو هەر دەبێ مسوڵمانان دەوڵەتیان هەبێو، پێشەواو مشوور خۆرو سەرکردەیان هەبێ کاروباریان بۆ بەڕێوە ببات، لەوبارەوە مشتو مڕو ڕاجیاییان هەیە کە ئایا:

---

[1] - ج٢، ص١٠.

بەنەقڵ پێویستە، یان بە عەقڵ؟ هەندێکیان دەڵێن بە بەڵگەی عەقڵیی وەکو دیارە، وە هەندێکیشیان دەڵێن بەبەڵگەی نەقڵیی، منیش لێرەدا دەمەوێ شتێك بڵێم: ئێمەی مسوڵمان پێویستییمان بەوە نیە کە هەمیشە فەرمایشتێکی خواو پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بهێنینەوە، کە ئایا ئەو کارە پێویستە بیکەین یان نا؟، چونکە وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، لە بواری هەڵسوکەوتەکان دا بناغە دەستکراوەییەو بەرژەوەندیی پێوەرو سەنگی مەحەکە، ئنجا بەرژەوەندیی (مصلحة) بریتیە لە چی؟ بریتیە لە وەدەستخستنی سوودەکان و دوورخستنەوەی زیانەکان، (جلب المنافع ودفع المضار) تۆ چۆن قازانجەکان بەدەست بخەی‌و زیانەکان لەخۆت دووربخەیتەوە، دیارە عەقڵ پێت دەڵێ وا بکە، وەعەقڵیش بناغەی تەکلیفەو لەزۆر ئایەتیشدا خوای کاربەجێ فەرمانی کردوە بە بەکارهێنانی عەقڵ بۆ تێگەیشتن‌و پەند وەرگرتن، بۆ نموونە: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ...(١١١) ﴾ یوسف، واتە: بێگومان لەبەسەرهاتی پێغەمبەران دا پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، وە فەرموویەتی: ﴿ ...فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ (٢) ﴾ الحشر، واتە: پەند وەربگرن ئەی خاوەن عەقڵەکان!، وەفەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٢٤٢) ﴾ البقرة، کەواتە: بە بێ بەکارهێنانی عەقڵ لە نەقڵیش تێ ناگەین، وەهەر شتێك کە عەقڵی سەلیم داخوازیی بکات، مانای وایە دینی ڕاستیش داخوازیی دەکات، چونکە دین لەسەر بناغەی عەقڵ فام دەکرێ‌و وەردەگیرێ، وە لە ڕاستییدا وەك زانایان گوتوویانە: (العقل أساس التكليف) عەقڵ بناغەی ئەرکخرانەسەری مرۆڤە لە لایەن خوای بەرزەوە، هەربۆیەش شێت و منداڵ تەکلیفی شەرعییان لەسەر نیە، وەك پێغەمبەر (صَلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: {رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنْ

**الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنْ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ}**[1]، واتە: ئەو سێ کەسە قەڵەمیان لەسەر هەڵگیراوە ئەوانیش: نووستوو هەتا بەخەبەر دێ، وە منداڵ هەتا باڵغ دەبێو، وە شێت هەتا چاك دەبێتەوە، چونکە هیچ کامیان عەقڵیان لەوکاتەدا ئامادە نابێت.

کەواتە: یەکەمین بەڵگەی پێویستبوونی دەوڵەت لەئیسلامدا، بریتیە لەعەقڵو ئەزموونو واقیع، چونکە شتێکی ئاشکراو ڕوونی بەعەقڵی سەلیم زانراوە، کە ناگونجێ کۆمەڵگا بەبێ قەوارەو دەستەڵاتێکی سیاسیی بەڕێوەبچێ.

٢- دەقەکانی قورئان و سوننەت:

ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئان و سوننەت بکەین، دەبینین چەندان ئایەتو چەندان فەرمایشتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەخوازن کە مسوڵمانان دەوڵەت و قەوارەی سیاسییان هەبێت، بۆ نموونە: ئایەتی ژمارە (٣) لە سوورەتی (المائدة): ﴿...ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واتە: ئەمڕۆ بەرنامەکەتانم بۆ تەواو کردن، وەچاکەی خۆمم بەتەواویی لەگەڵ کردن، وە ڕازیش بووم کە ئیسلام بەرنامەتان بێت .

بەڵێ خوا دەفەرموێ: دینی من تەواوە، ئنجا مادام خوا بفەرموێ: دینم بۆ تەواو کردوون، ئەدی نابێت قەوارەیەك و دەسەڵاتێکمان هەبێت کە ئەو بەرنامە و دینە تەواوەی پێ پیادە بکەین؟، ئاخر ئەو دینە چۆن پیادە دەکرێ ئەگەر دەسەڵاتێکت نەبێت! بەشێك لەو دینە پەیوەندیی هەیە بە پاراستنی دینو ژینی خەڵكو ناموسو سامانی خەڵك، دیارە ئەوەش تەنیا کاتێك دەبێ

---

[1] رَواهُ أحْمَد برقم: (١٣٦٢) عَنْ عَلِي رَضِيَ اَللّهُ عَنه، وأَبُو داوُد برقم: (٤٣٩٨)، والنّسائيُ برقم: (٦٥٦)، وابْنُ ماجَهْ برقم: (٢٠٤١)، وابْنُ حِبّان برقم: (١٤٢)، وصَحّحَهُ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجه) رقم: (١٦٦٠) عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اَللّهُ عَنها.

کە سزای هەر کەس بدرێ، دەستدرێژیی بکاتە سەر دین‌و ژین‌و نامووس‌و سامانی خەڵك، کەواتە: ئەو دینە تەواوە، پێویستیی بە دەسەڵاتێك هەیە کە بەڕێوەبەرێ، وە ئەو دینە تەواوە، پێویستە میکانیزمی جێبەجێکردنیشی هەر لە خۆیدا بێ، کە ئایا ئەو دەسەڵاتە سیاسییە چۆن مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگادا بکات‌و، چۆن شەریعەت پیادە بکات؟

یەکێکی دیکە لەو ئایەتانە کە خوای زانا ئاماژەیان پێدەکات کە مسوڵمانان دەبێت دەوڵەتیان هەبێت، ئەوەیە کە بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية، واتە: دواتر تۆمان دانا لە سەر ڕێبازێك لە دینی خوا (دیارە پێشتر باسی جوولەکە و نەصرانییەکان دەکات) دەجا تۆ شوێنی بکەوە، وە شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن، کەواتە: ئۆممەتی پێغەمبەر شەریعەتێکیان بۆ نێردراوە کە دەبێ پێوەی پابەند بن و شوێنی بکەون، ئنجا چۆن دەتوانن ئەو شەریعەتە پیادە بکەن و پراکتیزەی بکەن، ئەگەر دەسەڵاتیان نەبێت لە حاڵێکدا کە ئەو شەریعەتە تایبەت نیە بە لایەنێك‌و دوولایەنی ژیانەوە، بەڵکو هەموولایەنەکانی ژیان دەگرێتە خۆی، بێگومان بەرنامەیەکی ئاوا بەبێ هەبوونی قەوارەیەکی سیاسیی، ناگونجێ جێبەجێ بکرێ‌و لەدنیای واقیعدا بچەسپێنرێ.

دەقێکی دیکە لەوبارەوە هەردووك ئایەتی ژمارە: (٥٨ و ٥٩)ی سووڕەتی (النساء)ن کە خوای بێ هاوتا لەو دوو ئایەتەدا ڕوو لە هەرکام لە جەماوەرو حوکمڕانانی مسوڵمان دەکات، لە ئایەتی (٥٨)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، ئەم دواندن‌و خیتابە سەرەتا ڕووی لە

کۆمەڵگایەو دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێ دەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، پاشان ڕوو لە حوکمڕانانی سپاردەی حوکمڕانیی پێ سپێردراو دەکاو دەفەرموێ: وەهەرکات دادوەرییتان کرد لە نێوان خەڵکدا بەدداگەریی بیکەن، ئەمە باشترین شتێکە کە خوا ئێوەی پێ ئامۆژگاریی دەکات، بێگومان خوا بیسەری بینەرە، لێرەدا خوای کاربەجێ فەرمان دەکات بە کۆمەڵگا کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ کەسانی خۆیان، واتە: کارو بارەکان کە ئەمانەتن بەخەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن، وە بە بەرپرسانیش دەفەرموێ: کە بەدادگەریی دادوەریی بکەن، وە لە ئایەتی (٥٩)دا ڕوو لە بڕواداران بەگشتیی دەکاو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾ النساء، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر، وە هی کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن، بکەن، واتە: لە ئایەتی یەکەم (٥٨)دا فەرمان بە کۆمەڵگاو حوکمڕانان دەکات کە کاروبارەکانیان بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن، وە دادوەرانە ڕەفتار و مامەڵە بکەن لەگەڵ خەڵکدا، ئنجا لە ئایەتی دووەمدا فەرمان بە کۆمەڵگاو خەڵك دەکات و دەفەرموێ: فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن بکەن، شایانی باسیشە کە (ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئەو دوو ئایەتەی کردوون بە هەوێن و بناغەی کتێبەکەی خۆی: (السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية)و گەلێك چەمكو مەبەستی گەورەو گرنگی لەوبارەوە لێ هەڵهێنجاون.

کەواتە: ئەو دوو ئایەتەی ژمارە (٥٨و٥٩)ش زۆر بەڕوونیی ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە، کە دەبێ ئەهلی ئیسلام قەوارەی سیاسییان هەبێو لەنێو خۆیاندا حوکمڕانو بەرپرسیانیان هەڵبژێرنو ئەركو کارەکانیان پێ

بسپێرن و، ئەوانیش بەدادگەریی حومکڕانیی بکەن، پاشان کۆمەڵگای مسوڵمانانیش وێڕای پابەندیی بەقورئان و سوننەتەوەو فەرمانبەرییان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانبەریی مشوور خۆرو حوکمڕانانی خۆشیان بکەن.

ئنجا با لەوبارەوە تەماشای دوو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)یش بکەین: یەکێکیان ئەو فەرمایشتەیە: **{مَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِي عُنُقِهِ بَيْعَةٌ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً}**[1]. واتە: هەرکەسێك بمرێت و بەڵێن و پەیمانی حکومڕانێکی لە ئەستۆدا نەبێت، بەشێوەیەکی نەفامانە مردووە!!، واتە: وەك چۆن سەردەمی نەفامیی حکومڕانیان نەبووەو بێ سەرەو بەرە بوون، ئەو کەسەش وەك عادەتی نەفامەکان مردوە، واتە: عادەتی مسوڵمانان ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە حکومڕانیان هەبێ و ڕێك و پێك بن و دەستەڵاتیان هەبێ و قەوارەیان هەبێ، دیارە قەوارەیەك کە لەسەر بناغەی بەڵێن و بەیعەتپێدران لە لایەن خەڵکەوە دروست بووبێ و ئەو دەستەڵاتە سیاسییەش بە کەسانێکی شایستە سپێررابێ.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: **{لَيُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا الْحُكْمُ وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ}**[2]. واتە: ئیسلام گرێ گرێ یان قوڵفە قوڵفە هەڵدەوەشێنرێتەوە، هەر کە گرێیەکی لێهەڵوەشایەوە خەڵکی دەست بەوەی دوایەوە دەگرن، وە یەکەمین قوڵفەو گرێ کە لە ئیسلام (واتە: لە سیستەمی ئیسلام) هەڵدەوەشێنرێتەوە، بریتییە لە حکومڕانیی، وە کۆتایەکەیشی بریتییە لە نوێژ، کە بێگومان هەرواش بووە، چونکە هەر لە

[1] رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٨٩٩) عَنْ عَبْدُ اللهِ بْنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما.

[2] رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٢١٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٧١٥)، والطَّبَرَانِيُّ برقم: (٧٤٨٦)، والحَاكِمُ برقم: (٧٠٢٢) وَقَالَ: صحيح، والبَيْهَقِيُّ في شعب الإيمان برقم: (٥٢٧٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) رقم: (٥٧٢).

سەرەتاوە حوکمی ئیسلامیی لادانی تێدا پەیدا بوو لە شوراییەوە کرا بە میراتیی وە دیکتاتۆریی، ئنجا ئەوەبوو کە لەسەردەمی حوکمی میراتییو بنەماڵەیشدا کەم و زۆر پابەندیی بە شەریعەتەوە هەر دەکرا، هەرچەندە لە شێوازی دانانی حوکمڕاناندا لادان دروست بوو بوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی پابەندیی بەشەریعەتەوە هەر دەکرا، هەتا لە ساڵی (١٩٢٤)دا ئەوەش کۆتایی پێ هات.

کەواتە: کاتێك مسوڵمانان نوێژیان نامێنێ، مانای وایە هیچ دینیان نەماوەو، دوایین سەنگەری مسوڵمانانو دوایین قۆناغی دینداریيان بریتیە لە نوێژ، کەواتە: کە تەنیا نوێژمان دەمێنێت، با زۆر دڵمان بەخۆمان خۆش نەبێ، وە با بزانین، کە ئەوە کۆتا سەنگەرە لێمان دەگیرێو، ئەگەر ئەویش گیرا ئەوە مانای وایە ئیدی تەواو مسوڵمانەتیی بوونی نیە.

## ٣ – سروشتی ئیسلام:

ئەگەر سەرنجی سروشتی ئیسلام بدەین، زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی بۆمان دەردەکەوێ، کە بەڕاستیی ناگونجێ ئیسلام بێ دەوڵەتو بێ دەسەڵاتی سیاسیی بێت، ئنجا من ئەمە لە حەوت خاڵاندا دەخەمە ڕوو:

یەکەم: ئەگەر تەماشای قورئانی مەککییو مەدەنیی بکەین، جیاوازییەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا دەبینین، چونکە قورئان لەو ڕووەوە کە لە کوێ هاتوەتە خوار؟ دەبێتە دووبەش: زۆربەی هەرەزۆری کە (٣/٢)یەتی، لە مەککە هاتۆتە خوار، وە بەشی کەمتریشی کە (٣/١)یەتی، لە مەدینە هاتۆتە خوار، ئنجا ئەو (٣/٢)یەی کە لە مەککە هاتۆتە خوارو پێی دەگوترێ: قورئانی مەککیی، قورئانی مەککیی چ تەماشای نێوەڕۆکەکەی بکەین، چ تەماشای ئەوانەی کە قورئانیان ئاڕاستە کراوە بکەین، واتە: دوێنراوەکان (مخاطبين) جیاوازیی هەیە لە قورئانی

مەدەنیی، چۆن؟ ئەگەر سەرەتا تەماشای نێوەڕۆکەکەی بکەین، قورئانی مەککیی بە زۆریی لە سێ سورگەدا دەسووڕێتەوە: باسی خوابەیەکگرتن (التوحید)و باسی پێغەمبەرایەتیی (النبوّة) باسی ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر)یە، دیارە بەسەرهاتی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) هەمووی دەچێتەوە چوارچێوەی ئەو سێ سورگەیە، بەڵام قورئانی مەدەنیی، وێڕای هێنانەوە پێشی ئەو سێ بابەتە: خوا بەیەکگرتن و پێغەمبەرایەتییو ڕۆژی دوایی، باسی یاسا گەلێکی زۆرو حەڵاڵو حەرامیشی تێدایە، لە هەموو ڕووەکانی: خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، جەنگ و ئاشتیی، ئابووریی، مامەڵەو بازرگانیی،پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان، قورئانی مەدەنیی هەموو ئەو یاسایانەی تێدایە، چونکە کاتێك کە مسوڵمانان نەیاتوانیوە یاساکان جێبەجێ بکەن، خوای کاربەجێ موکەللەفی نەکردوون و دوای ئەوەی کە چوون بۆ مەدینەو قەوارەی سیاسییان بۆ پەیدا بووەو سەرزەمینێکیان بۆ پەیدا بووەو دەسەڵات و کۆمەڵگایەکیان هەبووە، لەوکاتەدا ئەو یاسا و دەستوورانەی بۆ ناردوونەتە خوار.

بۆ نموونە: ئەگەر تەماشای سوورەتەکانی (الإخلاص) و (الفرقان) و (المؤمنون) و (الأنعام) و (الأعراف) بکەین، کە هەموویان مەککیین، دەبینین ئەو سێ بابەتانەیان تێدایە، بەڵام ئەگەر تەماشای سوورەتەکانی: (البقرة) و (النساء) و (المائدة) و (الأحزاب) و (التوبة) بکەین، کە هەموویان مەدەنیین، ئەو یاسایانەیان تێدایە، کە لە قۆناغی مەدینەدا مسوڵمانانیان پێ موکەللەف کراون.

ئنجا ئەگەر تەماشای ناوونیشان بکەین، واتە: ناوونیشانی کەسانێك کە ئایەتەکانیان ئاراستەکراون، دەبینین لە قورئانی مەککی دا (يَـٰٓأَيُّهَا

ٱلْإِنسَٰنُ ) هاتوه: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ﴾الإنفطار، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾الإنشقاق، یان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾: وەك ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ ...﴿٣٣﴾ ﴾لقمان، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ﴾الحج، یان وەکو ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ ﴾ وەك: ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ...﴿٣١﴾ ﴾الأعراف، ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ ...﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف، بەڵام لە قورئانی مەدەنییدا زیاتر ناوونیشانی دوێنراوان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ... ﴾ یە، وەك: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ ...﴿١٨٣﴾ ﴾البقرة، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ...﴿١٣٠﴾ ﴾آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا ...﴿٤٥﴾ ﴾ الأنفال، بۆچی؟ چونکە لە مەککەدا خیتاب لەگەڵ هەموو خەڵك دا بووەو خیتاب لەگەڵ مرۆڤدا بووە، کە بێ ئیمان بێنێ، وە بانگەوازی خوا وەربگرێ، بەڵام لەمەدینە کە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی دروست بووە، خوای زانا دەیاندوێنێ کە شەریعەتی خوا پیادە بکەن، بۆیە بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێت.

دووەم: ئیسلام بەرنامەیەکی گشتگیرەو وەك نەصرانییەت نیە، ئەو نەصرانییەتەی کە لە چوار ئینجیلەکان دا بەرجەستەیە، کە تەنها ئاراستەکردنی رووحیی و لایەنی ئەخلاقیی بێت، بەڵکو ئیسلام پەیوەندیی نێوان تاك و خوای پەروەردگار، کە لە ئیمان و عەقیدەو

خواپەرستنی تایبەت دا بەرجەستەیە، وە پەیوەندیی نێوان تاکەکانی خێزان: ژن و مێرد، باب و دایك لەگەڵ منداڵەکانیان، وە پەیوەندیی نێوان خێزان و خێزانەکان (سیلەی ڕەحم) و خزمایەتیی و دراوسێیەتیی، وە پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگا و حوکمڕان و اربەدەستان، ڕێك دەخات و هەر کام لە کۆمەڵگا و خەڵك لەلایەك، وە بەرپرس و حکومڕانان لەلایەکی دیکەوە، خوای بێ هاوتا قسەی لەگەڵ دا کردوون و ئەرکی پێ سپاردوون، دیارە بەرنامەیەکی ئاواش بەبێ قەوارەی سیاسی بەڕێوە نابرێ.

سێیەم: لەسەر مسوڵمانان و کۆمەڵگای ئیسلامیی فەرز کراوە، کە (دین و ژین و ئاسایش و وەچە و عەقڵ و کەرامەت و سامانی تاك تاکی ئەوانەی کە لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا دەبن، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە) پارێزراو بێت، چۆن؟

١- دەربارەی پاراستنی دین خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة، واتە: تۆبزیی کردن نیە لە دین دا، نابێت زۆر لە هیچ کەسێك بکرێ کە واز لە دینی خۆی بێنێ، نە کافر زۆر لە مسوڵمان بکات، نە مسوڵمان زۆر لە کافر بکات، ئەم ئایەتەش بەو بۆنەوە هاتۆتە خوارێ کە هەندێك لە مسوڵمانان دوای ئەوەی کە مسوڵمان بوون، کاتی خۆی کوڕەکانیان نەزر کردبوو کە بیانکەنە جوولەکە و نەصرانیی، دوایی گوتیان: با بیانکەینەوە مسوڵمان، خوای دادگەریش فەرمووی: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾﴾، تۆبزیی کردن لە دین دا نیە و نابێت بە زۆر بیانکەوە بە مسوڵمان.

٢- وە دەربارەی پاراستنی (ژین) خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ ...﴿١٧٨﴾﴾البقرة، واتە: ئەی بڕواداریینە! تۆڵەتان لەسەر فەرز کراوە، واتە: هەر کەسێك کەسێکی کوشت، پێویستە تۆڵەی لێ بسێنرێتەوە.

ئنجا ئایا دین چۆن سەلامەت دەبێ، ئەگەر دەسەڵاتێك نەبێ کە رێگر بێ لە خەڵك کە تەعدا لە یەکدی نەکەن؟، وە ژین چۆن سەلامەت دەبێ ئەگەر دەسەڵاتێك نەبێ کە ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت بکوژرێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵك بپرینگێتەوە لەوەی کە دەست بۆ خوێنی یەکدی درێژ نەکەن؟

٣- وە دەربارەی پاراستنی هێمنیی و ئاساییش، خوا لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی ٣٣ دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ...﴿٣٣﴾﴾، واتە بێگومان سزای ئەوانەی کە دژایەتیی خوا و پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەکەن و پەشێوی لە زەوییدا بڵاو دەکەنەوە و هێمنیی و ئاسایش تێك دەدەن، ئەوەیە کە بکوژرێن یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێی ڕاست و چەپیان ببڕدرێ، یان دەربکرێن و دوور بخرێنەوە.

دیارە هەرکامێك لەو سزایانە، بە پێی ئەو تاوانە کە تاوانبارەکە کردوویەتی، ئەویش دیارە بەدەسەڵاتی سیاسی نەبێ جێبەجێ ناکرێ.

٤- وە بۆ سزای داوێنپیسیی خوا فەرموویەتی: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ ...﴿٢﴾﴾النور، واتە: کەسێك کە دەستدرێژیی

دەكاتە سەر ناموسی خەڵك و لەسەری ئیسپات دەبێ، دەبێ بەو جۆرە سزا بدرێ، چ نێر بێ، چ مێ، كە لێدانی سەد قەمچییە، كە بێگومان ئەوەش بە دەسەڵاتی سیاسی نەبێ ناچەسپێ، چونكە هەیە زینایش دەكات و كەسیش ناتوانێ پێی بڵێ: پشتی چاو برۆیە، ئەگەر دەستەڵات و قەوارەیەكی سیاسی نەبێت.

٥- ئنجا ڕێگرتن لە فرۆشتن و بەركاهێنانی شەڕاب و قومار، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿...إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ...(٩٠)﴾ المائـدة، كەواتـە دەبـێ دەسـەڵاتێك هەبێ ڕێگا بگرێ لە بازرگانیی كردن بە مادە هۆشبەرەكانەوە، وە ڕێگریی لە بەكارهێنانیان بكا، وە سەرەنجام خەڵك ئەو عەقڵەی پێی لە ئاژەڵ جیا دەبێتەوە، ڕێی نەدرێ كە بە دەستی خۆی و بە پارەی خۆی ئەو عەقڵە لە خۆیدا نەهێڵێ! دەبێ دەسەڵاتێك هەبێ كە ڕێگا لەوە بگرێ.

٦- وە كەسانێك كە تۆمەتی داوێنپیسیی بۆ خەڵك هەڵدەبەستن، بۆ پیاوان و ئافرەتانی داوێنپاك، دەبێ سزا بدرێن، وەك لە سوورەتی (النور) لە ئایەتی (٤)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ (٤)﴾، واتە: ئەوانەی كە ئافرەتانی داوێنپاك تۆمەتبار دەكەن بە داوێنپیسیی، وە دواییش چوار شاهیدان ناهێنن، یەكی هەشتا قەمچییان لێ بدەن، وە هەرگیز شاهیدییشیان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانەن فاسقان.

ئنجا ئایا چۆن سومعه و کەرامەتی خەڵك پارێزراو دەبێت، ئەگەر دەسەڵاتێکی سیاسیی نەبێ، هەرکەسێك بە ناهەق کەسێ تۆمەتبار بکا، پیاوێك یان ئافرەتێك، سزای بدا و هەشتا قامچی لێبدات، ئنجا لێرەدا کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ٱلْمُحْصَنَٰتِ﴾ واتە: ئافرەتانی داوێنپاك، یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئەدی کوا پیاوەکان؟ لە وەڵامدا دەگوترێ: بە زۆریی وایە ئافرەتان ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵدەبەسترێ، ئەگەرنا بۆ پیاوانیش هەروایە و ئەگەر کەسێك پیاوێکیش تۆمەتبار بکات، بەهەمان شێوە سزایەکەی بەسەردا دەچەسپێت.

٧- ئنجا دەربارەی پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك، لە ئایەتی (٣٨)ی سورەی (المائدة) خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: وە پیاوی دز و ئافرەتی دز دەستیان ببڕن، ئەوە پرینگانەوەیەکە لە لایەن خواوە وە خوا کاربەجێی زاڵە، ئنجا ئایا ئەگەر دەستەڵات و قەوارەیەکی سیاسی نەبێت، چۆن ماڵ و سامانی خەڵك سەلامەت و پارێزراو دەبێ؟!

چوارەم: فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە، بەبێ دەستەڵات بەڕێوە ناچێ، مسوڵمانان لەسەریان پێویستە، وەك چۆن ئەو شتانەی پێشوویان لەسەر پێویست بوو، لەسەریان پێویست بوو کە دینی خەڵك و ژیتی خەڵك و نەسل و وەچەی خەڵك، ئابڕوو و کەرامەتیان، عەقڵیان، ماڵ و سامانیان، ئەمن و ئاساییشیان بپارێزن، بەهەمان شێوەش لەسەریان فەرزە، کە فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگریی لە خراپە بکەن، واتە: هەرچی چاکەیە فەرمانی پێ بکەن، وە هەرچی خراپەیە ڕێگای لێ بگرن، کە دیارە ئەمەیش بە تەئکید بەبێ

دەسەڵاتێکی سیاسی نایەتەدی، بۆیەش خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾ الحج، واتە: ئەوانەی کاتێك دەیانکەینە دەسەڵاتدار لە زەوییدا، نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێگریی لە خراپە دەکەن. کەواتە: بەبێ دەسەڵاتدارکردن (**تَمْكين**) لە زەوییدا، فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە ناکرێ، چونکە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە، تەنیا ئەوە نیە کە کەسێك نەزەر نەکا، یان درۆ نەکا، یان غەیبەت نەکا، بەڵکو کەسێك کە گەندەڵیی دەکات، دزیی دەکات، تەزویر دەکات لەهەڵبژاردنەکان دا، یان هێمنیی و ئاسایشی خەڵك تێکدەدات، ئەوانە هەموویان (منكر)ن، جا ئایا بەبێ دەسەڵاتی سیاسی چۆن ڕێیان لێ دەگیرێ؟.

پێنجەم: چەسپاندنی دادگەریی لەسەر مسوڵمانان فەرزە و ئەویش بەبێ لابردنی ستەم نایەتەدی، دیارە ئەمەیش بەبێ دەسەڵاتی سیاسی نابێ، خوا (عز وجل) دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ... ﴿٢٥﴾﴾ الحديد، واتە: هەموو پێغەمبەرانمان بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوون، وە کتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوون، تاکو خەڵکی بە دادگەریی بەڕێوە بچێ، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوارێ، کە هێزێکی زۆری تێدایە، واتە بەبێ هەبوونی ئاسن کە پاڵپشتی داد بێ، دادگەریی ناچەسپێ و ستەمکاران ناهێڵن بچەسپێ، هەروەها خوا لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ واتە:

نابێت نە ستەم بکەن وە نەقبووڵی زوڵمیش بکەن، دیارە کۆمەڵگایەك مولزەم بێت بەوە کە ڕێگا لە زوڵم بگرێ، دەبێ دەسەڵاتی هەبێ، وە کۆمەڵگایەك مولزەم بێت بەوەی کە دادگەریی بچەسپێنێت، دەبێ دەسەڵاتی هەبێ، ئەگەرنا بۆی ناگرێ.

شەشەم: دادوەریی لەنێوان خەڵکدا دەبێ بەپێی شەریعەتی خوای دادگەر ئەنجام بدرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾﴾النساء، واتە: ئێمە کتێبمان بەحەق بۆ تۆ ناردوە، تاکو لە نێوان خەڵك دا بەو پێیەی کە خوا پێشانت دەدا دادوەریی بکەی. ئنجا ئایا چۆن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وە جێنشینانی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەتوانن بە پێی شەریعەتی خوا دادوەریی بکەن لەنێوان خەڵکدا، ئەگەر دەسەڵاتیان نەبێ؟! .

حەوتەم: هێنانەدی ئامانجی هاتنی ئیسلام: ئامانجی هاتنی ئیسلام چییە؟ خوا فەرموویەتی ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٢٨﴾﴾، ئەم ئایەتە لە سوورەتی (الفتح/٢٨)دا وە لە سوورەتی (التوبة/٣٣)دا هاتوە، هەروەها لە سوورەتی (الصف/٩)یش دا هاتوە، لەگەڵ کەمێك جیاوازییدا، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بە هیدایەتەوە و بە بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا زاڵی بکات، واتە: ئیسلام هاتوە حاکم بێ و سایە و سێبەر بێ، بەڵێ ئیسلام هاتوە کە دەسەڵاتی هەبێ و حکومڕانیی بکات، جا ئیسلام چۆن حوکمڕانیی بۆ دەکرێ، ئەگەر دەسەڵاتی نەبێ و قەوارەیەکی سیاسیی نەبێ، پاشا

ئەو قسەیەی **(ربعي بن عامر)** کە بە فەرماندەی سوپای فارسەکانی دەڵێ، زۆر جێی سەرنجە، کاتێك ڕۆستەم فەرماندەی سوپای فارسەکان لێی دەپرسێت: بۆچی هاتوون؟ دەڵێ: **(ان الله ابتعثنا لنخرج الناس من عبادةِ العبادِ الى عبادةِ الله وحدهُ، ومن ضيق الدنيا الى سعتها، ومن جور الأديان الى عدل الإسلام).**[1] واتە: خوا ئێمەی ناردوە وەك ئۆممەتی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تاکو خەڵك ڕزگار بکەین لە کۆیلایەتیی بۆ مرۆڤەکان، بۆ بەندایەتیی بۆ خوای تەنیا، وە لە تەنگ و تروسکی ژیانی دنیا بۆ فراوانی دنیا، (چونکە ئیسلام وەختێك دەسەڵاتی دەبێ وەزع بۆ خەڵك فراوان دەبێ و کاتێك دیکتاتۆرەکان حوکمڕانیی دەکەن، دنیا لە خەڵك تەنگ دەکەنەوە و دنیایان لێ دەکەنە چەرمی چۆلەکە، بەڵام کاتێك ئیسلام[2] دەسەڵاتی دەبێ، ژیان بۆ خەڵك فراوان دەبێ) وە لە ستەمی ڕێچکەکان بۆ دادگەریی ئیسلام، کەواتە: ئامانجی هاتنی ئیسلام کە چەسپاندنی دادگەرییەو دەربازکردنی بەندەکانە لە کۆیلایەتیی بۆ مرۆڤ و، لە دنیای تەسك و ژیانی تەنگ بۆ بەندایەتیی بۆ خوای تاك و ژیانی فراوانی دنیا، دیارە ئەمانە بە دەسەڵاتی سیاسی نەبێ ناچەسپێن، بۆیە لە بەر هەموو ئەو هۆکارانە پێویستە کە ئیسلام دەوڵەتی هەبێ وە قەوارەی سیاسی هەبێ.

---

[1] تأريخ الأمم والملوك للطبري، ج٢ ص٤٠١.

٢ - کەواتە: هەرکات قەوارەیەکی سیاسیی بەناوی ئیسلامەوە حوکمی کردو خەڵکی سەغڵەتو تەنگەتاو کرد، ئەوە با بزانرێ کە هەر بەناو ئیسلامییەو، با هیچکەس بەو هۆیەوە ئیسلامیی لەبەرچاو نەکەوێ.

**٤- مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئیسلام بەبێ دەوڵەت بەڕێوە ناچێ:**

بەڵێ مێژووی ئیسلامو مسوڵمانانیش بەلگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە کە ئیسلام پێویستیی بە قەوارەی سیاسیی هەیەو پەکی لەسەر دەوڵەت کەوتوە، بۆ ئەوەی کە بەتەواویی پیادە بکرێ و بەڕێوە ببرێ، واتە: هەم ئەو بەشەی کە پەیوەندیی بە تاکەکانەوە هەیەو هەم ئەوەیش کە پەیوەندیی بە خێزان و بە کۆمەلگا و بە دەوڵەتیشەوە هەیە، ئەگەرنا بێگومان بەشێك لە ئیسلامەتیی بە بێ دەوڵەتیش پیادە دەکرێ و بەڕێوە دەبرێ، ئەوەی کە پەیوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە وەك خۆی، بەلام بە تەئکید ئەویش بە تێر و تەسەلیی و تەواویی بەڕێوە نابرێ، بۆ وێنە: زەکات و نوێژ و ڕۆژوو و حەج، چوار کە دروشمەکەی ئیسلامنو هەموو تاکێکی مسوڵمان دەبێ جێ بەجێیان بکات، لەکاتی هەل و مەرج بۆ ڕەخسانیدا، بە تایبەتی زەکات و حەج، بەلام ئایا زەکات کە یەکێکە لە چوار دروشمەکەی ئیسلام، چ کاتێك باش پیادە دەکرێ؟ بێگومان کاتێك کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ، چونکە هەر خودی زەکات وەرگیرانەکە بەهۆی دەوڵەتەوە دەبێ، وە صەرفکرانیشی هەر بەهۆی دەوڵەتەوە دەبێ، وەك خوای بالادەست بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ...﴿١٠٣﴾﴾ التوبة. واتە: لە ماڵ و سامانەکانیان صەدەقە وەربگرە کە بەهۆیەوە پاکیان بکەیتەوە تەزکیەیان بکەی، کەواتە: وەرگرتنی زەکات بۆ خۆی ئەرکی دەوڵەتە، هەر بۆیە ئەبو بەکری صیددیق (ڕەزای خوای لێ بێت)، یەکەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر نەدانی زەکات جەنگی لەگەڵ زەکات نەدەران دا بەرپاکرد، وەکاتێك عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی گوت: چۆن لە سەر نەدانی زەکات شەڕیان لەگەڵدا دەکەی، لە حاڵێك دا کە ئەوانە خۆیان بە

مسوڵمان دەزانن؟ گوتی: سوێند بە خوا جەنگ لەدژی هەر کەسێك دەکەم کە نوێژ و زەکات لە یەك جیا بکاتەوە، چونکە خوا (عزوجل) بە یەکەوە باسی کردوون، ئەگەر نوێژ هەقی خوایە، زەکاتیش هەقی خەڵکە[1].

ئنجا دیسان دابەشکردنی زەکات بەسەر ئەو هەشت جۆرە کەسانەدا کە دیاری کراون لە لایەن دەوڵەتەوە دەبێ، کە یەکێك لەو هەشت جۆرانەش بریتیە لە کۆکەرەوانی زەکات: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا ...﴿٦٠﴾﴾التوبة، واتە بێگومان زەکاتەکان بۆ هەژاران و نەداران و کاربەدەستانی بۆ تەرخانکراویی و...هتدە، بەڵێ یەکێك لەو هەشت جۆرانەی کە زەکاتیان پێ دەدرێ، ئەوانەن کە کۆیدەکەنەوە، ئنجا ئایا کێ پێیان دەدات؟ هەڵبەتە دەوڵەت پێیان دەدات.

هەروەها حەجیش بە هەمان شێوە کاتێك وەك پێویست بەڕێوە دەبرێ و هەقی خۆی دەدرێتێ کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی و قەوارەیەکی ئیسلامیی تەبەنني بکات، وە بگرە نوێژ و ڕۆژووش بەهەمان شێوە، تەماشای کاتی جەژنەکان بکە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە مسوڵمانان قەوارەیەکی سیاسییان نیە، زۆر جار لەسەر جیاوازیی کاتی هەڵهاتن و ونبوونی مانگ و، سەری مانگ و کۆتایی مانگ، کێشە و مشتومڕیان دەبێ، کە ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ، ئەو شتانە زۆر بە ئاسانیی ڕێك دەخات، بە تایبەتی دوای بەرەو پێشچوونی زانست و تەکنۆلۆژیا لە بواری گەردووناسییدا .

هەروەها نوێژی هەینی، وە نوێژی جەژنەکان، دیارە کاتێك ئەو دروشمانە هەقی خۆیان دەدرێتێ، کە مسوڵمانان قەوارەیەکیان هەبێ.

---

[1] - تفسير القرآن الحكيم، محمد رشيد رضا، ج٦، ص٣٧٦، کە بەم شێوەیە قسەکەی (أبو بکر)ی هێناوە: (...لا والله لا أفرق بين شيء جمع الله بينه، ولو منعوا عقالاً مما فرض الله ورسوله لقاتلهم عليه) أخرجه رواة التفسير المأثور عن قتادة واللفظ لابن جرير.

بەڵێ ئێمە ئەگەر تەماشای مێژووی ئیسلام بکەین، هیچ کاتێك نابینین مسوڵمانان بێ دەوڵەت بوو بن، واتە لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەردی بناغەی دەوڵەتی ئیسلامیی لە مەدینە دانا، دەوڵەتی ئیسلامیی درێژەی هەبوو، دیارە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەوە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بوو، وە دوایی دەوڵەتی چوار جێنشینەکان، پاشان دەوڵەتی ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی، تاکو لە ساڵی ١٩٢٤ دا لەسەر دەستی کەمال ئەتاتۆرکی عەلمانیی، وە بە دەسیسە و دەستلەپشتدانی زلهێزان، دوایین ئاڵقەی دەوڵەتی ئیسلامیی بە نەخۆشیی و لەرزۆکی کۆتایی پێهات.

تەماشا دەکەین پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دوای ئەوەی کە کۆمەڵێکی مسوڵمان پەروەردە دەکات و پێ دەگەیەنێ، دەکەوێتە مشورخواردنی پەیداکردنی زەمینەیەك و بنکەیەکی جەماوەریی بۆ ڕاگەیاندنی قەوارەی ئیسلامیی، بۆچی؟ چونکە زانیویەتی کە خوای پەروەردگار تەنها بەوەندە ئاڕاستانەی کە لە قۆناغی مەککە دا بۆی ناردوون، بەس(اكتفاء) ناکات و ئەو دینە کامڵە قۆناغێکی دیکەشی هەیە کە دەبێ دەوڵەتی هەبێ و کیان قەوارەی هەبێ، بۆ ئەوەی کە سەرجەم ئەو یاساو دەستوورانەی کە بە کۆمەڵە مسوڵمانێکی بێ کیان وقەوارە جێ بەجێ ناکرێن، لە قۆناغی دەوڵەتدارییدا جێ بەجێیان بکەن.

با لەو بارەوە تەماشای ئەم دەقە بکەین: **{عَنْ جَابِرِ بن عبدالله رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ مَكَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ يَتْبَعُ النَّاسَ**

**فِي مَنَازِلِهِمْ بِعُكَاظٍ وَمَجَنَّةَ، وَفِي الْمَوَاسِمِ بِمِنًى، يَقُولُ: مَنْ يُؤْوِينِي، مَنْ يَنْصُرُنِي حَتَّى أُبَلِّغَ رِسَالَةَ رَبِّي وَلَهُ الْجَنَّةُ}**[1]

واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵڵا، كە یەكێكە لە مسوڵمانە ئەنصارییەكان، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (دە) ساڵان لە مەككە مایەوە، (مەبەستی ئەوەیە دوای ئەو دە ساڵە) لە بازاڕی عوكاز و بازاڕی مەجەننە وە لە كاتی حەج دا لە مینا بەسەر خەڵك و بەسەر تیرەكانەوە دەگەڕا، چی دەفەرموو؟ دەیفەرموو: (**مَنْ يُؤْوِينِي مَنْ يَنْصُرُنِي حَتَّى أُبَلِّغَ رِسَالَةَ رَبِّي وَلَهُ الْجَنَّةُ؟**) واتە: كێ من دەگرێتە خۆی، كێ پشتگیریم لێ دەكات تاكو پەیامی خوا بگەیەنم، وە لەبەرانبەردا بەهەشتی هەبێ؟، لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوە نەبووە كێ ئیمان دێنێت، چونكە ئەوە خەڵكێكی ئیماندار هەیە، ئیمانیان پێ هێناوە، چونكە فەرموویەتی: (مَن يُؤْوِينِي مَن ينصرني) كەواتە: ئەگەر ئیمانیش نەهێنن و شوێنیشی نەكەون، بەڵام گرنگ ئەوەیە پشتی بگرن و یارمەتی بدەن، واتە: كێ بۆم دەبێتە بنكەی جەماوەریی، كێ بۆم دەبێتە پشت و پەنا، تاكو قەوارەی سیاسیی دروست بكەم؟ ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەو هەوڵانەی بەردەوام بوو، وەك لە داهاتوودا باسی دەكەین، تاكو ڕێی لە یەسریبییەكان كەوت وە بە هاوكاریی وان قەوارەیەكی ئیسلامیی لە مەدینەدا بنیات نا.

ئنجا دیارە بۆ ئێمە پێش هەموو كەس پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەرمەشقە، ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ...﴿٢١﴾﴾ الأحزاب. ئێمە بۆ دینداریی و دنیاداریی و مسوڵمانەتییمان، پێش هەموو كەس چاو لە كێ دەكەین؟ بێگومان لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چونكە لە خۆدا

---

[1] رواه أحمد برقم: (١٤٤٩٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الألباني في (السلسلة الصحيحة) رقم: (٦٣).

بەرجەستەکەری قورئان بووە، خوای بەرز دەفەرموێ: بێگومان لە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم)دا بۆ ئێوە سەرمەشقییەکی باش هەیە، واتە: با ئەو سەرمەشقتان بێ و جێگای تەماشاو سەرنجتان و چاولێکردنتان بێ لە هەموو رووییەکەوە، ئنجا ئایا لە دوای ئەو کێ سەرمەشقی ئێمەیە؟ هاوەڵانی بەڕێز، کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) زۆر مەدحی کردوون، وە لە پێش پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا خوای گەورە مەدحی کردوون، ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ...﴿١٨﴾﴾الفتح/١٨. بۆچی خوا زۆر مەدحی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)ی کردوە؟ چونکە لە هەموو جیل و وەچەکانی مسوڵمانان باشتر و زیاتر لە دین تێگەیشتوون، وە پێشیەوە پابەند بوون، ئنجا ئایا هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەربارەی دەوڵەتداریی، هەڵوێستیان چی بووە؟ شتێکی ئاشکرایە لە مێژووی ئیسلام دا، بۆ نموونە (ابن كثير) هێناویەتی[1]: کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو ڕۆژە کەوەفات دەفەرموێ، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەکەونە مشوورخواردن بۆ دانانی حوکمڕانێکی جێنشین، لە پێش دا پشتیوانەکان لە ژێر کەپرێك دا بە ناوی (سقيفة بني ساعدة) کۆدەبنەوە، دوایی ئەبوبەکر و عومەرو ئەبو عوبەیدە (خوا لێیان ڕازی بێت) دەچن، وە پاش وتوویژ و مشتومڕ و سەرەنجام ئەوە دەبێت کە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) دەبێتە یەکەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، واتە: هێشتا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە خاك نەسپێردراوە، ئەوان چوون ئەو گرفتەیان چارەسەر کرد، ئەوە چی دەگەیەنێ؟ ئەوە دەگەیەنێ کە مەسەلەی هەبوونی قەوارەی سیاسی

[1] البداية والنهاية، ج٩ ص٣٠١.

شتێکی زۆر گەورەیە لە ئیسلام دا، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) جارێ لە جەنازەی موبارەکی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) گەڕاون، لەوێ داپۆشراوە و بەخاکیان نەسپاردوە!!، لەگەڵ ئەوەش دا کە دەبێ جەنازە زوو بە خاك بسپێردرێ، ئەویش جەنازەی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ)، کەچی جارێ دەچن چی دەکەن؟ کەسێك دیاریی دەکەن بۆ ئەوە کە سەرپەرشتیی دین و ژینیان بکات، بۆ ئەوەی کە ئەو دەوڵەت و قەوارە سیاسییەیان بۆ بەڕێوە بەرێ، جارێ سەرۆکێك دیاریی دەکەن، کەواتە: بەڕاستیی ئەوە بەڵگەیەکی زۆر زۆر بەهێزە لەسەر ئەوە کە یەکەم: هاوەڵانی بەڕێز یەکدەنگبوون لەسەر ئەوە کە پێویستە سەرۆکێکیان هەبێت، ئەگەرنا نەدەچوون پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بە خاك بسپێرن، بکەونە مشتومڕو کەسێك بکەنە سەرۆك و برا گەورەیان؟!!، دیارە یەکدەنگبوون لە سەر ئەوە کە ئەوە لە ڕووی دینییەوە، ئەرکێکی زۆر گەورەیەو لەسەریان پێویستە دەست و بردی لێ بکەن، دووەم: وە ئەوەش دەگەیەنێ کە بەڕاستی دانانی کاربەدەستان و دانانی سەرۆك و مشورخۆر لە ئیسلام دا مافی سەرجەم مسوڵمانانە، وە هیچ دەقێکی لەسەر نیە کە دەبێ فلان کەس بێت، واتە: وەصیەت بۆ کەس نەکراوە (وەك شیعە دەڵێن)!!، بەڵکو ئەوە کاری مسوڵمانانە و کاری مسوڵمانانیش خوا میکانیزمەکەی بۆ دیاریی کردوەو فەرموویەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ الشوری/٣٨. واتە: کاروباریان – بڕواداران – بە ڕاوێژە، هەر بۆیەش مسوڵمانان پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) ڕاوێژیان کرد و ئەبوبەکریان دانا، ئەگەرنا دانانی ئەبوبەکر وەنەبێ کە ئایەت و فەرموودەی لەسەر بێ، کە دەبێ هەر ئەو دابنرێ، هەر بۆیەش هاوەڵان کەوتنە مشتومڕەوەو پشتیوانان دەیانگوت: دەبێت حوکمڕان لە ئێمە بێ، وە کۆچکەرانیش دەیانگوت: دەبێ لە ئێمە بێ،

وە هەندێك لە بەنی هاشمیش دەیانگوت دەبێ لە ئێمە بێ، بەڵام سەرەنجام زۆرینەی مسوڵمانان لەسەر ئەبوبەکر یەکدەنگ بوون، پاشان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەو دەوڵەتەیان پارێزگاریی لێ کرد هەتا تەسلیمی نەوەکانی دوای خۆیانیان کرد، وە ئاڵقە بە ئاڵقە هات، وەك گوتم هەتا ساڵی (١٩٢٤) کە دوایین ئاڵقەی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە بە نەخۆشیی و لەرزۆکیی کۆتایی پێ هات.

وە ئەو دەوڵەتە کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بنیاتی نا، بە بەراورد لەگەڵ هەموو ئەو قەوارە سیاسییانەی کە لەسەردەمی ئەودا هەبوون، لە هەموویان پێشکەوتووتر و بووە: با بزانین چۆن؟

یەك: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قەوارە سیاسییەکەی لەسەر بناغەی بەیعەت دانا، دوای ئەوەی پەیمانی یەکەم و دووەمی عەقەبەی پێدرا لە لایەن خەڵکی مەدینەوە، کەواتە بناغەی دەوڵەتی پێغەمبەر، گرێبەستێك بوو لە نێوانی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و ئەو کۆمەڵگایەوە کە ئامادەبوون باوەشی بۆ بکەنەوە و پەیام و بەرنامەکەی لە باوەش بگرن و ئەویش بە سەرۆکی خۆیان قبووڵ بکەن.

دوو: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) صەحیفەیەکی نووسی کە لە (٤٦) ماددە پێکهاتبوو، واتە: دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەمین دەوڵەتە کە دەستوورێکی نووسراوی بووە، وەك دوایی باسی دەکەین.

سێ: دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەوڵەتێکی فرە لایەن بوو (plural- متعدد)، جوولەکەی تێدا بوو، موشریك و مونافیقی تێدا بوون، جگە لە مسوڵمانان، وە بەڕاستی ئەگەر بەراوردی ئەو قەوارە سیاسییەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بکەین بە پێودانگی ئەوکاتە (چونکە ناکرێ بە هی ئێستا بەراوردی بکەی، هەرچەندە ئەگەر

لەگەڵ هی ئێستایش دا بەراوردی بکەین لە ڕاستیدا لە هەموویان ڕاقی تره، بەڵام لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، نەك لە ڕووی فۆرم و شێوەیه)، بۆ وێنە: ئەگەر پێکهاتەی ئێستای کۆمەڵگاکان حیزبەکانن، هی ئەوکاتە تیره و هۆزەکان بوون، ئایا دەگونجا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بفەرموێ وەرن حیزب دروست بکەن!! بۆ ئەوەی فرەیی (تعدّد)ی حزبیی هەبێ؟!

## ٥- هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە لە یەکترازانی قورئان و سوڵتان:

وەك لە دوو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دا هاتوە، دیارە چەند فەرموودەیەك هەن لەو بارەوە، کە یەکێکیان پێشتر باسمان کرد و، لێرە بەس دەقەکەی دووبارە دەکەینەوە: **{لَيُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا الْحُكْمُ وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ}**[1] کە پێشتر مانامان کردوە.

فەرمودەی دووەم کە من زیاتر هەڵوەستەی لەبەردەم دا دەکەم، فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)یە، کە (**طبراني**) لە (**معاذ**)ەوە گێڕاویەتەوە، وە هەروەها (ابو نعیم) لە کتێبی (الحلية)دا گێڕاویەتەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

**{ألا إنَّ رحَى الإسلامِ دائرةٌ، فدُوروا مع الكتابِ حيث دار، ألا إنَّ الكتابَ والسُّلطانَ سيفترِقان فلا تُفارقوا الكتابَ، ألا إنَّه سيكونُ عليكم أمراءُ يقضون لأنفسِهم ما لا يقضون لكم، إن عصيتموهم قتلوكم، وإن أطعتموهم أضلُّوكم،**

---

[1] رواهُ أحمد برقم: (٢٢٢١٤)، وابنُ حبَّان برقم: (٦٧١٥)، والطَّبَرانيُّ برقم: (٧٤٨٦)، والحاكمُ برقم: (٧٠٢٢) وقال: صحيح، والبيهقيُّ في شعب الإيمان برقم: (٥٢٧٧)، وصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) رقم: (٥٧٢).

**قالوا: يا رسولَ اللهِ! كيف نصنعُ؟ قال: كما صنع أصحابُ عيسَى بنِ مريمَ عليه السَّلامُ، نُشِروا بالمناشيرِ ، وحُمِلوا على الخشَبِ، موتٌ في طاعةِ اللهِ خيرٌ من حياةٍ في معصيةِ اللهِ}.**

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆشدارییە بە ئێمە، وە هەواڵدانە بەوە کە کاتێك دێ کە ئیسلام حوکم و سیاسەتی لێ دادەڕنرێ، قورئان سوڵتانی لێ دوور دەخرێتەوە، کە ئەوە حاڵەتێکی نائاساییە. کەواتە: حاڵەتی ئاسایی ئەم ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتییە، ئەوەیە کە ئیسلام حوکم و سیاسەتی بەدەستەوە بێت، وە قورئان لەگەڵ سوڵتان بەیەکەوە بن، واتە: دەستەلاتی سیاسی.

فەرمایشتەکە دەفەرموێ: ((**ألا إنَّ رحَى الإسلامِ دائرةٌ، فدُوروا مع الكتابِ حيث دار**)) واتە: ئاگادار بن بەرداشی ئیسلام لە گەڕان دایە، یان: ڕەوڕەوەی ئیسلام لە بزاوتن دا دەبێ، دەجا ئێوە لەگەڵ ئیسلام دا بڕۆن بەرەو هەر شوێنێك چوو، (واتە: لە ئیسلامیی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا جیامەبنەوە)، ((**ألا إنَّ الكتابَ والسُّلطانَ سيفترِقان فلا تُفارِقوا الكتابَ**)) ئاگادار بن! قورئان و دەستەلات ڕۆژێك دێت لە یەکدی جیا ببنەوە. (دیارە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێکەوە بوون، وە لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان دا پێکەوە بوون، بەلام هەواڵی داوە کە کاتێك دێ لە یەك دەترازێن، دیارە لە سەردەمی (بني أمية)ەوە قورئان دوور خرایەوە لە سوڵتان، بەلام بە تەواوەتیی لێی دانەبڕا، لە شێوەی دانرانی بەرپرس و حوکمڕانانان و لە گەلێك بواری کارکردنیان دا ئیسلام پابەندیی پێوە نەدەکرا، بەلام لە زۆر ڕووی دیکەوە شەریعەت هەر حاکم بوو، بەلام دوایی کە سیستەمی عەلمانیی دامەزرا و لەسەر بناغەی بێدینایەتیی قەوارە سیاسییەکان دامەزران، ئەو کاتە بە یەکجاریی قورئان و ئیسلام و فەرامۆش کران).

جا دوایی دەفەرموێ: (**فلا تُفارقوا الكتابَ**) لە قورئان جیا مەبنەوە، (واتە: ڕەگەڵ دەسەڵاتێك مەكەون كە لەگەڵ قورئان دا نیە، هەر لەگەڵ قورئان و دینی خوادا بن و بەدەم دەسەڵاتی ناشەرعییەوە مەچن)، (**ألا إنَّه سيكونُ عليكم أمراءُ يقضون لأنفسِهم ما لا يقضون لكم**) ئاگادار بن لەمەودوا دەسەڵاتدارانێك دێن، ئەوەی كە بۆ خۆیان بڕیاری لەسەر دەدەن ئاوا بۆتان بڕیار نادەن، (واتە: هەموو شتێك بۆ خۆیان قۆرخ دەكەن و ئێوەی لێ بێ بەش دەكەن، هەموو شتێك بۆ خۆیان بە ڕەوا دەزانن، بەڵام وا دەزانن ئێوە سواڵكەرن، شتێكتان كە دەدەنێ، بەو چاوەوە سەیرتان دەكەن، هەرچەندە ڕۆنی خۆتانە لەسەری خۆتانی دەدەنەوە !!).

تەماشابكەن! پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چۆن هەواڵیداوە بە حوكمڕانی خۆسەپێنو بەزەبرو زۆر، ئەوەی كە بۆ خۆی بە ڕەوای دەبینێ، بۆ تۆی ڕەوا نابینێ، كە لە ئەسڵ دا ئەو حوكمڕانە دەبێ نوێنەری مسوڵمانان و وەكیلی مسوڵمانان بێ، بۆ ئەوەی شەریعەتیان بەسەردا پیادە بكات ، وە دەبێ لە خزمەتی خەڵك دا بێ، كەچی بە چاوی خزمەتكار تەماشای خەڵك دەكات!!

ئنجا دەفەموێ: (**إن عصيتموهم قتلوكم، وإن أطعتموهم أضلُّوكم**) ئەگەر سەرپێچییان لێ بكەن دەتانكوژن ، وە ئەگەر بە قسەشیان بكەن گومڕاتان دەكەن، (**قالوا**) هاوەڵان گوتیان (**يا رسولَ اللهِ! كيف نصنعُ؟**) ئەی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چی بكەین لەو ڕۆژەدا؟ واتە: ئەو مسوڵمانانەی لەو ڕۆژگارەدان چی بكەن؟ (**قال: كما صنع أصحابُ عيسَى بنِ مريمَ عليه السَّلامُ**)، هاوەڵانی عیسای كوڕی مەریەم چییان كرد، ئێوەش ئەوە بكەن، واتە: چاو لەوان بكەن، چاو لە پێشینە چاكەكان بكەن، شوێنكەوتووانی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ، (**نُشِروا بالمناشيرِ ، وحُمِلوا على الخشَبِ**) ئەوان بە مشار

شـەقیان کـردن، وە لـە خـاچ و داریـان دان، واتـە لـە سـێدارەیان دان، بـەڵام هەڵتەگەڕانەوە، ئێوەش وا بکەن.

دوایی دەفەرموێ: **(موتٌ في طاعةِ اللهِ خيرٌ من حياةٍ في معصيةِ اللهِ)**، چەند تەعبیرێکی جوانە!! مردنێك لە فەرمانبەریی خوادا، باشترە لە ژیانێك کە لە سەرپێچیی خوا دا بێ، واتە: ئەگەر بمری، بەڵام بەفەرمانی خوا بکەی، باشترە لەوەی کە بژی، بەڵام سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکەی. کەواتە: ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە حاڵەتی ئاسایی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و میللەتێکی مسوڵمان ئەوەیە کە قورئان و سوڵتانەکەی بەیەکەوە بن، ئەوەیە کە سوڵتان لە خزمەت قورئان دا بێت، دەسەڵاتی سیاسی لە خزمەتی شەریعەتدا بێ، بەڵام حاڵەتی نائاساییان ئەوەیە کە لە یەك دەترازێن .

## ٦- یەکدەنگیی زانایان لەسەر پێویستبوونی دەوڵەت:

بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوە کە قەوارەی سیاسی پێویستە بۆ ئیسلام، وە ئیسلام بە بێ دەسەڵاتی سیاسیی و بەبێ دەوڵەت نایکرێ، بریتییە لە یەکدەنگیی زانایان، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن .

ئێستاش با قسەی چەند زانایەکی پێشین لەو بارەوە بێنینەوە.

١- یەکێك لەوانە (ابن حزم الأندلسي) کە لە کتێبی (الملل والنحل)دا دەڵێ:

**"اتفق جميع أهل سنة، وجميع المرجئة وجميع الشيعة، وجميع الخوارج على وجوب الإمامة . وأن الأُمّة واجب عليها الانقياد لإمام عادل، يقيم فيهم أحكام الله، ويسوسهم بأحكام الشريعة التي أتى بها رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم، حاشاً النجدات من الخوارج"**[1]، واتە: سەرجەم ئەهلی سوننەت، وە تێکڕای مورجیئەکان، وە تێکڕای شیعە و سەرجەم

[1] النظم السياسية: الدولة والحكومة، للدكتور محمد كامل ليلة، ص٤٣٦.

خەواریج، (دیارە مسوڵمانان لەو سەردەمەدا بۆ ئەم چوارە دابەشبوون) هەموو ئەوانە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەبێ مسوڵمانان پێشەوا و سەرۆکیان هەبێ، وە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئوممەتی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وە کۆمەڵگای مسوڵمان لەسەریان پێویستە ملکەچ بکەن بۆ پێشەواو سەرۆکێکی دادگەر کە یاساکانی ئیسلام بەسەر تاکەکان دا جێبەجێ بکات، وە بە پێی یاساکانی شەریعەت سەرپەرشتییان بکات، ئەو شەریعەتەی کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هێناویەتی، (هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن) جگە لە بەشێك لە گرووپی خەواریج کە ناویان (نجدات) بووە، کەواتە: (ابن حزم) لێرەدا لەسەردەمی خۆیدا یەکدەنگیی هەموو زانایانی ئیسلام و سەرجەم مسوڵمانان نەقڵ دەکات.

٢- یەکێکی دیکە لەو زانایانە (أبو حامد الغزالي)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە کتێبی (إحياء علوم الدين)دا گوتویەتی: **"إن الدنيا مزرعة الآخرة، ولا يتم الدِّين إلا بالدنيا. والمُلك والدِّين توأمان، فالدِّين أصل والسلطان حارس، وما لا أصل له فمهدوم، وما لا حارس له فضائع، ولا يتم المُلك والضبط إلا بالسلطان".**[1]، واتە: دنیا کێڵگەی دوا ڕۆژە، (واتە: دەبێ لە دنیادا کرد و کۆش بکەی بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا بەرهەمەکەی وەربگریتەوە)، وە دین تەواو نابێ مەگەر بە دنیا، (واتە: دین بەڕێوە ناچێ ئەگەر دنیات بەدەستەوە نەبێ)، وە موڵك (واتە سیاسەت و حوکمڕانیی)و دین دووانەن و پێکەوەن، (ناگونجێ لێك جیا بکرێنەوە)، دین بناغەیە و دەسەڵاتی سیاسییش پاسەوانە، وە هەرشتێك بناغەی نەبێ ڕووخاوە و، هەرشتێکیش پاسەوانی نەبێ فەوتاوە، (کەواتە:

---

[1] ج١ ص٧١

دەوڵەتداریی ئەگەر دین نەبێتە بناغەکەی و بەها بەرزەکانی ئیسلام نەبنە هەوێن و هەناوی، ئەوە ڕووخاوە، چونکە پڕ دەبێ لە ستەم و خراپە، هەروەها دینیش ئەگەر بێت و دەسەڵاتی سیاسیی لەگەڵ نەبێ فەوتاوە، وەك چۆن کێڵگەیەك، باخێك ئەگەر پاسەوانێکی نەبێ، دز و جەردە ڕووی تێ دەکەن و ئاژەڵی بەرەڵڵا زیانی پێ دەگەیەنن، بەڵێ دین کاتێك دەسەڵاتی سیاسیی لە پشتەوە نامێنێ، دەکەوێتە ژێر ڕەحم و چەکمەی زۆردارانەوە، دواتر دەڵێ: حوکمڕانیی و کۆنترۆڵکردنیش تەنها بەدەستەڵات دەبێ، واتە: دەبێ کەسێك هەبێ وە لایەنێك هەبێ کە سەرپەرشتیی کاروبار بکات.

٣- (الماوردي)یش یەکێکە لە زانایانی مسوڵمانو لە نووسینە سیاسییەکاندا زۆر مەشهوورە بە کتێبە ناودارەکەی (الأحكام السلطانية)، ئەویش لەو بارەوە گوتوویەتی: (**الإمامة موضوعةٌ لخلافة النبوةِ في حراسة الدين وسياسة الدُنيا، وعقدها لمن يقوم بها واجبٌ بالاجماع، وان اختلف في وجوبها هل وجبت بالعقل او بالشرع؟!**)[1]. واتە: ئیمامەت (وشەی ئیمامەت، یان خیلافەت، یان ئیمارەت، مەبەستیان پێی حوکمڕانیی و دەسەڵاتی سیاسییە) دانراوە بۆ جێدارێتیی پێغەمبەرایەتیی، تاکو پاسەوانیی دین بکات وە سەرپەرشتی دنیاش بکات، وە گرێدانی ئیمامەت (واتە: یەکێك بکرێتە سەرۆك و حوکمڕان) بۆ کەسێك لە توانایدا هەبێ، پێویستە، بە یەکدەنگیی زانایان، (**وان اختلف في وجوبها، هل وجبت بالعقل أو بالشرع؟**) با ڕاجیاییش هەبێ لەو بارەوە کە ئایا بە عەقڵ واجبە، یان بەشەرع؟

---

[1] ص٥، ط/١٩٦٠.

بەلاّم من دەڵێم: هەم بە عەقلّ و هەم بە شەرع واجبە، واتە: هەم عەقلّ پێویستی دەکات، وە هەم دەقەکانی شەرعیش، وە سروشتی ئیسلامیش پێویستی دەکەن، کە دەبێ مسوڵمانان دەسەلاّتی سیاسییان هەبێ و حوکمڕان و سەرپەرشتیارێکیان هەبێ.

٤- دوایین قسەش لەوبارەوە لە (ابن تیمیة)وە دێنین، کە دیارە ئەوي زاناياگی پایەداری ئیسلامەو لەسەدەی هەشتەمی کۆچییدا ژیاوە، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایانی پێشین و پاشین بێت، وە یەکێکە لەو زانایانەی کە بەڕاستی چاکەی زۆری هەیە لە چاوی مسوڵمانان دا بە هی ئەم سەردەمەشەوە، چونکە (ابن تیمیة) لە ڕۆژگارێکدا ژیاوە کە لە زۆر ڕووەوە دەشوبهێتە ئەم ڕۆژگارەی ئێستامان، بۆیە لە (مجموع الفتاوی)ەکەی دا کە (٣٥) بەرگە، وە لە کتێبەکانی دیکەی دا، بۆ نموونە لە (منهاج السنة النبوية) باسی زۆر بابەت و مەسەلەی کردوە، کە کەم و زۆر لەم سەردەمەی ئێستاشمان دا بە شێوەیەك لە شێوەکان هەن، ئنجا (ابن تیمیة) دەڵێ: (**يَجِبُ أَنْ يُعْرَفَ أَنَّ وِلَايَةَ أَمْرِ النَّاسِ مِنْ أَعْظَمِ وَاجِبَاتِ الدِّينِ" بَلْ لَا قِيَامَ لِلدِّينِ وَلَا لِلدُّنْيَا إلَّا بِهَا . فَإِنَّ بَنِي آدَمَ لَا تَتِمُّ مَصْلَحَتُهُمْ إلَّا بِالِاجْتِمَاعِ لِحَاجَةِ بَعْضِهِمْ إلَى بَعْضٍ وَلَا بُدَّ لَهُمْ عِنْدَ الِاجْتِمَاعِ مِنْ رَأْسٍ حَتَّى قَالَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **{إذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ}**[1]..[2]) واتە: پێویستە بزانرێ کە سەرپەرشتی کردنی کاروباری خەڵك لە گەورەترین ئەرکەکانی دینە، بەڵکو دین و دنیا بەڕێوە ناچن و ڕاوەستاو نابن مەگەر بەوە، (واتە: بە

[1] رواه أبو داود برقم: (٢٦١٠)، من حديث أبي سعيد وأبي هريرة قال الشيخ الألباني: حسن صحيح.

[2] السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية، شرح ابن عثيمين، ص٣٣٧.

سەرپەرشـتیی کـردن و بـە سیاسـەت کـردن و بـەوە کـە قـەوارەو سەرپەرشـتیارییەك هـەبێ.. ئنجـا بەلگـە دێنێتـەوەو دەڵـێ:) چـونکە مرۆڤـەکان بەرژەوەنـدییان نایەتـە دی مەگـەر خڕبنـەوە سـەر یـەك، لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەندێکیان پێویستییان بـە هەنـدێکیان دەبـێ، وە کاتێکیش کە کۆ دەبنەوە سەریەك، پێویستییان بە سەرێك هەیـە، هـەتا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی (**إذا خـرج ثلاثـةٌ في سفرٍ فليـؤمروا أحـدهم**) واتـە: ئەگـەر سـێ کـەس بەسەرفەرچوون، بـا یـەکێکیان بکەنـە فەرمانـدەیان، ئنجـا لـە درێـژەی قسـەکانیدا دەڵـێ: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: ئەگەر سێ نەفەر -کـە کۆمـەڵێکی کـەمن- بەسەفەرچـوون، بـۆ کـاری زۆر کـاتیی سـەفەرکردن، پێویستە یەکێکیان فەرماندەیان بێت، ئەدی ئەگەر ژمارەیەکی زیاتر لـە سێ نەفەر و بۆ حاڵەتێکی بەردەوام تر، کە نیشتەجێ بوونـە لـە شـاری وڵاتـەکان دا!! ئـەوە بێگومـان پێویسـترە کـە دەبێـت بـەرپرس و مشورخۆریان هەبێ.

دیارە من بەس بۆ نموونە ئەو چوار زانایەم هێنانەوە، ئەگەرنا تێکڕای زانایانی پێشین و ڕابردوو لەسەر ئەو مەسەلەیە یەکدەنگن.

زانایانی هاوچەرخیش، ئەوە دیارە بە بـێ هەڵاواردن، هەمان ڕایـان هەیـە، جگە لەو (علي عبدالرازق)ە، کە ئەویش دوایـی پەشێمان بۆتـەوە لـە قسـەکەی خـۆی، وە جگـە لـە پیـاوێکی وەك (خالـد محمـد خالـد) کـە دوایـی بـۆ خـۆی گوتوویەتی: بەهەڵەدا چووم، ئەگەرنا لە ڕاستیدا هیچ زانایەکی موعتەبەر نیـە کە چوار مسوڵمان بڵێن: ئەوە یەکێکە لـە زانایـانی ئیسـلام، وە ڕای وانـەبێ کـە پێویسـتە مسـوڵمانان قەوارەیـەکیان هـەبێ، وە ئیسـلام پێویسـتی بـە دەوڵـەت دەکات بۆ ئەوەی شەریعەتەکەی پیادە بکرێ و بەڕێوە ببرێ.

### بەڵام ئایا ئەم بابەتە کەی ورووژێنرا؟

وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، ڕاست لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی، کە لە ساڵی (١٩٢٤) بە فەرمیی ڕاگەیەنرا، کە دەوڵەتی عوسمانیی ڕووخا، وە حکوومەتێکی کۆماریی عەلمانیی لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتۆرك) لەسەر بەشێك لە سەرزەمینی دەوڵەتی عوسمانیی بنیات نرا، کە دەوڵەتی تورکیای ئێستایە، وە دەگونجێ بڵێین: ئەوە پیلانێك بوو لەلایەن زلهێزانەوە، بۆ ئەوەی کە مسوڵمانان جارێکی دیکە بیر لەوە نەکەنەوە کە دەوڵەت و قەوارەیان هەبێ، چونکە هەندێك دیکۆمێنت(وثائق) هەن، وەك (د.محمد عمارة) باس دەکات و لە کتێبی (الإسلام والحكم)دا دەڵێت: کۆمەڵێك دیکۆمێنت و زانیاری هەن، کە خەڵکێکی ڕۆژئاوایی دەستیان هەبووە لە دانانی ئەو کتێبەدا لە لایەن (علي عبدالرازق)ەوە، هەتا هەندێك دەڵێن: کەرەستەکەی خراوەتە بەردەست و هی خۆی هەر نەبووە!!، بۆیە تەنها ئەو کتێبەی هەبووە لە هەموو ژیانیدا و دواییش لێی پەشیمان بۆتەوە، ئامانجیش لێی ئەوە بووە کە مسوڵمانان جارێکی دیکە باسی دەوڵەت نەکەن، وەك پێشتریش گوتمان، وەك چۆن زۆر جار لەلایەن ڕۆژهەڵاتناس و ڕۆژئاواییەکانەوە باس دەکرێ کە ئیسلام بە شمشێر و هێز و چەك بڵاوبۆتەوە، یان ئیسلام دینی توندوتیژیە!! بۆ ئەوەی مسوڵمانان لە کاردانەوە (رد فعل)ی ئەوەداو بۆ دوورخستنەوەی ئەو تۆمەت(إتهام)ە! بیر لەوە نەکەنەوە کە بەرگریی لە خۆیان و لە دین و ژینیان بکەن، بەڕاستی سەیرە! هێرش دەکرێتە سەر جەنگ و جیهاد لە ئیسلام دا، وە هەبوونی هێز و چەك لە دەستی مسوڵمانان دا، لە حاڵێك دا کە هەرچی چەك و تەقەمەنییە بە دەستی ئەوانەوەیە!!، ڕۆژئاوا با چەکی نەوەویشی هەبێ وە هەڕەشەی پێ لە دنیاش بکات، بەڵام مسوڵمان نابێ (ساچمەزەنێکیشی) پێ بێ!!، چونکە بۆ تۆی مسوڵمان بڤەیە!!، بەڵام بۆ ئەوی نامسوڵمان قەیناکات!!، ئاخر باشە ئێوە ناڵێن:

دیموكراسیی و مەدەنییەت؟! وادیارە چەك تەنیا لەوان جوانە، چونكە هەڵگری دیموكراسیی و مەدەنییەتن!!، وەك لە كتێبێك دا بینیم كە شێخێكی جەزائیریی ئەوكاتەی كە فەڕەنسییەكان جەزائیریان داگیر كرد، بە شێخەكە دەڵێن: ئەو فەڕەنسییانە بۆ ئاوەدانیی (استعمار)ی وڵات هاتوون، شێخەكەش دەڵێ: باشە با ئاوەدانی بكەنەوە، بەڵام ئەدی ئەو هەموو چەك و باڕووت و جبەخانەیان بۆ چییە؟؟!!! ئایا چەك و باڕووت و جبەخانەیان بۆچییە، بۆ ئاوەدانكردنەوەیە یان بۆ وێرانكردنە!!

لە ڕاستیدا ئەم بابەتە هەڵقولاو و زادەی جیهانی ئیسلامیی نەبووە، چونكە جیهانی ئیسلامیی ئەوەی لێ هەڵقولاوە كە دەبێت دووبارە دەوڵەتەكەمان بۆ دروست بێتەوە، نەك نامانەوێ!!، ئەدی كێ دەڵێ نابێ مسوڵمانان دەوڵەتی هەبێت؟ لە ڕاستیدا كەسانێكن بەرژەوەندییان لەوەدا نیە كە مسوڵمانان دەوڵەت و سایە و سێبەریان هەبێ، بۆ ئەوەی كە پاروویەكی چەور و نێچیرێكی تووك نەرم بن بۆیان، پاشان كەسانێكیش لە جیهانی ئیسلامییدا لە ڕووی نەزانییەوە، یان لە ڕووی كلاو لەسەرنرانەوە، قیاسی مسوڵمانانیان كردوە لە ڕۆژئاوا، كە ئایینی شێوێنراوی وان (نەصرانیەت) شەریعەتی هەر تێدا نیە، واتە: لەوێ (ڕۆژئاوا) دین لە ژین جیانەكراوەتەوە، بەڵكو دینی نەصرانی ئەوكاتە شتێكی بۆ خۆی قۆرخكردبوو كە پێچەوانەی سروشتی بوو، بەڵێ نەصرانییەت پێچەوانەی سروشتی بوو، كە حوكمداریی بكات، چونكە شەریعەتی نیە، بەڵام ئیسلام سروشتەكەی داخوازیی دەكات كە حوكمڕانیی بكات، چونكە شەریعەتی تێدایە و حەڵاڵ و حەڕامی دیاری كردوە و ئەمرو نەهی تێدایە، بەڵام وەرە چوار ئینجیلەكان تەماشا بكە، بزانە هەمووی ئامۆژگاریی نیە؟ هەموویان بەس ئامۆژگاریی و لایەنی ڕووحیی لە خۆ دەگرن، ئنجا ئایا چۆن بەوە حكوومەت و دەستەڵات بەڕێوە دەچێ؟! هەر بۆیەش نەصرانییەت كاتێك كە لە كەوڵی خۆی چووە دەر و ویستی حوكمڕانیی بكات،

ناچار بوو چی بکات؟ هەڵسا لە ئیغریقی کۆن و یۆنانی کۆنـەوە قـانوونی هێنـا، چونکە ئینجیلەکان قانونیان تێدا نـەبوو، ئنجا دوایـی عەلمانییـەت پەیـداکرا و داهێنرا، بۆ ئەوەی ئەو بۆشایی یە ئیداریی و سیاسیی و بێ بەرنامەیی یەی کە لە ڕۆژئاوادا هەبوو، پێی پڕ بکرێتەوە.

بەڵام ئێمـەی جیهانی ئیسلامیی زۆر پێچەوانەی حاڵـەتی جیهـانی ڕۆژئـاوا بووین، ئێمە خاوەنی شەریعەتێکین، وە شەریعەتەکەی ئێمە و ئیسلامیی ئێمە، ئەگـەر دەوڵـەتی بـە دەسـتەوە نـەبێ، زوڵمـی لـێ دەکـرێ، بـەڵام نەصـڕانییەت ئەگـەر دەوڵـەتی بەدەسـتەوە بـێ زوڵمـی لێـدەکرێ!!، بـە پێچەوانەوە!! چونکە نــازانێ چـۆنی بــەڕێوە ببــات! ئیسـلامیی ئێمــە دەوڵــەتی لـێ دوور بخەیتــەوە، ستەمی لێدەکەی، چونکە پەکی دەخەی، وە جێبەجێ ناکرێ، ئەگەرنا تـۆ بێنـە نـەصـڕانییەت کـوا کـەی پـەکی لەسـەر دەوڵـەت کـەوتوە، بـۆ ئـەوەی دینـداریی خۆیان بکەن، کە تەنیا شتێکە لـەنێوان خۆیـان و خـوادا، لـە ئینجیـل دا هـاتوە: (دَع ما لقيصر لقيصر، وما لله، لله)، هەرچەنـد پێم وایـە ئـەو قسـەیە بـە دەمـی عیساوە هەڵبەستراوە، بـەڵام گـرنـگ ئەوەیـە ئـەوە بەشـێکە لـە عەقیـدە و دینـی نـەصـڕانییەت، واتــە: ئـەوەی هـی خوایـە بـۆ خـوای لـێ گـەڕێ وە ئـەوەی هـی قەیصەرە بۆ قەیصەری لێ گەڕێ، ئایا ئیسلام وا دەڵـێ؟ ئیسـلام دەڵـێ: هـەموو شتێك هی خوایـە( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً ..﴿٢٠٨﴾)البقرة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بەتەواویی بچنە نێو ئاشتییەوە (ملکەچی دینی خوا بن).

**ڕوونکردنەوەی ڕاستییەك:**

بـۆ ئـەوەی دووچـاری سـتەم و بـێ ئینسـافیی نـەبین بەرانبـەر بـە دەوڵـەتی ئیســلامیی، پێویســتە ڕاســتییەك بــەجوانیی ڕوون بکەینــەوە، هەرچــەندە پێشتریش ئاماژەیەکمان پێدا: کە دەڵێین لەڕووی دەوڵەتداریی و حوکمڕانییەوە

لادان و دوورکەوتنەوە لە شەریعەت هەبووە، واتە: لە ڕووی دانرانی حوکمڕان و کاربەدەستانەوە، کە لە ئیسلام دا یەك میکانیزم هەیە بۆ دانرانی حوکمڕان و کاربەدەستان، ئەویش بریتییە لە دیارییکردنیان لەسەر بناغەی ڕاوێژ: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ... ﴿٣٨﴾﴾ الشوری/٣٨. پاشان بەڕێوەچوونی پرۆسەی (بیعة) واتە: بەڵێن و پەیمان پێدرانی حوکمڕان لە لایەنی خەڵکەوە بە شێوەیە ئازادانە و ئارەزوومەندانە، بێگومان لەم ڕووەوە گرفت هەبووەو دانانی حوکمڕان لە جیاتی ئەوەی بە شوورا بێ، کرا وە بە میراتیی و بە خۆسەپاندن، کە هەندێك لە شەرعزانان (ولایة المتغلِب)ی پێ دەڵێن، واتە: کێ دەسەڵاتی هەبوو، وە خۆی سەپاند، دەبێ بە قسەی بکرێ!! کە لە ڕاستیدا ئەوە شتێکە هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیەو بریتی بووە لە پاساوی واقیع و تەفسیری واقیع، بەڵام لە لایەنەکانی دیکەی ژیان دا، وەك: کۆمەڵایەتیی و خێزانیی و ئابووریی و زانستیی و فیکریی، جارێ زانایان هەر ئازاد بوون، هەرچەندە جارجار فشاریان خراوەتە سەر و جاری وا بووە تووشی سجن و ئازار و کوشتنیش بوونەتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە دامەزراوەی زانایان بۆ فەتوا و ڕوونکردنەوەی دین بۆ خەڵك هەر سەربەخۆ بووە، پاشان (ئەوقافەکان) هەبوون، وەقفی جۆراوجۆر و زۆر، ئینجا ڕێبازەکانی تەصەووف (طرق التصوف) هەبوون، کە قوتابخانە بوون بۆ پەروەردەکردنی خەڵك، پیاوی وەك (عبدالقادری گەیلانیی) هەبووە لە بەغداد، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە ئامۆژگاریی مسوڵمانانی کردوە و چەندان کەس لەسەر دەستی مسوڵمان بوون و تۆبەیان کردوە، کە دەڵێت: ڕۆژێك ئامۆژگاریی دەکرد لەسەر مینبەری مزگەوت و لەوکاتەدا خەلیفەش دانیشتبوو، چەند قسەیەکی هەق و ڕەق ڕوو بە خەلیفە دەکات، کەسێك لێی دەپرسێ: ئەی شێخ! خەلیفە لەوێ دانیشتبوو، ئایا

شەرمت لێ نەکرد؟ ئەویش دەڵێ: کە هەیبەت و عەزەمەتی خوام دێنایە بەرچاوم، خەلیفە هەر بە قەدەر پشیلەیەك دیار بوو!!

هەروەها دەستەڵاتی دادوەریی (قضاء) بەمانای وشە سەربەخۆ و دەستکراوە بووەو، گەلێك جار حوکمی بەسەر خەلیفەشدا داوە!

وە لە بواری پیشە(حرفة)کان دا، وەك چۆن ئێستا ڕێکخراوە پیشەیی یەکان هەن (منظمات ونقابات) هەن، ئەو کاتەش خاوەن پیشەکان (أصحاب الحرف) وەك چەند دامەزراوەیەکی مەدەنیی هەبوون، وە سەربەخۆ بوون و دەوڵەت دەخالەتی لە ئیش و کاریاندا نەکردوە، هەروەها (محتسب)کان هەبوون، واتە: فەرمانکەران بەچاکە و ڕێگریی لە خراپەکەران هەبوون، کە بەسەر بازاڕو شوێنە گشتییەکانەوە چاودێر بوون، ئەوانە هەموویان هەبوون، وە بە پێی شەریعەتیش بەڕێوەچوون، بۆیە ستەم لە دەوڵەتی ئیسلامیی دەکرێ ئەگەر بگوترێ بە گشتی لە ئیسلام وشەریعەت لایداوە.

# بەشی دووەم

# چۆنیەتی بنیاتنانی
# قەوارەی سیاسی
# لە ئیسلامدا



بەڕايي: وەڵآمي ثرسياريَك

خوێنەری بەڕێز! بەرلەوەی بچینە سەر باسی ئەوە، کە ئایا ئیسلام شێوازو میکانیزمی چییەو چۆنە بۆ بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی؟ بەپێویستی دەزانم وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: ئایا مسوڵمانانی هاوچەرخ، تەوژمی ئیسلامیی، ئیسلامییەکان چۆن تەماشای بابەتی حوکمڕانیی و سیاسەت دەکەن، وەچۆن کاری ئیسلامیی دەکەن؟ ئایا ئامانجیان لەکارە ئیسلامییەکەیان چییە؟ لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە بە داخەوە زۆر کەس لەوانەی بە ئێمە ئاشنانین، یان لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشامان دەکەن، یان لەهەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن، پێیان وایە کە کارو پڕۆژەی ئیسلامیی یان جموجۆڵی ئیسلامیی ئامانج لێ ی تەنیا بریتیە لە دەست گەیاندنە کورسی حوکم و دەستەڵات، بەڵام بەڕاستیی ئەوە وانیە، چونکە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا، لە مەسەلەی حوکمڕانییدا قەتیس نەبووە، وە کاروکردو کۆششی ئیسلامییانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەگشتی، وەپێغەمبەری کۆتایی وسەروەریشیان موحەممەد(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بەتایبەت، ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین کارێکی گشتگیرو هەمە لایەنە بووە و بەرلەوەی مەسەلەی حوکمڕانیی و سیاسەت و گۆڕینی هەرەمی دەستەڵاتیان لەبەرنامەدابووبێ، بابەتەکانی: ئیمان و عەقیدە، عیبادەت، ئەخلاق و بەهابەرزەکان، تەزکیەی نەفس، وە گۆڕینی عادەت و نەریتە هەڵەکانی کۆمەڵگا، ئەوانەیان لە بەرنامەدا بووە، ئنجا ئێمەش وەك کەسانێکی ئیسلامیی کە بە تەئکید دەمانەوێ شوێن پێی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەڵبگرین و بەدوای پێغەمبەری کۆتایی بکەوین، وە دینیش لەقورئان و

سوننەتدا دەبینین (وە دیارە خۆشمان بەمولزەم دەبینین کە هەر لەو ڕێگایەوە بڕۆین)، هەڵبەتە گۆڕینی کۆمەلگاو دەسـتەلات و سیستەمی حوکمڕانییش لەکۆمەلگادا، چەند پێشەکییەکی هەن، کە ئەگەر ئەو پێشەکییانە نەبن و ئەو زەمینەسازییانە نەبن، بێگومان ئەو ئامانجەش نایەتەدی، وە منێکی ئیسلامیی وەك چۆن بیردەکەمەوە لەوە کە قورئان حاکم بێ، لە ڕووە سیاسییەکەیەوە، لە پێش ئەوەشدا بیر لەوە دەکەمەوە کە قورئان حاکم بێ و شەریعەتی خوای پەروەردگار ڕەنگ بداتەوە لەژیانی میللەتەکەمدا، لەڕووی فیکرەوە، لە ڕووی عەقیدەوە، لەڕووی عیبادەتەوە، لەڕووی ڕەوشت و خووەوە، لەبواری خێزاندا، لە بواری کۆمەڵایەتییدا، لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا..هتد، چونکە تا کۆمەلگایەك دروست نەبێ، دەوڵەتێك پێك نایەت، شتێکی ڕوون و بەلگەنەویستە کە دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی لەهەناوی کۆمەلگا پەیدا دەبێت، بۆیە ئێمە بەرلەوەی بیربکەینەوەو چاوببڕینە مەسەلەی دەستەلات و حوکمڕانیی، چاو چڕدەکەینەوە لە سەر گۆڕینی کۆمەلگاو پاکسازیی و چاکسازیی کۆمەلگا، لەڕووی فیکریی وعەقیدەیی و ئەخلاقیی...هتد، چونکە بەبێ ئەوە وەك گوتم کۆمەلگا گۆڕانی بەسەردا نایەت و تا کۆمەلگاش نەگۆڕدرێ، لەڕووی ژێرخانە فیکریی و کۆمەڵایەتیی و ڕەوشتییەکەیەوە، سەرخانەکەی ناگۆڕدرێ، واتە: دەستەلات و حوکمڕانییەکەی.

دیارە بەئەندازەی ئەوەش کە ئێمە لەبواری ڕاست کردنەوەی عەقیدەی ناتەواوی خەلکی و، ڕاست کردنەوەی بیرو بۆچوون و فیکری هەڵەی خەلك، وە ڕاست کردنەوەی ڕەوشت و خوو ڕەفتاری لار و خواری خەلك دا، بە ئەندازەی ئەوە کە ئێمە لەو بوارانەدا کەمتەرخەمیی دەکەین، لە هێنانەدی ئەو ئامانجەش -کە وەك گوتم کەسانێك پێیان وایە ئەوە تاکە ئامانجی ئێمەیە- دوور دەکەوینەوە، بەلام بۆ ئەوەی تووشی بێ ئینسافیی نەبین لەگەڵ خۆمان دا، دەبێ بلێین: ئەو کەمتەرخەمییە هەندێکیشی ناکەوێتەوە سەر ئەوەی کە

ئێمە لە بەرنامەماندا نەبێ، بەڵکو هەندێکی دەکەوێتە سەر ئەوە کە ئێمە ڕێگامان لێدەگیرێ، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە: هەندێکیشی بەڕاستیی بەناحەق نادیدە دەگیرێ، ئەگەرنا تەماشا بکە! ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی لەم هەرێمی کوردستانەدا ژمارەیەك قوتابخانەی شەرعییمان هەن بۆ تێگەیاندن و پەروەردەکردنی کەسانێکی شارەزا لە شەریعەت و زانستە ئیسلامییەکان، کە دیارە ئەوە کارێکی پەروەردەییە، وەپاشان ڕێکخستنەکانی ئێمە، وە ڕاگەیاندنەکانی ئێمە بەهەموو جۆر و بەشەکانیانەوە، کارێکی زۆر گەورەو گرنگ و بەرچاویان بریتیە لە بانگەواز و بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵك و پەروەردەکردنی خەڵك، لەڕووی ئیمان و عەقیدە و تەزکیەو فیکر و ئەخلاق و...هتد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دان بەوەدا دەنێم کە وەك تەوژمی ئیسلامیی، کەلێن و بۆشاییمان هەیە لەو بوارەداو دەبێ پڕی بکەینەوە، چونکە بەڕاستیی کاتێك سیاسەتمەداران و حوکمڕانانێکی سەرکەوتوو پێدەگەیەنرێن کە پێشتر لەڕووی: ئیمانیی، فیکریی، ئەخلاقیی یەوە پەروەردەکرابن، چونکە بابای حوکمڕان ئەگەر لەو ڕووانەوە پێشتر کاری لە سەر نەکرابێ، ئەو کاتە کە دەچێتە سەر کورسی حوکمیش، یاخود کارێك یان بەرپرسیارێتییەکی پێدەسپێردرێ، خیانەتی لێ دەکات یان بە کەم و کوڕییەوە جێبەجێ ی دەکات، هەربۆیەش ئەوانەی کەپێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەقۆناغی مەککەدا زۆر بە نەفەس درێژیی پێی گەیاندن و تێی گەیاندن، سیاسەتمەدارو حوکمڕانی سەرکەوتوو بوون، کە لە نێویاندا هەرچوارخەلیفە ڕاشیدەکانی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (ئەبوبکرو عومەرو عوسمان وعەلی) وەباقی ئەو پیاوە هەڵکەوتووانە بوون، بەڵێ بەڕاستیی دەبێ دانی پێدا بنێین، کە ئێمە کەم وکوڕییمان هەیە، بەڵام وەك گوتم لە تەماشاکردنی هەندێ خەڵکیش بۆ ئێمە، دیسان جۆرێك لە بێ ئینصافیی هەیە، کەسانێك کە دەڵێن: ئەوانە هەر مەبەستیان گەیشتنە کورسی

حوکمڕانییــە، باشــە ئێمــە ئەگــەر مەبەســتمان بــەس کورســی و دەســتەڵات و حوکمە، ئەدی ئەو قوتابخانە شەرعییانەو کاری ڕاگەیانـدن و کـاری بانگـەواز و پــەروەردەکردن و کــارکردن لەســەر مەســەلەی خێــزان و لەســەر مەســەلەی پێگەیاندنی نەوەی نوێ، ئەدی ئەوەمان بۆچی یە؟! بەتەئکید ئـەوە هـەمووی بەرپەرچـی ئـەو جـۆرە بۆچـوونانە دەداتـەوە، کـە بەرامبـەر کـارو پـڕۆژەی ئیسلامی دەکرێن.

ئنجا ئێمـە بـەر لـەوەی بێینـە سـەر بەرنامـەو شـێوازی پێغەمبـەری کۆتـایی موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، پێش ئەویش پێغەمبەرانی دیکە(عليهم الصلاة والســلام)، دەمـەوێ تیشـك بخەمـە سـەرئەوە کـە ئێسـتا لـەنێو لایـەن و تەوژمـە ئیسلامییەکاندا چەند بیرو بۆچوونێك هەن بۆ گۆڕینی واقیع:-

١) یـەکێك لەوانـە: پێیـان وایـە کـە پێویسـتە ئێمـە سـەرگەرمی پاکسازیی و چاکسـازیی بـین لـەڕووی عەقیدەییـەوە، لـەڕووی عیبادەتـەوە، واتـە کـار لەسـەر خۆمـان و دەوروبـەرمان بکـەین، عەقیـدەیان صـاف بکەینـەوەو عیبادەتمان ساغ بکەینەوەو دووری بخەینەوە لە بیدعەت، وە عەقیدەیان پــاك بکەینــەوە لەشــیرك و لــەو بیرۆکانــەی کــە پێچــەوانەی ئیمــان و عەقیدەی ئیسلامیین.

بەڵێ، بیروبۆچوونێکی ئاوا هەیەو دەڵێن: دوای ئەوەی کۆمـەڵگا تەصفیە دەکرێ و لە بێژنـگ دەدرێ و لە ڕووی عەقیدەیی یەوە صاف دەبـێ، خـوا (سبحانه وتعالى) دڵـی دەسـەڵاتداران نـەرم دەکـات کـە حـوکم بەشـەریعەت بکەن، یاخود لایان دەبات!!

دەتوانین بڵێین (شیَخ ناصرالدين الألباني) "ڕەحمەتی خوای لێ بێ"، زۆر کاری لەسەر ئەو بیروبۆچوونە کردوە.

٢) بۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێ: ئێمە پێویستە لە ڕووی فیکریی یـەوە کـار لەسـەر کۆمـەڵگاو دەوروبـەر بکـەین و، چـەمکە فیکرییـەکانی خـەڵك

بگۆڕین، كە دەتوانین بڵێین حیزبی (تحریر) زۆر جەختی لەسەر ئەو بیرۆكەیە كردوە.

٣) بۆچوونێكی دیكەهەیە دەڵێ: پێویستە كارێك بكەین جەماوەر هەمووی ڕاپەڕێ، واتە: شۆڕشێكی جەماوەریی دروست بێ، یانی: دەبێ كار لەسەر خەڵك بكرێ لە ڕووی فیكرەوە، لەڕووی عەقیدەوە، لەڕووی بانگەوازكردن و تێگەیاندنیانەوە، تا ئەو خەڵكە هەستێكی گشتی لەلا دروست دەبێ و ئەو واقیعە ڕەفز دەكات، كە لەگەڵ ئیمان و عەقیدەكەیدا ناگونجێ، وەك ئەوەی كە لە (ئێران) ڕووی دا لە دژی شا.

٤) بیروبۆچوونێكی دیكە هەیە دەڵێ: پێویستە ئێمە كار لەسەر لایەنی سەربازیی بكەین و هەوڵبدەین لایەنی سەربازیی بەدەستەوە بگرین، وە سەرەنجام دوای ئەوەی خەڵك و جەماوەر ئامادەبوون، پەنابەرینە بەر كودەتای سەربازیی، وەك لە سوودان ڕوویدا لەسەر دەستی (حسن الترابي) و هاوەڵانی.

٥) بۆچوونێكی دیكەهەیە دەڵێ: پێویستە چەك و هێز ئامادە بكەین، وە بەچەك و هێز ڕووبەڕوی كۆمەڵگای خۆمان ببینەوە، ئەوانەی كە ناهێڵن حوكم بەشەریعەت بكرێ، پێویستە بە چەك لەدژیان بین، كە هەندێك لەلایەنە ئیسلامییەكان وەك (جماعة الجهاد) و (الجماعة الإسلامية) لە میصر، وە (طالبان) لە ئەفغانستان و ڕێكخراوی (قاعدة) ئەو بیرو بۆچوونەیان هەیە.

٦) بیروبۆچوونێكی دیكە هەیە دەڵێ: پێویستە لەڕێی هەڵبژاردن و چوونە نێو پەرلەمان و بەدەستهێنانی دەنگ و كاری سیاسیی و بەشداریی سیاسییەوە ئەو گۆڕانكارییە بكرێ...

٧) بۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێ: پێویستە تاکی مسوڵمان، پاشان خێزانی مسوڵمان، دوایی کۆمەڵگای مسوڵمان پەروەردە بکەین و لەئەنجامی ئەوەدا دەوڵەتی ئیسلامیی لە دایك دەبێ.

٨) خەڵکی دیکەش هەیە کە مەبەستی ئەوە نیە لەڕووی سیاسیی و حوکمڕانییەوە واقیعەکە بگۆڕێ، وەك کۆمەڵی (تبلیغ) کە هەر مەبەستیان ئەوەیە خەڵك بە گشتی لە دین تێ بگات و شارەزا بێ، بەڵام بەلای کاری سیاسیی و چالاکی سیاسیی دا ناچن.

٩) ئەهلی تەصەووف زیاتر تەرکیز دەخەنە سەر لایەنی ڕووحیی و ئیمانیی و تەزکیەی نەفس و...هتد، بەڵام دەست ناخەنە مەسەلەی سیاسەتەوە.

بەڵام من وای تێدەگەم کە ئێمە بۆ گۆڕینی واقیع بە تایبەتی کە باسی هەرێمی کوردستانی خۆمان دەکەین، چی لێبکەین وچۆنی لێ بکەین، وابین کە کۆمەڵگاکەمان کۆمەڵگایەکی ئیسلامی بێت و خوا لێمان ڕازی بێ و، شەریعەتی خوای پەروەردگار سایەو سێبەرمان بێ، وە هەڵسوکەوتەکانمان: تاکیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و خێزانیی، بەپێی شەریعەت بن، پێم وایە هەر کامێك لەو بیرو بۆچوونانە تام و بۆو مۆرکی واقیعێکی دیاریی کراوی پێوەیە، بۆیە پێم هەڵەیە هیچ کام لەوانە کت ومت بیکەینە ڕێبازو شێوازی کارمان و بەرنامەی گۆڕانکاریی، وە ئێمە دەبێ ئەو حەقیقەتە بزانین کە لە شەریعەتدا دوو شتی سەرەکییمان هەن، ئامانجەکان و ئامرازەکان (المقاصد والوسائل)، دیارە ئامانجەکان هەمیشە چەسپاون، بۆ وێنە لەگۆمەڵگادا دەبێ دادگەریی بچەسپێ، دیارە دادگەریی ئامانج و بەهایەکی نەگۆڕە، دەبێ کار بە ڕاوێژ بێ، ئەوە ئامانج و بەهایەکی نەگۆڕە، دەبێ تەبایی هەبێ و، پێکهاتەکانی کۆمەڵگا یەکدی تەحەممول بکەن و ڕێز لەیەکدی بگرن، وە پێویستە ئازادیی هەبێ، وە پێویستە ڕێزو کەرامەتی ئینسانەکان پارێزراوبێ، وە پێویستە تەنها خوا

بەندایەتیی بۆ بکرێ و کەس نەبێتە بەندە و کۆیلەی کەس، ئەوانە تێکڕا ئامانج و بەهای نەگۆڕن، بەڵام ئایا ئەو ئامانج و بەهایانە چۆن دەچەسپێن؟ دیارە بە ئامڕازو شێوازی جۆراوجۆر، ئامانج و بەهایەکان نەگۆڕن، بەڵام ئامڕاز و شێوازەکان گۆڕاون و جۆراوجۆرن، لەکات و شوێنێکەوە بۆ کات و شوێنێکی دیکە دەگۆڕێن، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: ئامانجە شەرعیی یەکان پێویستە چەسپاو بن، بەڵام ئەو ئامڕازو شێوازانەی کە ئامانجەکانیان پێ دێنینە دی، پێویستە هەمیشە چاویان پێدابگێڕینەوە و گۆڕنکارییان تێدا بکەین، چونکە مەرج نیە ئەو وەسیلەیەی کە بۆ دوێنێ باش بووە بۆ ئەمڕۆ باش بێ، دیارە پێغەمبەریش(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە شێوازەکانی خۆی و ئامڕازەکانی خۆی گۆڕیون.

بۆ هەر جموجۆڵێکی فیکریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، پێویستە ئەو هەلومەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتی یە و ئەو بارودۆخە بابەتییە کە تێیدا سەری هەڵداوە، لەبەرچاوی بگرین، بۆ ئەوەی لەکاتی بڕیار بۆ دەرکردندا تووشی هیچ زوڵمێك نەبین، بۆ وێنە (سید قطب) (رەحمەتی خوای لێ بێ)، بۆچی هەندێك بیروبۆچوونی بۆ دروست بووە، کە هەست دەکەی لە هەندێك ڕووەوە ئەندازەیەك لەشەرع چۆتە دەرێ، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی زۆر گەورە بووە، وە کۆتایی پێهاتنەکەشی، ئەوە دیارە کە لە پێناوی خوادا ئیعدام کراو شەهیدکراوە، تۆ دەبێ تەماشا بکەی (سید قطب) لە چ کۆمەڵگایەکدا بووە، وە چۆن تووشی ستەم لێکران و فشارخرانە سەرو ئازار و ئەشکەنجە بووە، بۆیە تاڕاددەیەك کاردانەوە بەبیرو بۆچوونەکانییەوە دیارە، هەروەها (أبو الأعلی المودودي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە دوای ئەوەی پاکستان لەهندستان جیابۆوە، بەو نیەتە جیابۆوە کە ئەوە مسوڵمانەکانن لە سیخ و هندۆسەکان جیادەبنەوە، وە قەوارەیەکی ئیسلامیی پێکدەهێنن، لەو هەل و مەرجەدا

(مەودوودیی) کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستانی پێکهێنا، کە خوێنڕێژییەکی زۆر روویداوەو مسوڵمانان تووشی گرفتاریی و نارەحەتیی زۆر بوون، وە بەو مەبەستەش جیابوونەتەوە کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی پێك بێنن، (أبو الأعلى المودودي) لێرەدا بەپێویستی دەزانێ تەرکیز بخاتە سەر لێك جیاکردنەوەی مسوڵمان و نامسوڵمان، وە ئەو مسوڵمانانە پێویستە چۆن بژین و ژیانی خۆیان چۆن رێکبخەن؟ وە ئەو دەوڵەت و حکوومەتە کە قەوارەیەکی ئیسلامیی یە دەبێ چۆن بێ؟! واتە هەل و مەرجەکە وای لێ کردوە کە زۆر تەرکیز بخاتە سەر مەسەلەی حاکمییەتی خودا و حوکم کردن بە شەریعەت و لێك جیایی(مفاصلة) لەنێوان مسوڵمان و نامسوڵماناندا، وە جۆرێك لە هەستیاریی زیاد لەپێویستی بەرامبەر نامسوڵمانان و بەرنامەو رێبازەکانی دیکە بۆ دروست بووە، کە هەندێك جار ئەو خاڵە هاوبەشانەی لەنێوان ئیسلام و بەرنامەکانی دیکەدا هەن، ئەو ویستوویەتی خاڵە هاوبەشەکان کاڵ بکاتەوە، بۆ ئەوەی لێك جیایی زیاتر دەربخات.

بەڵام بەپێچەوانەوە جەماعەتی تەبلیغ کە دیارە بەنەفەسێکی دیکەوە اریان کردوە، هەروەها مامۆستا سەعیدی نۆرسیی رەحمەتی خوای لێ بێت، بەهەمان شێوە لەواقیعێکی دیکەدا بووەو، ئەوان جۆری بیرکردنەوەیان وابووە کە بە توندیی تێکنەگیرێن لەگەڵ واقیعەکەیان دا و دژی نەوەستنەوە، بەڵکو بە نەفەسێکی درێژ پارێزگاریی بکەن لەسەر ئەوەی کە بۆیان دەپارێرزێ، (مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی) تەماشای کردوە ناتوانێ بەرگریی لە هەموو ئیسلام بکات، گوتوویەتی با بەرگریی لە ئەصڵەکەی بکەم کە ئیمان و عیبادەت و رەوشتە، با جارێ تاکی مسوڵمان پارێزراو بێ، دوایی کۆمەڵگای ئیسلامیی و دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەو تاکە مسوڵمانانە دەتوانن دروستی بکەن، وەك چۆن ئێستا پارتی دادو گەشەپێدان لە تورکیا لەسەر شانی ئەو تاکانەی کە بەهێزی هەوڵ و تێکۆشانی نۆرسی و قوتابییەکانی و قوتابخانەی نوور کە ئیمانیان

تێیدا پارێزرا، ئێستا تەماشادەکەین، ئەوەتا هەنگاویان ناوەو دەنێن بۆ ئەوەی کە هەموو ژیانی خۆیان وردە وردە نزیك بکەنەوە لە ئیسلام.

بۆیە دەڵێم: ئەگەر بێت و بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەزموونە ئیسلامییەکان، هەلو مەرجی تێدا سەرهەڵدانیان لە بەرچاو نەگرین، تووشی زوڵم دەبین، (بدیع الزمان) مامۆستا مەلا سەعید قسەیەکی جوانی هەیە لەو بارەوە، کە دەڵێ: (ئەگەر من لەسەردەمی شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانی دا بام (الفتح الرباني)یم دەنووسی، ئەگەر ئەویش لەسەردەمی مندا بووایە (رسائل النور)ی دەنووسی!!، مەبەستی پێی ئەوەیە کە زاناو پێشەوایانی ئیسلام کە کاتی خۆی لە هەل و مەرجی دیکەی جیا لەوەی ئێستای ئێمەدا ژیاون، بەپێی هەل و مەرجی خۆیان کاریان کردوە بۆ بووژاندنەوەی ئیسلام و هۆشیارکردنەوەی مسوڵمانان، بۆ وێنە: (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دێ کتێبی (إحياء علوم الدين) دەنووسێ، کە زیاتر تەرکیز دەخاتە سەر لایەنی ڕووحیی و ئیمانیی و ئەخلاقیی و پەروەردە کردنەوەی خەڵك و دوور گرتنی خەڵك لە گوناه و تەزکیەی نەفس و دنیا بەکەمگرتن(زوهد)، بەڵام (سید قطب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە (في ظلال القرآن) دەنووسێ، دەزانێ کە مسوڵمانان پێویستە بەتەنیا بەدینداریی تایبەتیی وازنەهێنن، بەڵکو پێویستە بزانن کە خوا ئەوانی مولزەم کردوە بەوەوە کە شەریعەتی خوا لەژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتییشدا پیادەبکەن، بۆچی؟ چونکە ئەو کۆمەڵگاو هەلومەرجەی ئەو وای خواستوە. ئەوانی دیکەش بەو شێوەیەی خواستوە.

وە جاری واش هەیە شێوازی کار دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بیروبۆچوون، جاری وا هەیە لەیەك کاتداو لە یەك شوێندا، دوو ئیجتیهادی جیاواز هەن، کە ڕەنگە هەندێك جار پەیوەندیی بەشێوەی تێگەیشتنی ئەو ئینسانەوە هەبێ لەدین، یان پەیوەندی هەبێ بەشێوەی میزاج و سروشتی ئەو کەسەوە، هەیە

بەسروشت نەرمەو، کەیفی بە تێک گیران نایەت، وە هەیە حاڵەتێکی شۆڕشگێڕانەو گۆڕانکاریی ڕیشەیی یانەی هەیە. کەواتە: هەم هەلومەرجەکان و، هەم شێوەکانی تێگەیشتن لەدین و، هەم شێوەی پەروەردەو باری دەروونی ئەو کەسانەی کە ئەو تەوژمە ئیسلامیی یانەیان بەڕێ خستوە، هەموویان کاریگەرییان هەیە لەسەر جۆراوجۆر بوونی بیروبۆچوونەکان.

لەکۆتاییدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم کە پێویستە بۆهەڵسەنگاندنی هەموو ئەو بیروبۆچوونانە بگەڕێینەوە بۆ ئەوە کەپێغەمبەران(صەلات وسەلامی خوایان لێ بێ) بەگشتی وە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەتایبەتی چی کردوەو چۆنی کردوە، بەمەبەستی پاکسازیی و چاکسازیی کۆمەڵگا؟! ئەوە بەڕاستی تەرازوویەك دەبێ هەموو ئەو بیروبۆچوون و ڕێباز و شێوازانەی کە باسکران، پێیهەڵدەسەنگێنین، ئێستاش چی بەڕاست و دروست دەزانم لەوبارەوە بەکورتیی دەیخەمەڕوو:

ئێمە هەموو ئەو شێوازو ئامرازانەی کە قورئان وسوننەت دەلالەتیان لەسەر دەکەن، پێویستە بەچاوی ڕێزەوە تەماشایان بکەین، وە بە شەرعیی یان دابنێین، واتە: کاتێك کەسانێك دەبینین مەشرەب صۆفیین، ئەوی دیکە مەشرەب سەلەفییە، ئەوی دیکە لەڕووی فیکرییەوە کاردەکا، ئەوی دیکە لەڕووی پەروەردەوە، یەکێك لەڕووی بانگەوازەوە، یەکێك لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاردەکات، پێویستە ئەوانە هەموویان بگێڕینەوە بۆ تەرازووی قورئان و سوننەت:

١) لەڕووی ئیمانەوە: ئایا لە قورئان وسوننەت دا لایەنی ئیمانیی و ڕووحیی جەختی لەسەر نەکراوە؟ هەموو دواندنەکان(خطابات)ی قورئان بۆ مسوڵمانان، بە: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ....) دەست پێدەکەن، کەواتە: بناغە ئیمانە، بۆیە کەسێك کە لە ڕووی ئیمانییەوە کار دەکات، پێویستە

ڕێزلە کارەکەی بنێین.

٢) لەڕووی عیبادەت و تەقواو تەزکیەی نەفسەوە: یەکێك لە وەزیفە سەرەکییەکانی پێغەمبەر (صَلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَلّمَ) ئەوەیە بریتییە لە: تەزکیەی نەفس و پەیدا بوونی تەقوا (وَيُزَكِّيهِمْ ...)، یان وەك ئەهلی تەصەووف دەڵێن: بژارکران لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، ڕازێنراوە بەسیفەتە بەرز و پەسەندەکان.

٣) لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە: تەماشا دەکەی لە قورئان دا زۆر باسی ڕێزگرتن لە باب و دایك و صیلەی ڕەحم وحەقی دراوسێ ومیوان و بەزەیی هاتنەوە بەهەژارو هەتیوو لێقوماو و بێ دەرەتان و ...هتد. دا کراوە، کەواتە ئەو لایەنەش دیسان بەشێکی بنەڕەتییە لەئیسلامدا .

٤) لە ڕووی فیکرییەوە: تەماشا دەکەین پێغەمبەر (صَلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَلّمَ) کاتێك ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ کۆمەڵگاکەیدا کاری سەرەکیی ئەوەیە کە چەمکەکان بگۆڕێ و فیکری خەڵك ڕاست بکاتەوە، وەك خوای زاناو توانا لەبارەی یەکەمین ئەرکی سەرشانییەوە لە چوار ئەرکەکان فەرموویەتی: (يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴿١٦٤﴾)ال عمران

٥) لەڕووی جەنگ و جیهادەوە: لەکاتێکدا زوڵم لە میللەتەکەت دەکرێ و بەهێز ڕێت لێ دەگیرێ و، بەچەك لەدژت دەوەستن، دیارە تۆ وەختێ دیفاع لەدین و ژینت دەکەی، ئەویش بەهەمان شێوە ئەرکێکی شەرعییت ئەنجامداوە، وەك خوا فەرموویەتی: (وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ... ﴿١٩٠﴾)البقرة، واتە: وە لەڕێی خوادا لەدژی ئەوانە بجەنگن کە لەدژتان دەجەنگن.. کەواتە: ئەگەر بەرگریی لە دین و ژینی خۆت بکەی، دوای ئەوەی دەگەیە بن بەست و، هیچت بۆ ناهێڵرێتەوە، دیسان

خوای پەروەردگار حەقی بە تۆ داوە: (فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ...﴿١٩٤﴾ )البقرة، واتە: وە هەرکەس دەستدرێژیی کردنە سەر، وەك دەستدرێژیی خۆیان دەستدرێژییان بکەنەوە سەرو بەرپەرچیان بدەنەوە..

کەواتە با هەمووکەس بزانێ کە ئێمە هەستیارییمان بەرانبەر بە هیچ کام لەو شێوە کارو جم وجۆڵانەی کە لەساحەکەدا هەن نیە، بەڵام ئەوەی بەڕاستی دەزانین ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت و، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چۆنیان کردووە، لەکوێ وە دەستیان پێکردووە، چۆن لەگەڵ کۆمەڵگای خۆیاندا مامەڵەیان کردوە، دەبێ ئەوە بکرێتە تەرازوو و سەرمەشق، کە ئەویش ئەگەر بمانەوێ بەکورتیی باسی بکەین، ئەوەیە کە:

١- پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کاتێك پەنایان نەبردۆتە بەر توندوتیژیی و بەکارهێنانی هێز و چەك بۆ گۆڕینی کۆمەڵگاو دەوروبەر، بەڵکو هەمیشە لە فیکر و وشەوە دەستیان پێکردووە، لە بانگکردنی خەڵك و تێگەیاندنیانەوە دەستیان پێکردوە.

٢- نەچوون تەنیا خەریکی لایەنێك بن، بۆ وێنە: هەر خەریکی لایەنی فیکریی بن، یان تەنیا خەریکی لایەنی عەقیدەیی بن، یان بەس خەریکی لایەنی عیبادەت بن، یان تەنیا خەریکی لایەنی ئەخلاقیی، یان کۆمەڵایەتیی، یان ئابووریی، یان سیاسیی بن، بەڵکو ئەگەر تەماشای پەیام و دواندن(خطاب)ی پێغەمبەران بکەین (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ گەلەکانی خۆیان دا، دەبینین پەیام و دواندن(خطاب)ەکەیان گشتگیر(شمولي) بووە بۆ تێکڕای پێکهاتەکانی ئینسان و سەرجەم لایەنەکانی ژیان.

٣- ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە هاندەری دڵسۆزیی و، بەزەیی و پەرۆش کاریان کردوەو، بە گیانی مەدارکردن لەگەڵ خەڵك و تەحەممول کردنی ناخۆشیی و ئازارەکانیان، هەوڵیان داوە کۆمەڵگا بگۆڕن.

ئنجا لە کۆتایی ئەم باسەدا بەپێویستی دەزانم بۆچوونێکی هەڵە ڕاست بکەمەوە:

هەندێك وا دەزانن کە ئێمە گوتمان نابێ هێز و چەك بە کاربێنی، مانای وایە کە تۆ سەلامەت دەبی، بەڵام بێگومان وانیە، ئایا لە قۆناغی مەککەدا مسوڵمانان شەهید نەبوون، ئازار و ئەشکەنجە نەدران؟! با، بۆیە ئێستاش ئەگەر بانگەوازو تێگەیاندنی خەڵك و بەرچاوڕوون کردنەوە و هۆشیارکردنەوەیان حەقی خۆی بدەیە، باجی لەسەر دەدەی، دەگیرێی، دەکوژرێی، ئازار و ئەشکەنجە دەدرێی، نانبڕاو دەکرێی، بە مەرجێك حەقی خۆی پێبدەی، وەك چۆن کاتی خۆی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەککە جارێ نەچوبووە قۆناغی شەڕ و کوشتارەوە، کە هاوەڵانی بەرێزیشی لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید دەکران و ئازار دەدران، خۆیشی ئازار دەدرا، ئێمەش ئەگەر بەهەمان شێوە حەقی خۆی بدەینە ئەو بانگەواز و تێگەیاندن و پێگەیاندنەی خەڵك، کە پێویستە قۆناغی یەکەم هەر ئەوەبێ و، بە پێچەوانەوە نیشانەیەکی پرسیاری گەورە لەسەر ئەو کارو پرۆژە ئیسلامییە پەیدا دەبێ، دەبێ چاوەڕوانیی و ئامادەیی ئازارو ئەشکەنجەو باجدانیشمان هەبێ.

بڕگەی یەکەم: بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ گۆڕین و پاکسازیی و چاکسازیی کردن:

سەرەتا بەو ئایەتە موبارەکە دەست پێ دەکەم، کە خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویّ: ﴿ رُسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾النساء، ئەم ئایەتە موبارەکە دوای ئەوە دێ کە ژمارەیەك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناو دەبرێن هەر لە(نووحەوە هەتا داوودو سولەیمان)، وەپاشان دەفەرموێ: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، تاکو خەڵك دوای هاتنی پێغەمبەران بەڵگەی لە سەر خوا نەبێت، کەواتە: بەبێ ڕەوانە کردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خەڵك بەڵگەو بیانوی دەبێ لەسەر خوا، کە بڵێ: خوایە! من نەمزانی تۆ بەچی ڕازی دەبی، نەمزانی چۆن بژیم، نەمزانی چ ڕێبازێك بگرمە بەر!! بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوە کە دڵخۆشکەری خەڵك بن، ئەوانەی کە ڕێگای خوا دەگرن، وە ترسێنەریان بن لەوەی کە لایدەن، وە بۆ ئەوە کە بەڵگەی خوا لە سەر خەڵك تەواو بکەن، خەڵك بیانوو بڕاو بکەن و هیچ کەس بەڵگەو بیانوویەکی بەدەستەوە نەبێ، بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پەیام وبەرنامەی خوایان هێناوە بۆ خەڵك، بۆ بەختەوەر کردنیان، لە ئەنجامی ئەوەدا کە فێریان دەکەن وە تێیان دەگەیەنن، کە تاك تاکیان لە خودی خۆیدا چۆن بژین، چۆن خێزان پێکەوە بنێین؟ هەموویان چۆن کۆمەڵگا دروست بکەن و چۆن پێکەوە ڕەفتارو مامەڵە بکەن؟

خوا لەسوورەتی (الأنعام)دا دوای ئەوەی ناوی (١٨) لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دێنێ، خیتاب لەگەڵ پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ ...﴿٩٠﴾ ﴾ واتە:

ئەوانە کەسانێکن کە خوا ڕێنمایی کردوون و خستوونیە سەر ڕێگای ڕاست، تۆش بە دوای ڕێی ڕاستی ئەوان بکەوە. جا ئەگەر پێغەمبەری خاتەم (محمد المصطفى) (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مولزەم بێ بەوەی بە دوای پێغەمبەران بکەوێ، ئێمەی شوێنکەوتووانی موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەپێشترین بۆ ئەوە کەچاو لە پێغەمبەرانی پێشوو بکەین، وە ڕێبازو شێوازی ئەوان ڕەچاو بکەین، لە کاتێکدا کە لەگەڵ کۆمەڵگاکەماندا ڕووبەڕوو دەبینەوە، بۆ ئەوەی بیگۆڕین، پاکی بکەینەوەو چاکی بکەین.

جا من کە سەرنجی ژیانی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزانەم داوە (عليهم الصلاة والسلام)حەوت خاڵم کەوتوونە بەرچاو، کە پێم وایە ئەو خاڵانە ڕێبازو شێوازی پێغەمبەرانیان تێدا بەرجەستە دەبێت:

خاڵی یەکەم// ئەوەیە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بەبێ هەڵاواردن هەموویان لە ئیمان و تەوحیدەوە دەستیان پێکردوە، واتە یەك پێغەمبەریشت دەست ناکەوێ کە یەکەمین قسەی لەگەڵ گەلەکەیدا ئەوە نەبووبێ، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و تەنها خوا بپەرستن، بۆ وێنە:

١- ئەگەر تەماشای سوورەتی (الأعراف) بکەین، ئایەتەکانی ژمارە(٥٩، ٦٥، ٧٣، ٨٥) هەرکام لە (نووح و هود وصالح وشوعەیب) (عليهم الصلاة والسلام) یەك ڕستە دەفەرموون، وەك یەك: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ واتە: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە.

٢- لە سوورەتی (الشعراء)دا ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی: (١٠٥ تا ١٩١) بکەین، پێنج لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە (نووح و هوود و صالح و لووط و شوعیب)ن، ئەوانیش هەموویان یەك ڕستە دووبارە دەکەنەوە،

ﮋأَلَا تَتَّقُونَ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﮊ. واتە: ئایا پارێز (لەخوا) ناکەن؟ من بۆ ئێوە ڕەوانە کراوێکی ئەمیندارم، پارێز لەخوا بکەن وفەرمانبەریی من بکەن، وە من هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێداوا ناکەم، بەڵکو پاداشتی من لە سەر پەروەرگاری جیهانییانە.

بەڵێ، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان لە خوا بەیەك گرتنەوە، لە خوا بە خەڵکی ناساندنەوە، لە خەڵك پەیوەست کردن بەخواوە (سبحانه وتعالى) وەك تاکە بەدیهێنەرو، تاکە پەروەردگارو، تاکە پەرستراو و، تاکە بەرنامەدانەرو، دیاریی کەری حەڵاڵ وحەڕام و، تاکە هەمە کارەی کەون وکائیناتەوە، دەستیان بە گۆڕین و چاککردن کۆمەڵگاکانیان کردوە.

٣- با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەین لە سوورەتی (الأنبياء)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﮋوَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ﮊالأنبياء، دیارە لێرەدا خوا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەدوێنێت و دەفەرموێ: وە لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە، کەتەنیا من پەرستراوم و تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، بەڵێ، خوا بەیەکگرتن (التوحيد) بە خاڵی دەستپێك دانان، ئەرکی سەرەکی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بووە، بەڵام ئایا ئێمەش وەك شوێن کەوتووانی پێغەمبەران، کە ئێستا لەم کۆمەڵگایەداین، یان لە چەند کۆمەڵگایەکداین، کە کەم و زۆر خەڵکەکەیان مسوڵمانە و خوا دەپەرستێ، ئایا ئێمەش مولزەمین لەوێوە

دەست پێبکەین؟ دەڵێم: بەڵێ، بۆچی؟ چونکە مەسەلە ئەوە نیە کەخەڵکەکە تەنیا دارو بەرد بپەرستێ، چونکە لادانی خەڵك لەپەرستنی خوادا، تەنیا لەڕووی درووشمەکانەوە نیە، تاکو ئەگەر خەڵك نوێژی بۆ خوا کردو، ڕۆژووی بۆ گرت و، نەزرو قوربانی تەنیا بۆ خوا بوو، بڵێی: تەنیا بەوەندە ئەو خەڵکە خوا پەرستە، بەڵکو جاری وا هەیە لەوەرگرتنی چەمکەکان، لە وەرگرتنی بەهاکان، لە وەرگرتنی بووناسیی و دیدو بۆچوونەکانەوە، خەڵك تووشی شیرك دەبێ، واتە: فەرهەنگ و کلتوورێك حاکم دەبێ بە سەر ئەو خەڵکەدا، پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا ناردوویەتی، ئەوە یەکەم، دووەم: جاری وا هەیە لە ڕووی بەرنامەکانی ژیان (شرائع الحیاة)ەوە، خەڵك تووشی شیرك دەبێ، لەڕووی سیستمی ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، سیاسییەوە، لە شەریعەتی خوا دوور دەکەوێتەوە. واتە: پێمان وا نەبێ کە بەندایەتیی بۆ خوا تەنها بریتیە لە شتێکی شەخصیی، کە ئێستا ئەوە دەردی کوشندەی مسوڵمانانە، بەڵێ، پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) بەڕاستی بۆ ئەوە هاتوون کە خەڵك هەم واز لە قەبرپەرستیی بێنن، هەم قەصر پەرستیی، چونکە جاری واهەیە، تا خاوەن قەبرێك چوار خەڵکی نەفام گومڕا دەکات و تووشی شیرکیان دەکات، خاوەن قەصرێك بە ملیۆنان خەڵك گومڕا دەکات، هەربۆیەش خوا(سبحانه وتعالی) دەفەرموێ: (أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ...﴿٣٦﴾) النحل، (فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ )البقرة/٢٥٦، دەبێت کوفر بەتاغووت بکرێ، ئنجا ئیمان بە خوا دەهێنرێ، کەواتە: ئێستاش بۆ ئەوەی خەڵك ژیانی سیاسیی، ئابوریی، کۆمەڵایەتیی، فەرهەنگیی، بەپێی شەریعەت ڕێك بخرێ، دەبێ ئەو خەڵکە پەیوەست بکرێتەوە بە

خوا بە یەکگرتنەوەو، بەئیمان و عەقیدەوە، دیارە حاکمیەتی شەریعەتی خوای پەروەردگار(سبحانه وتعالى)یش لە ئەصڵدا لە ئیمان وعەقیدەو خوابەیەکگرتنەوە سەرچاوە دەگرێ، لەبەر ئەوەی تەنیا خوا پەرستراوە، دەبێ هەر ئەویش حاکم بێ، هەڵبەتە حاکم بەمانای حوکمڕان نا، بەڵکو حاکم بەمانای دانەری حەڵاڵ و حەڕام و، دیاریکەری چاکەو خراپە. بەڵێ، ئەگەر گریمان خەڵك لەڕووی خواپەرستیی شەخصییشەوە تووشی لادان و شیرك نەبێ و، لە ڕووەکانی دیکەوە تووشی لادان و هەڵەو پەڵە ببێ، ئایا بە کوێ ڕاست دەکرێتەوە؟، دیارە هەر دەبێ لە سەرچاوەوە ڕاست بکرێتەوە، وەك دەڵێ: ئاو ئەگەر لە سەرچاوەوە لێڵ بوو، لە جۆگاوە ڕوون نابێتەوە! بەڵێ، دەبێ هەر لە ئیمان و عەقیدەو تەوحیدەوە ڕاست بکرێتەوە .

خاڵی دووەم// هەرکامێکیان پاش ڕاگەیاندنی ئیمان و خوا بەیەکگرتن، وەبە گوێی خەڵك دا دانی ئەو بانگەوازو ئەو پەیامە کەتەنیا خوا پەرستراوە، تەنیا خوا پەروەردگارە، دەبێ تەنیا خوا یاسادانەربێ، دوای ئەوە هەرکامێکیان بە پێی هەلومەرجی کۆمەڵگایەکەی خۆی نەخۆشی وگرفتەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی دەستنیشان کردوون و پەنجەی خستۆتە سەریان، واتە پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) نەهاتوون، وەك ئێستا هەندێك تەوژم ولایەنی ئیسلامیی تەنیا خەریکی ئیمان و عەقیدە بن تا قیامەت، یان تەنیا خەریکی لایەنی تەزکیە بن، نا، خەریکی ئیمان وعەقیدە بوون، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەوە چەسپیوە، خەریکی موستەلزەماتی ئەو ئیمانو عەقیدەیەش بوون، جا ئایا ئەو ئیمان و عەقیدەیە چی دەخوازێ؟ ئەو ئیمان وعەقیدەیە ئەوە دەخوازێ کە مادام تەنیا خوا پەروەردگارەو، تەنیا خوا پەرستراوەو، تەنیا دەبێ

ڕووبکرێتە خوا، بەندایەتیی بۆ وی بکرێ، دەبێ تەنیا شەریعەتی خواش پەیڕەویی لێ بکرێ.

با بۆ وێنە تەماشای چەند ئایەتێك بکەین:

١- هود (علیه السلام) کە بۆ گەلی (عاد) نێردراوە، لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی(١٢٨ تا ١٣١)دا ئاوا گەلەکەی خۆی دەدوێنێ: ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ ﴾ واتە: ئایا ئێوە لە هەر بەرزاییەك قەڵایەك دروست دەکەن، وە شوێنی وا و بینای وا دروست دەکەن، کە بەهۆیەوە ناوونیشانی خۆتان بهێڵنەوە، بە فیزو کەشخە، وە هەرکاتێ زوڵمتان کرد، زۆر بە قورسیی و ستەمکارانە خەڵك سزا دەدەن.

تەماشادەکەین (هود) (علیه السلام) پەنجە دەخاتە سەر گرنگترین نەخۆشیی میللەتەکەی، ئەویش ئەوەیە کە کەمینەیەك تووشی ئیسرافو خۆشگوزەرانیی بوون، لەسەر حسابی زۆرینەی خەڵكو کۆشكو تەلاری وەها دروست دەکەن کە پێویستییان پێی نیە، خەڵکەکەیان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو قەهرو جەوریان بە سەردا دەکەن.

٢- هەروەها صالح (علیەالسلام) کە بۆگەلی (ثمود) نێردراوە، لە سووڕەتی (الشعرا ) دا لەئایەتی (١٤٦ تا ١٥٢)دا هاتوە کە بە گەلەکەی دەفەرموێ:

{ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ }الشعراء،

ئەویش بە هەمان شێوە دەست دەخاتە سەر چەند نەخۆشیی یەك كە گەلەكەی پێیانەوە گرفتار بووەو دەفەرموێ: (ئایا پێتان وایە هەروا بە هێمنیی لەو خانوو و كۆشكانەدا وازتان لێ دەهێنرێ و دەمێننەوە لە نێو چەندان باخ و كانی و سەرچاوەدا، وە لەنێو چەندان بێستان و درەختی خورمادا، كە بەرەكەی زۆر چاك گەیشتوە و هەروا بە لێوا دەخورێ، وە لە چیاو چۆڵ دا خانوو و كۆشك زۆر بە خۆشگوزەرانانە بینا دەكەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ ﴾ پارێز لەخوا بكەن وبە قسەی من بكەن، واتە: دەست لەو زوڵم و ستەم و چینایەتیی و قرپیی و پرپیی یە هەڵبگرن، ئەوەی كە ئێستاش دەردی كوشندەی سەرجەم كۆمەڵگایەكانی ئەم ڕۆژگارەیە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، وە بەقسەی زێدەڕۆیان مەكەن، ئەوانەی كە خراپە دەكەن لە زەوی دا و چاكسازیی ناكەن، واتە: بە قسەی من بكەن كە دەمەوێ بتانگێڕمەوە بۆ خەتی نێوەڕاست و، بتانگێڕمەوە بۆ دادگەریی و تەبایی، وە چی دیكە بە قسەی ئەوانە مەكەن، كە زیادە ڕۆیی دەكەن، چونكە هەموو ئەو كۆمەڵگایانەی كە زێدەڕۆییان تێدا پەیدا دەبێ، بە تەئكید لە سەر حیسابی زۆینەی خەڵكەو ئەو كۆمەڵگایانە تەمەنیان كورتە.

بەڵێ ئیسلام تەنیا بریتی نیە لە تیۆریی(نظریة)یەك، پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەو ئیمان و تەوحیدەی ڕایان گەیاندوە، دوایی داوایان لە خەڵكەكە كردوە، كە بەو ئیمان و تەوحیدە ژیانی خۆیا اكسازیی و چاكسازیی بكەن و ڕێكی بخەن.

٣- (لوط)یش (عليه الصلاة والسلام) بە شێوەیەكی دیكە دەست دەخاتە سەر جۆرێكی دیكە لە لادان، كە بریتییە لە نەخۆشیی نێربازیی، وەك

دەفەرمویٚ: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾﴾الشعراء، ١٦٥-١٦٦. واتە: ئایا ئێوە لەگەڵ پیاوان جووت دەبن، کە لەنێو هەموو خەڵکی جیهاندا ئەو عادەتە خراپەتان داهێناوە، پیاوتان لەگەڵ پیاو جووت دەبێ، وە ئەوەی کە خوا بۆی دروست کردوون لە هاوسەرانتان وازی لێ دێنن، بەڵکو ئێوە گەلێکی سەرە ڕۆییکەرو یاخیین.

٤- شوعەیب (علیه السلام)یش کە بۆ (أصحاب الأیکة) و بۆ(مدین) نێردراو ئەو لە ڕوویەکی دیکەوە گەلەکەی ئامۆژگاریی دەکات و جۆرە نەخۆشی یەکی دیکەیان لەنێودا باوە، کەدەبێ چارەسەربکرێ، کە بریتی یە لە مەسەلەی تەرازووبازیی و لادان لەڕووی ئابووریی یەوە کە دەفەرموێ: ﴿أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾﴾ الشعراء. واتە: پێوانە تەواو بکەن، کەسێك شتی بۆ دەپێون بەتەواویی بۆی بپێون، وە زیانیان لێ مەدەن، وە کە شت و مەك بۆ خەڵك دەکێشن بە تەرازوویەکی ڕاست بۆیان بکێشن، نەك تەرازوویەکی لاسەنگ، وە شتی خەڵك بەکەم مەگرن، واتە: شتی خۆتان پێ زۆر نەبێ و شتی خەڵکتان پێ کەم بێت، وە لە زەویدا خراپەکاریی مەکەن.

ئەوەی کە مەبەستمە لێرەدا ئەوەیە کە هەرکام لە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) لەئیمان و تەوحیدەوە دەستیان پێ کردوە، چونکە ئەوە بناغەو ئەصڵە، بەڵام دوایی هەرکامیان تەماشای واقیعی کۆمەڵگاکەی کردوەو چ گرفتێکیان بووبێ و چ نەخۆشییەکیان بووبێ، چ شتێك زیاتر فزەی لێ بڕیبن و ناڕەحەتی کردبن، ویستوویەتی ئەوە چارەسەر بکات،

بەڵام هەمووشی پەیوەست کردوە بە چییەوە؟ چارەسەری کێشە ئابوورییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و ئەخلاقییەکان و سیاسییەکان پەیوەست بوونەوە بەچییەوە؟ بە ئیمان و تەوحیدەوە، واتە: ئەو خوایەی کە تەنیا ئەو پەروەردگار و پەرستراوە، پێتان دەڵێ: تەرازووبازیی مەکەن، ئەو پێتان دەڵێ: ڕێگریی مەکەن، ئەو پێتان دەڵێ: نێربازیی مەکەن، ئەو پێتان دەڵێ: زێدەڕۆیی مەکەن لەسەر حسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت.

خاڵی سێ یەم// بنەمایەکی دیکە کە لە شێواز و ڕێبازی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)دا بۆ چاکسازیی و پاکسازیی کۆمەڵگا ڕەچاو کراوە، ئەوەیە کە هەمیشە خۆبەزلگرو خۆشگوزەرانەکان دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران بوون(علیهم الصلاة والسلام) وە ڕەش و ڕووت و بەشخوراوەکان شوێنکەوتووی پێغەمبەران و هەڵگری پەیامی پێغەمبەران بوون، ئەوەش خاڵێکی زۆر گرنگە کە ئێمە بزانین هەمیشە بەرنامەی خوای پەروەردگار بەرگریی لە مەزلووم و بەشخوراو و ماف پێشێلکراوان دەکات، هەروەها بەرنامەی خوا هەمیشە دژی کەسێکە چاوی لەزوڵم و چەوساندەوەیەو چاوی لە خۆ سەپاندنە، هەندێ کەس وا دەزانێ دینی خوا(سبحانه وتعالى) تەنها فەرمان بە نوێژ و ڕۆژوو ئەرکە تایبەتییەکان دەکات!، بەڵێ ڕاستە ئیسلام خەڵك فێری نوێژ و ڕۆژوو دەکات و دەڵێ وەك تاك خوا بپەرستن، بەڵام هەقیشی بەسەر ئەوەوە هەیە: کێ حوکم دەکا و کێ زوڵمی لێ دەکرێ و کێ زوڵم دەکا!!
با سەرنج بدەین:

١- نووح (علیه السلام) کە یەکەم پێغەمبەری خاوەن ئوممەتەو، پێی گوتراوە: (أبو البشر الثاني) واتە: دووەمین بابی بەشەرییەت، لەگەڵ

گەلەکەیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، خوای بێ هاوتا ئاوا بەشێکی قسەکانیمان بـــۆ دەگێڕێتـــەوە: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾﴾ هـــود. دوای ئـــەوەی نـــووح پـەیامی خـۆی بەگەلەکـەی ڕادەگـەیێنێ، خـوا دەفـەرموێ: زلەزلـە بـێ بڕوایـەکانی گەلەکـەی گوتیـان: ئێمـە نـابینین شوێنی تـۆ کـەوتبێ جگـە لەوانەی کە خەڵکی سادەو هەرچی و پەرچیین لەنێو ئێمەدا، واتە: ڕەش و ڕووت و بـێ دەرامەتـەکان، ئەوانـەی کـە سـادەو کـەم فـامن، واتـە کـەم دەفامن، ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ﴾ وە ئێمە هیچ چاکەیەکی ئێوە بەسـەر خۆمانـەوە نـابینین .﴿بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ﴾ بـەڵکو پێمـان وایـە درۆزنـــن. کەواتـــە: کـــێ دژی نـــووح بـــووە؟ ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ وشەی (**مَلَأ**) واتە: ئەوانەی کەچاوی خەڵك پڕ دەکەن لە سام و هەیبەت، واتە:خۆ بەزل گرەکان.

٢- هـەروەها صالح(علیـه الصـلاة والسـلام)کـە بـۆلای (ثمـود) نێـردراوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾﴾الاعـــراف. واتــە: خـاوەن دەسـەڵاتە خۆبـەزلگرەکانی گەلەکـەی بەوانـەیان گـوت کـە چەوسـێنرابوونەوە لـە ئیمانـداران: ئایـا پێتان وایە (صالح) لە لایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانە کراوە؟ کەواتـە: کـێ دژی صـاڵحە؟ خۆبـەزل گرەکـان، وە کـێ لەگـەڵ صـاڵحە؟ ئیمانـداره چەوسێنراوە ن.

٣- هەروەها بەهەمان شێوە(شوعیب)(علیه السلام) کە بۆلای مەدیەن و (أصحاب الأیكة) نێردراوە، خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾﴾ الاعراف. خۆ بەزل گرەکانی گەلەکەی گوتیان: ئەی (شوعەیب) خۆت و ئەوانەی ئیمانیان پێت هێناوە لە وڵاتی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازی ئێمە.

خوا (عز وجلّ)، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە

٤- سووڕەتی(ابراهیم)دا بە گشتی هەموویان دێنێ وە نەیارەکانیشیان هەموو دێنێ و وتووێژ و دیالۆگیان لە بەیندا دەبێ، لە کۆتایی دا کافرەکان بە پێغەمبەران دەڵێن: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾﴾إبراهيم، ئەوانەی بێ بڕوابوون بە پێغەمبەرانی خۆیانیان گوت: لەسەر زەمینی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر دینی ئێمە. جا ئایا کێ دەتوانێ کێ دەربکا؟ بێگومان دەسەڵاتدار دەتوانێ بێدەسەڵات دەربکا، کەواتە: دیارە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) و ئەوانەی لەگەڵێشیاندا بوون، بێ دەسەڵات بوون، وە دوژمنەکانیشیان دەسەڵاتدار بوون، وە لەشوێنەکانی دیکەدا دەردەکەوێ، کە دەسەڵاتدارە خۆشگوزەرانەکان بوون.

کەواتە: ئەوەش بەڕاستی خاڵێکی زۆر گرنگە کە ئێمە بزانین پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)، خۆبەزل گرو خۆشگوزەران و

خۆسەپێنەرەکان ناحەزیان بوون، وە چەوسێنراوەو ماف پێشێل کراوەکان شوێن کەوتوویان بوون.

لێرەدا مەبەستمان لەخستنە ڕووی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە ئێمەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) دەبێ زیاتر دڵمان بەخەڵکی سادەو ڕەش و ڕووت خۆش بێ، کە هەمیشە زۆرینەی خەڵك پێك دێنن، هەڵبەتە ئێمە دژی دەوڵەمەندییش نین، وە دژی دەوڵەمەندان و دەسەڵاتدارانیش نین، ئەگەر ئەهلی زوڵم نەبن و ئەهلی زێدەڕۆیی(اسراف) نەبن و، لەسەر حیسابی خەڵك دەوڵەمەند نەبووبن، وە بە ستەم کردن لە خەڵك نەچووبنەسەر کورسی.

هەروەها پێغەمبەرانیش(علیهم الصلاة والسلام) وە نەبێ هەستیارییان هەبووبێ بە ماڵ و سامان و دەستەڵات، نا، بەڵکو هەستیارییان هەبووە بەماڵ و سامانێك، یان بە دەستەڵات و حوکمڕانییەك، کە بە ناحەق وەدەست هێنرابێ.

خاڵی چوارەم// هەمیشە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جەختیان کردۆتەوە لەسەر پێکەوە ژیان ، یەکدی تەحەممول کردن و دەربڕین و بیرو ڕای بەرانبەرو قبووڵ کردنی، بۆ وێنە: ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی(٨٧و٨٨)ی سووڕەتی (الأعراف) بکەین، کەخوا (سبحانه وتعالى) باسی هەڵوێستی (شوعەیب) دەکا لەگەڵ گەلەکەی دا، وە باسی نەیارەکانی ئەویش دەکا لەبەرانبەر قسەکەی (شوعەیب) دا، دەفەرموێ:

﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، چەند مەنتیقێکی جوانە! هەر لە پێغەمبەران دەوەشێتەوە! واتە: ئەگەر هات و کۆمەڵێك لە ئێوە بڕوایان هێنا بەو (پەیام و بەرنامەی خوایی)ە کە پێی

ڕەوانەکراوم، وە کۆمەڵێکیش بڕوایان نەهێنا، با صەبر لەسەر یەکدی بگرین و یەکدی تەحەممول بکەین، هەتا خوا حوکم دەکا لە بەینماندا، واتە: لایەکیان بۆ لایەکیان دەسەلمێنن، واتە: دەبێ یەکدی تەحەممول بکەین و پێکەوە هەڵکەین، نەك سەنگەر لەیەکدی بگرین.

بەڵام با بزانین نەیارەکانیان چی دەڵێن: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾﴾الأعراف، واتە: دەسەڵاتدارە خۆبەزلگرەکانی گەلەکەی گوتیان، ئەی (شوعەیب) خۆت و ئەوانەی کە بڕوایان پێت هێناوە لە سەرزەمینی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر دین و بەرنامەکەی ئێمە، ئەو(شوعەیب)یش دەڵێ: ئایا ئەگەر پێشمان ناخۆش بێ و قبووڵیشمان نەبێ و عەقڵیشمان ڕەفزی بکا و دڵیشمان نەی حووبێنێ، هەر دەبێ بەقسەتان بکەین؟!

کەواتە: پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) هاتوون خەڵك ئازاد بێ، وە هیچ بیروبڕوایەك لەسەر هیچ کەسێك فەرز نەکرێ، کە نایەوێ، کەچی ئێستا بە پێچەوانەی ئەوەوە، وا باوەو ئێستا خەڵك وا تەصەور دەکا، بەتایبەت خەڵکێك کە لە ئیسلام نەشارەزایە، یاخود خەڵکێك کە خۆی گێل دەکا، کەئەوە تەوژمی ئیسلامیی و خەڵکی ئیسلامیی یە، بڕوایان بە پێکەوە ژیان و یەکدی تەحەممول کردن نیە!! بەڵام تەماشا دەکەی بە پێچەوانەوە، پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) کە بانگ دەکەن: با صەبر لە سەر یەکدی بگرین، یەکدی تەحەممول بکەین، هەڵبەتە من دەزانم کەسانێك هەن کە بە ناوی ئیسلامەوە لە نێو تەوژمی ئیسلامیی دا لە ڕێبازی پێغەمبەران لایانداوە، وە ئێمەش بۆیە ئێستا باسی ڕێبازی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) دەکەین، تاکو هەر لادان و ترازانێك لە

شێوازی کاری ئیسلامیی دا هەبێ، بەپێی ئەو تەرازووەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ڕاست بکرێتەوە.

خاڵی پێنجەم// پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەمیشە دەستپێشخەری وتووێژ و بەڵگە هێنانەوە بوون و، ناحەزانیان هەمیشە شێوازی هەڕەشەو گوڕەشەیان بەکارهێناوە، ئەوەش لە هەموو قورئاندا دیارە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (ابراهیم)دا باسی هەموو پێغەمبەران دەکا (علیهم الصلاة والسلام) و دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ ۚ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾﴾إبراهیم، واتە: ئایا بەسەرهاتی ئەوانەی پێش خۆتانتان پێ نەگەیشتوە: گەلی نووح و عاد و ثەموودو ئەوانەی دوای وانیش کەتەنها خوا دەیانزانێ، پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) بە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانەوە هاتنە لایان.. جا دوایی باسی ئەو وتووێژو دیالۆگە دەکا کە پێغەمبەران چۆن بەڵگە دێننەوە و، ناحەزانیشیان چۆن هەڕەشە دەکەن، کە دوا قسەیان ئەوەیە دەڵێن: ﴿لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ...﴿١٣﴾﴾إبراهیم، لە نیشتیمان و سەر زەمینی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر دین و بەرنامەکەمان، پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) قسەیان چی یە؟ ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ...﴿١٢﴾﴾إبراهیم، صەبر دەگرین هەرچەندە ئازارمان بدەن.

هەروەها لە سووڕەتی (الشعراء) دا گەلی نووح چی بە نووح دەڵێن: ﴿قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ۝١١٦﴾الشعراء، واتە: ئەی نووح! ئەگەر دەست هەڵنەگری و واز نەهێنی لەو پەیام و بانگەوازەت، لە بەردباران کراوان دەبی و، بەرد بارانت دەکەین.

هەروەها لووط(علیه السلام) لە ئایەتی ژمارە (١٦٧)ی سووڕەتی (الشعراء)دا گەلەکەی چی پێدەڵێن؟: ﴿قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُخۡرَجِينَ ۝١٦٧﴾الشعراء، ئەی لووط! ئەگەر واز نەهێنی، لە دەرکراوان دەبی و دەرت دەکەین.

وە لە سووڕەتی (الانبیاء)دا ئایەتی (٦٨)، گەلی (إبراهیم) چی بە(إبراهیم) دەڵێن؟: ﴿قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمۡ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ۝٦٨﴾الأنبياء، واتە: گوتیان ئیبراهیم بسووتێنن و پەرستراوەکانتان سەر بخەن، ئەگەر دەتانەوێ کارێ ئەنجام بدەن.

وە لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی (٢٩) دا، فیرعەون چی بە مووسا دەڵێت؟: ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ۝٢٩﴾ الشعراء، واتە: ئەگەر جگە لەمن پەرستراوێکی دیکە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، واتە: زۆر کەسی دیکەم زیندانیی کردووەو تۆش بە مەرەدی وان دەبەم.

کەواتە زۆر ئاشکراو ڕوونە کە نەیارانی پێغەمبەران، حوکمڕانە خۆشگوزەران و ستەمکارەکان بوون، وە لە بەرانبەر مەنتیقی هێمنانەو ژیربێژانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا، پەنایان بردۆتە بەر هەڕەشەو گوڕەشەو ئاگرو ئاسن .

شەشەم// لەنێو هەموو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) یەك پێغەمبەرمان هەیە كە بریتیە لە(یونس) (علیه السلام) كە صەبری نەگرتوە لەنێو گەلەكەیدا، وەلە ئەنجامی ئەوەشدا تووشی سەرزەنشتی خوای دادگەر بووەو تووشی سزاش بووە، كە دیارە ئەوەش زۆر شتی لێ وەردەگیرێ، كەواتە ئێمە وەك ئیسلامیی، كە دەمانەوێ خەڵكی خۆمان چاك بكەین، دەبێ صەبربگرین و لە نێوانیاندا بین، صەبر بگرین لەسەر ئازارو نارەحەتییەكانیان وەك پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: {**الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ الَّذِي لَا يُخَالِطُهُمْ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ**}[1]، واتە: ئەو ئیمانداره‌ی تێكەڵ بە خەڵك دەبێ وخۆڕاگر دەبێ لەسەر ئەزیەت وئازاریان، پاداشتی مەزنترە لەوەی تێكەڵ نابێ و خۆڕاگریش نابێ لە سەر ئەزیەت ونارەحەتی یەكانیان، چونكە پزیشك چۆن چارەسەری نەخۆش دەكا، ئەگەر فەحسی نەكاو دەردەكەی تەشخیص نەكا؟!.

بەڵێ تەنیا یەكێك لە پێغەمبەران لەو بنچینەیە هەڵاوێردراوە، كە بریتیە لە (یونس) (علیه السلام)، خوا (سبحانه وتعالى) باسی (یونس) مان بۆ دەكا كە صەبری نەگرتوە لە نێو گەلەكەیدا، كە بەڕای زۆربەی مێژوونوسان و توێژەرەوانی قورئان، بریتی بوون لە خەڵكی نەینەوا، واتە: خەڵكی موصڵ یان شارێك بووە لەنزیكی موصڵ، بەناوی نەینەوا وەك خوا (سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەر دەفەرموێ: (فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾)القلم. واتە: خۆڕاگربە بۆ حوكمی پەروەردگارت و وەك خاوەنی ماسی مەبە كە لەخوا پاڕایەوە، لە كاتێكدا

---

[1] رواه البخاري في (الأدب المفرد) برقم: (٣٨٨)، وأحمد برقم: (٥٠٢٢)، عن ابن عمر تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين، وصححه الألباني.

کە زۆر دڵی پڕ خەفەت بوو: ﴿لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾﴾ القلم، ئەگەر نیعمەتی خوا دەفریای نە کەوتبایە، فڕێ دەدرایە دەشت بەزەم کراویی، هەروەها لە ئایەتەکانی (٨٧و٨٨)ی سووڕەتی (الأنبیاء)دا هەرباسی ئەو دەکا و دەفەرموێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾﴾ الأنبیاء، واتە: بەسەرهاتی خاوەنی ماسییان بۆ بگێڕەوە، یاخود بیهێنەرەوە یادی خۆت، کاتێ کە بە تووڕەیی ڕۆیشت، (واتە: لەگەڵەکەی تووڕە بوو کە وەڵامیان نەدایەوە و ئەو بەجێی هێشتن)، پێی وابوو ئێمە وڵاتی لێ وەتەنگ ناهێنین، (واتە: پێی وابوو ئێمە لەسەرمان نەکردۆتە مەرج، کە دەبێ هەر لەوێ بێ، پێی وابوو بچێتە هەرشوێنێك قەیناکا بانگەواز بکا بۆ خوا، چونکە هەندێك لە توێژەرەوان ئەوەیان بەهەڵە تەفسیر کردوە، گوتوویانە: ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾، واتە: وای زانی ئێمە توانامان بەسەریدا نیە، نە ، هیچ پێغەمبەرێك گومانی وا بەخوا نابات، بەڵكو مانای ئەم ڕستەیە : ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ ئاوایە: وای زانی مەیدانی کارمان بۆ دیاریی نەکردوەو لێمان وەتەنگ نەهێناوە، لەسەرمان نەکردۆتە مەرج کە هەردەبێ لە نێو خەڵكی نەینەوادا بانگەواز بکات و پەیامی خوا ڕابگەیەنێ)، ئیدی ئەوە بوو کە دوایی ماسی قووتی دا و ئەویش بە هەڵەی خۆی زانی و، لە سکی نەهەنگەکەدا داوای لێبوردنی لەخوا کرد و، خواش دەربازی کرد. هەڵبەتە (یونس) (علیە السلام)، لەو هەڵوێستەی دا دەبێ پەندی لێوەربگیرێ.

حەوتــەم// لــەکاتی گەیشــتنە بــن بەســت دا، خــوا (ســبحانه و تعــالی) بــۆ خــۆی تەدەخخولی کردوەو پێغەمبــەرانو (علــیهم الصــلاة والســلام) ئەوانــەی لــە گەڵیاندا بوون، دەربازی کردوون و، کافرەکانی لە بەین بردوە. کە دیارە ئەوە بۆ پێغەمبەرانی پێش موحەممەد(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وابووە، وەك خــوا (ســبحانه وتعــالی) لەســوورەتی (ابــراهیم - ئایــەتی١٣-١٤) وەحــی بــۆ پێغەمبــەران (علیهم الصلاة والســلام) نــاردوەو فەرموویــەتی: (فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ )إبراهیم/١٣، بێگومان ئێمە ستەمکاران لە بــەین دەبــــەین،{ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ }إبـــــراهیم/١٤، وە لــــەدوای ئــــەوان لەســــەر زەوی نیشــــتەجێتان دەکــــەین، دوای ئــــەوەی کــــە خــــوای پــەروەردگار بــژاری ئــەو ســەرزەمینە دەکــات و جۆمــاڵی دەکــا و پــاکی دەکاتەوە، سەر لەنوێ کۆمەڵگایەك لە سەر بناغەی ئیمان و خوا بە یەك گــرتن دروســت دەبێتــەوە، بــۆ ئــەوەی جــارێکی دیکــە پــەیامی خــوای پەروەردگار تیشکی خۆی بەسەر زەمیندا بڵاو بکاتەوە .

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە، فەرمایشتێکی پێغەمبــەر (صَــلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەیە لە (صحیح البخاری)دا بەپێویســتی دەزانم ئامــاژەی پێ بکەم، دەفــەرموێ: (لــە ڕۆژی دوایــیدا پێغەمبــەری وا هەیــە دێ یــەك نەفەری لەگەڵ نیە، وە هی وا هەیە دێ نــەفەرێکی لەگەڵدایە ئیمانی پــێ هێنــاوە، وە هــی وا دێ دووان و ســیان و، هــی واش هەیــە کۆمــەڵێکی کــەم یان زۆر.. کەواتە: بــە ئامــانجی دنیــایی نەگەیشــتنی پێغەمبــەران (علــیهم الصلاة والسلام) کــە ئامــانجی دنیــایی پێغەمبــەران ئــەوە بــووە دیــنی خــوا لەسەر زەویدا بچەسپێنن و شەریعەتی خوا بکەنە سایەو سێبەری ژیــانی خەڵك، جا نــەگەیشتن بەو ئامانجە، بێگومان لە پلەو پایەی پێغەمبەرانی کــەم نــەکردۆتــەوە، مــادام ئەوانــە لــە لووتکــەی هــەرە بــەرزی هــەموو

سیفەتێکی چاکدا بوون، وە هەموو توانای خۆشیان صەرف کردوە، بەئامانجی دنیایی نەگەیشتنیان لە شان و شکۆ و پایەی ئەوانی کەم نەکردۆتەوە، وە لە ڕەوایی پەیام وبەرنامەکەشیانی کەم نەکردۆتەوە، وە ئەوە بۆ ئەوانیش وا بووەو بەتەئکید بۆ ئێمەش باشتر وایە، بەڵێ، ئەگەر پێغەمبەرێك نەیتوانیبێ لە ژیانی خۆی لە نێو کۆمەڵگەی خۆیدا دینی خوا بچەسپێنێ، لە ڕەوایی بەرنامەکەو پەیامەکەی کەم نەکاتەوە، لە شان و شەوکەتی نەهێنێتە خوارێ، دیارە ئێمەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، لەپێشترین بۆ ئەوە کە ئەگەر نەمانتوانی ئەو ئامانجە دنیاییە بێنینەدی، نابێ بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بانگەواز و پەیامەکەمان ڕاست نیە، چونکە زۆر جار ئەوە مسوڵمانان تووشی جۆرێك لە بێ هیوایی و ساردیی دەکات، کاتێك کە دەبینن نەیارە دنیاییەکانیان، یان نەیارە سیاسیی و فیکرییەکانیان بە هەندێك ئەنجام دەگەن، بەڵام ئەوان بە ئەنجام ناگەن. ئەوە جۆرێك لە وەسوەسە لە دڵیاندا پەیدا دەکات، تۆ بڵێی ئێمە لەسەر ناحەق بین؟! نا...مەرج نیە حەق هەمیشە لەسەر ئەرزی واقیع سەرکەوتوو بێ، بەڵێ حەق لە خودی خۆیدا سەرکەوتووەو لە ڕووی عەقڵ و بەڵگەوە سەرکەوتووە، بەڵام مەرج نیە هەمیشە هەل و مەرجی بۆ بڕەخسێ و بتوانێ لە زەویدا بچەسپێ و، ببێتە سایەو سێبەری ژیانی خەڵك و میللەت.

لە کۆتاییدا دەڵێم: ئێمە بە ئەندازەی ئەوە کە لە ژیانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەگشتی وەلە ژیانی پێغەمبەری خۆمان (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بەتایبەتی ورد دەبینەوە، لەو بارەوە کە چ ڕێبازو شێوازێك بگرینە بەر بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ دەوروبەری خۆمانداو، بۆ گۆڕانکاریی کردن و چاکسازیی کردن لە دەورو بەرمان دا، بەرچاومان ڕوون دەبێتەوە، وە بێگومان پێغەمبەری کۆتاییشمان (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) ڕێبازو شێوازەکەی لە هەموان

ڕوونترە، وە توانیویەتی بە چاکترین شێوە قەوارەیەکی سیاسی بۆ دینی خوای پەروەردگار بنیات بنێ و، سایەوسێبەرێك لەسەر بناغەی دینی خوا پێك بێنێ بەسەرسەری بەشەریەتەوە، بۆیە بڕگەی داهاتوومان بریتی دەبێ لە: (ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ بنیاتنانی دەوڵەت وقەوارە.)

## بڕگەی دووەم: ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم "صلى الله عليه وسلم" بۆ بنیاتنانی دەوڵەت و قەوارە:

بۆ خستنەڕووی ڕێباز و شێوازی پێغەمبەری کۆتایی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە ئایا چۆن کۆمەڵگای پاکسازیی و چاکسازیی کردوەو گۆڕیوە؟ سەرەتا ئەو ئایەتە بیر هەموو لایەك دەهێنمەوە، کە خوای کاربەجێ لە ئایەتی ژمارە (٩٠)ی سوورەتی (الأنعام)دا، دوای ئەوەی کە ناوی (١٨ ) لە پێغەمبەران دێنێت (صلى الله عليهم وسلم)، ڕوو لە پێغەمبەری کۆتایی دەکات و دەفەرموێ: { أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾ }الأنعام. واتە: ئا ئەوانە {واتە: ئەو پێغەمبەرانە (صلى الله عليهم وسلم)}، کەسانێکن کە خوا ڕێنمایی کردوون، تۆش شوێن ڕێنمایی ئەوان بکەوە. واتە خوا (سبحانه وتعالى) پێغەمبەری کۆتایی(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پابەند دەکا بە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەران (صلى الله عليهم وسلم) لەدینداریياندا، لەبانگەوازکردنیاندا، لە هەوڵدانیاندا بۆپاککردن و چاك کردن و ڕاستکردنەوەی خەڵك، وەگۆڕینی کۆمەڵگاو دەورووبەریان، هەڵبەتە لێرەدا حەقیقەتێکی گەورەو گرنگمان دەست دەکەوێ، ئەویش ئەوەیە کە ئینسان هەرچەندە زۆر شارەزا بێ و بلیمەت بێ، دیسان بێ نیاز نیە لەوە کە تەماشای ئەزموونی خەڵکی پێش خۆی بکا، تەنانەت پێغەمبەری خاتەم موحەممەد

(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) یش کە گەورەو سەروەری پێغەمبەرانە، وە بە تەئکید لە هەموویان پایەی بەرزتربووە، وە لە هەموویان شارەزاتر بووە، ئەویش خوا (سبحانه وتعالی) پێی دەفەرموێ { أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾ }الأنعام، ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون وە تۆش شوێن ڕینمایی ئەوان بکەوە، واتە: لە ئەزموونی ئەوان بەهرەمەند بەو پەند وەربگرە، وەك لەسوورەتی (هود)یشدا دەفەرموێ: (وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ ...﴿١٢٠﴾)هود. واتە: وە هەرچی لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانت بە سەردا دەخوێنینەوە، شتێکە کە عەقڵ و دڵتی پێ دەچەسپێنین، چونکە ئینسان ئەگەر بزانێ لە پێش ئەودا چۆن کراوە! بەرچاوی ڕوون دەبێ کە خۆیشی چۆن بکا، جا دیارە ئەگەر پێغەمبەری کۆتایی (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) کە سەروەری پێغەمەبەرانە مولزەم بێ بەوە کە لە سیرەو ژیانی پێغەمبەرانی پێش خۆی پەند وە ربگرێ و لە ئەزموونیان بەهرەمەند بێ، ئێمەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بە تەئکید چاکتر ئەوەمان لە سەر پێویستە و باشتر پێیەوە پابەندکراوین.

ئنجا ئاشکرایە کە ئەگەر شوێنپێ هەلگرتنی پێغەمبەرانمان بەگشتی لەسەر فەرز بێ، ئەوە هی پێغەمبەری کۆتایی پێویستتر و لەپێشترە، بەتایبەتیش کە خوا (عز وجل) هەواڵی پێداوین کە سەروەری پێغەمبەران لە هەرچی گوناهەو بە شوێنکەوتوویی هەواو ئارەزوو دادەنرێ، پارێزراو (معصوم)ە، وەك خوا دەفەرموێ:{ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ }النجم، هەرچەندە زۆر توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لێرەدا تەنیا قورئانە، کە ئەوەی دەیفەرموێ و دەیبێژێ، هەر وەحی یە. واتە: خوای پەروەردگار پێی ڕادەگەیەنێ، چونکە پێغەمبەر جاری وا هەیە ئیجتیهادی کردووە نەیپێکاوە،

بۆیە توێژەرەوان دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی قورئانە. بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عەقڵی خۆی بەکارهێناوە لە کاتێکدا کە وەحی لە بەردەست دا نەبووە، خۆی کۆششی کردوە، دیارە لەو بوارەدا کە پەیوەندیی بە هەڵسوکەوتەکانەوە هەیە، واتە لە بواری دنیاداریی دا، وەك فەرمویەتی: {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ}[1]. واتە: ئێوە بە کاروباری دنیاتان زاناترن. ئەگەرنا لە بواری عەقیدەو عیبادەت و ئەو شتانەدا، کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە بێ وەحی هەنگاوی نەناوەو لێی بێدەنگ بووە، بەڵام ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە بواری دنیاداریی و کاروباری ڕۆژانەوە هەبووە، دیارە هەمیشە چاوەڕێی وەحی نەکردوەو، عەقڵی خۆی بەکار هێناوە، ئنجا ئەگەر نەیپێکابێ لە کۆشش کردنێکیداو لە بۆچوونێکدا، خوای کاربەجێ بۆی ڕاست کردۆتەوە، کەواتە سەرەنجام هەرچی کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی و کردوویەتی و دانی پێداهێناوە، بەتەئکید هەمووی لە هەڵە پارێزراوە، چونکە ئەگەر لەئیجتیهادێکدا نەیپێکابێ، بۆی ڕاست کراوەتەوە، وەك:

(١) مەسەلەی دیلەکانی جەنگی بەدر.

(٢) ئەوە کە ڕووی لە (عبدالله)ی کوڕی (مکتوم) گرژکرد.

(٣) ئەوە کە هەندێك لەدڵ نەخۆش و منافیقەکان هاتن عوزریان بۆ هێنایەوە کە نەچن بۆ جەنگی تەبووك و ئیزنی دان.

هەموو ئەوانە کە تێیاندا نەیپێکاوە لە ئیجتیهادەکانیدا، خوای بەبەزەیی بۆی ڕاست کردۆتەوە.

کەواتە: لەلایەکەوە دەبێ بەدوای هەموو پێغەمبەران بکەوین(علیهم الصلاة والسلام) بەگشتی، واتە: لەئەزموونی ئەوان دەرس و پەند وەربگرین، وە

[1] رواه مسلم برقم: (٦٢٧٧) عن عائشة وعن ثابت عن أنس رضي الله عنهم أجمعين.

لەلایەكی دیكەشەوە بۆ پێغەمبەری خۆشمان (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) بەتایبەت فەرمانمان پێ كراوە كە موو بە موو شوێن پێ ی هەڵبگرین خوا (سبحانه وتعالى) لە سورە تی (الأحزاب) دا دەفەرموێ { لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ }الأحزاب. واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرمەشقییەكی باش و چاوساغییەكی باش هەیە بۆ ئێوە، بۆ هەركامێكتان كە بە تەمای دیداری خوابێ و بەتەمای دوارۆژبێ، وە زۆر یادی خوا بكات، واتە: بۆ هەر كەسێك كە خۆی بە مسوڵمان بزانێ، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) باشترین سەرمەشقە كە دەبێ عەقیدەی وەك هی پێغەمبەر بێ، وە بووناسیی وەك هی پێغەمبەری خوا بێ، وە عیبادەتی وەك هی ئەوبێ، وەك فەرموویەتی: {**صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي**}[1]. وە فەرموویەتی:{**لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ**}[2]، وە دەبێ ڕەوشت و هەڵسوكەوتی وەك هی پێغەمبەری خوابێ، وە دەبێ چاككردنی كۆمەڵگایشی و جەنگ وجیهادیشی و، حوكمڕانیی و سیاسەت كردنیشی وەك هی پێغەمبەری خوابێ.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە: هەندێ كەس كە ئەم ئایەتە قورئانییە دێنێتەوە:
لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ) الأحزاب ، وا دەزانێ تەنها مەبەست پێی ئەخلاقی شەخصییە، بەڵام ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەكە بكەین: ئەم ئایەتە قورئانییە لە سیاقێكدا هاتوە كە هەمووی باسی جەنگ وجیهادە، واتە: ئێوەش چاو لە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بكەن بۆ دیفاع كردن لە دینی خوا و بەرقەراركردنی

[1] رواه البخاريُ برقم: (٦٣١) عن مالكِ بنِ الحُويرِثِ رضيَ اللهُ عنه.
[2] رواه مُسلِمٌ برقم: (١٢٩٧)، وأبو داوُد برقم: (١٩٧٠).

دینی خوا و پاراستنی قەوارەی ئیسلامیی و بۆ جەنگ و جیهادو فیداکاریی.

کەواتە کە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا سەرمەشقێکی باشە بۆ ئێوە، واتە: لە هەموو بوارەکانی دینداریی ودنیاداریی دا، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)یشدا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: { قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ }آل عمران، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ پێیان بڵێ، (بە خەڵك گشتی، یاخود بە ئیماندارانی شوێنکەوتووت، بە تایبەتی، هەردووکی دەگرێتەوە): ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون خواش خۆشی دەوێن، وە لە گوناهەکانیشتان دەبووریّ، وە خوا لێبوردەی بەبەزەییە. کەواتە: شوێن پێ هەڵگرتنی ئێمە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بەڵگەی خۆشویستنمانە بۆخوا، وە هۆکاری خۆشویستنمانە لەلایەن خواوە، واتە: شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) لە هەموو بوارەکاندا ئەم لاوئەولای بریتین لە خۆشەویستیی، یەکەم: نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە خوامان خۆش دەوێ، دوو: هۆکاری ئەوەیە کە خوا ئێمەی خۆش بوێ، یانی بە ئەندازەی ئەوە کە بە دوای خۆشەویستی خوا(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دەکەوین، خوا خۆشی دەوێین، وە بە ئەندازەی ئەوە کە شوێن پێی خۆشەویستی خوا هەڵدەگرین، ئیسپاتی دەکەین کە خوامان خۆش دەوێ، لە هەموو بوارەکاندا: هەڵسوکەوتی شەخصیی، خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، چونکە پێغەمبەری خوا نەهاتوە بەس نوێژو ڕۆژوومان فێربکات، وە نەهاتوە بەس دینداریی شەخصییمان فێربکات، بەڵکو هاتوە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی، خێزانیی، جەنگ و ئلشتی، سیاسیی، هەموو شتێکمان فێربکات.

ئێستاش بە پێویستی دەزانم سەرەتا قۆناغەکانی کارو پرۆژەی ئیسلامییانەی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) ڕیز بکەین، پێغەمبەر

(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە حەوت قۆناغ گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگای خۆیدا کردوەو، سەرەنجام قەوارەی سیاسیی یەکەمی دروست کردوەو، دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەمی بنیاتناوە:

قۆناغی یەکەم: دابەزینی وەحی بۆ سەر موحەممەد و ڕەوانە کرانی بە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ).

قۆناغی دووەم: بانگەوازو هۆشیارکردنەوەی خەڵك .

قۆناغی سێ یەم: تێگەیاندن وپێگەیاندنی کۆمەڵە مسوڵمانێکی هەڵبژاردە.

قۆناغی چوارەم: گەڕان بە دوای بنکەی جەماوەریی و پێگەی دەوڵەتدا.

قۆناغی پێنجەم: پەیمانی یەکەمی عەقەبە و پەیمانی دووەمی عەقەبە لە ساڵانی ١٢و١٣ی پێغەمبەرایەتییدا.

قۆناغی شەشەم: کۆچکردنی پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، وەپێش خۆی هاوەڵانی بەڕێزی بۆ (یثرب) وە بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی.

قۆناغی حەوتەم: دانانی پێنج پایەی گرنگ: دروستکردنی مزگەوت، برایەتی نێوان کۆچکەران و پشتیوانان، نووسینی صەحیفە (دەستور)، بانگ، ڕووگە (قبلە)..

ئەم حەوت قۆناغە، پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە پلە پلە بڕیونی و سەرەنجام ئەو گۆڕانکارییەی کە خوا پێی فەرمووە وفەرمانی پێ کردوە، کردوویەتی وە دەرەنجامەکەشی بریتی بووە لە پێکهێنان وبنیاتنانی ئەو قەوارەو دەوڵەتە ئیسلامییەی کە لەسەر دەستی موبارەکی تەواوبووە .

بێگومان ئەو پۆلێنکردنە بە پێی ئیجتیهادی منە، ڕەنگە یەکێکی دیکە بە جۆرێکی دیکە پۆلیێنیان بکا، وە هەرکام لەوقۆناغانەش دەگونجێ وردتری بکەینەوە، بۆ وێنە باسی بانگەوازو هۆشیار کردنەوەی خەڵك، پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو قۆناغەی دابەش کردۆتەوە بۆ چەند وردە قۆناغێك:

(بانگـــەوازی پـــەنهانیی، بانگـــەوازی ئاشـــکرا، بانگـــەوازی تـــاکیی، بانگـــەوازی بەکۆمەڵ)، پاشان دژایەتیی ئـەو بانگەوازە لەلایـەنی ناحـەزانی یـەوە، ئـەویش بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی، واتە ئەو حەوت قۆناغە بە بۆچوونی مـن قۆناغـە سەرەکیەکانن کە پێغەمبەری خوا دەوڵەتەکەی با وەك خۆی بێ دا بنیاتناوە.

کاتێـك کـە تەماشـای سیرەو ژیاننامـەی پێغەمبـەر (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) دەکەین، دەبینین قۆنـاغی مـەککیی سـەختیی و دژوارییـەکانی تایبـەت بـەخۆی هـەبوون و، قۆنـاغی مـەدەنییش سـەختیی و دژوارییـەکانی تایبـەت بـەخۆی هەبوون، واتە: ئەوسەختیی و دژوارییانەی کەلە مەککەدا هاتوونە ڕێی جۆرێك بوون و تامێکیان هەبووە، وەئەوانەی کە لە مەدینەیش هاتوونە ڕێـی جـۆرێکی دیکە بوون، بەڵام مـن نـاتوانم بڵێم: قۆنـاغی مەککە سـەخت تـر بـووە لـە هـی مەدینـە، چـونکە بێگومـان لەمەدینـەش پێغەمبـەر(صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) و هاوەڵانی زۆر تووشی گرفتاریی بوون، بەدەست مونافیقـەکان و موشـریکەکان و جولەکـەکان و دڵ نەخۆشـەکانەوە، وە بەدەسـت کێشـەو گرفتـەکانی خـەڵك و وڵـات و دەوڵەتـەوە، لەمەککـە کۆمەڵـە مسـوڵمانێکی هەڵبـژاردە بـوون و دوژمنەکانیشیان ئاشکرا بـوون، بـەڵام لەمەدینـە وێـڕای دوژمنـە ئاشـکرایەکانی وەك موشـریکەکان و جوولەکـەکان و لـە دوورەوەش فـارس و ڕۆم، دوژمنـی دیکەی تازەش پەیدا بوون: دەغەڵ و مونافیقەکان کە لەکەوڵی مسوڵمانەتیی دا بوون، وەك دەڵێ گورگ بوون لەپێستی مەڕداو، هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەواندا زۆر زەحمەت بوو و، داخ و خەفەتی زۆر بەهۆیانەوە بەدڵی مووبارەکیدا چوو.

لێـرەش بەچـاکی دەزانم تیشـك بخەمـە سـەر مەسـەلەیەك، ڕەنگـە پرسـیار بکرێ: ئایـا ئێمـەش وەك چۆن پێغەمبـەر(صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) بـەم حـەوت قۆناغەدا تێپەڕیوە و گوزەری کردوە تاکو ئەو کۆمەڵگایـەی خـۆی گۆڕیـوە، بـەو شـێوەیەی کـە خـوا فـەرمانی پێکـردوە، کۆمـەڵگای بەشـەری چۆن بـێ، دیـارە

پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو کۆمەڵگاو دەوروبەرەی خۆی بەو شێوەیە لێکردوە، ئایا ئێمەش مولزەمین کە بەو قۆناغانەدا بڕۆینەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر ...بۆچی؟ چونکە ئەو هەل و مەرجەی کە پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تێیدا بووە، دیارە تایبەتمەندیی خۆی هەبووە، بۆ وێنە: ئەو لە کۆمەڵگایەکدا بووە کە هاوبەش پەرست کافر و لاڕێ بووە، بەڵام ئێمە لە کۆمەڵگایەکداین کە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانە، کەواتە مەرج نیە ئەو قۆناغانەی کە پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بڕیونی، بۆ وێنە: قۆناغی کۆچ کردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، مەرج نیە ئێمە مولزەم بین بە کۆچ کردنەوە، یان بانگەوازی نهێنیی، مەرج نیە، ئێمە مولزەم بین بەوەوە، خەڵك کە مسوڵمانە چ پێویست دەکات بانگەوازەکەت بە نهێنیی و پەنهانیی بێ؟!

کەواتە: ئەو قۆناغ بەندییە پابەندکەر (ملزم) نیە بۆ ئێمەو مانان، بەڵام بەرچاو ڕوونییەکە کە ئێمە بزانین پێغەمبەری ئێمە(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو قۆناغانەی چۆن بڕیون، وە چۆن ئەو کارەی بەو سەرەنجامە گەیاندوە.

ئێستاش با تیشك بخەینە سەر هەرکام لەو حەوت قۆناغە:

**<u>قۆناغی یەکەم:</u> بریتیە لە دابەزاندنی وەحی و ڕەوانە کرانی موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە پێغەمبەر:** هەڵبەتە (وحي)یش حاڵەتێکی تایبەتە و دیاردەیەکی تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) واتە: وەحی بە چەمك و واتا شەرعیی یەکەی و بە چەمك و واتا تایبەتییەکەی بریتییە لە پەیام ناردنی تایبەتی خوا بۆ کەسانێکی هەڵبژاردە، کە پێغەمبەرانن (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)بۆیەش ئەوە دەڵێم، چونکە وشەی (وحي) لە قورئاندا بەمانای دیکەش بە کار هاتوە، بۆ وێنە:

(١) بۆ وەسوەسەی شەیتانەکان بە کارهاتوە، وەك دەفەرموێ: { وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ }الأنعام).

(٢) وە بۆ ئاماژەکردن بەکارهاتوە، وەك دەفەرموێ: { فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ }مريم، کە زەکەریا (سەلامی خوای لێ بێ) کاتێ خوای کاربەجێ زمانی بەست، دوای ئەوەی کە یەحیای کوڕی کەوتە سکی دایکی، وەك موعجیزەو نیشانەیەك، زەکەرییا فەرمووی: نیشانەیەکم بۆ دابنێ، خوا فەرمووی: ناتوانی قسە بکەی، ئنجا بە ئیشارەت قسەی لەگەڵ قەومەکەی کرد (فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ) واتە: (أشار اليهم) ئاماژەی بۆ کردن.

(٣) هەروەها خوای پەروەردگار وشەی وەحی بۆ ئەو فێرکردنە غەریزییەی کە فێری هەنگی کردوە بەکارهێناوە: { وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ }النحل.

بەڵام مانای تایبەتیی و شەرعیی وەحی بریتییە لەو پەیامە تایبەتییەی کە خوا لە ڕێی فریشتەوە یان ڕاستەوخۆ، یان لە ڕێی خەونەوە بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِم وَسَلَّمَ). هەڵبەتە ئەم مەسەلەی وەحی یە شتێکی زۆر گەورەو گرنگە، خوای بەرز و مەزن لە سووڕەتی (الشورى) دا دەفەرموێ: { وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ }الشورى، پێشتر باسی وەحی و چۆنیەتی وەحی

ناردنی خۆی بۆ پێغەمبەران دەکات، پاشان دەفەرموێ: (وَكَذَٰلِكَ) واتە: وەك چۆن پێشتر وەحییمان بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ ناردوە، ئا بەو شێوەیەش وەحییمان بۆ تۆ ناردوە، بەڵام ئەو وەحییە ناو دەنێ ڕووح: (رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا) لەلایەن خۆمانەوە ڕووحێکمان بۆ تۆ ناردوە، واتە: وەحی خوا ڕووحە بۆ ژیانی بەشەر، پاشان دەفەرموێ: (مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ) پێش هاتنی وەحی نەتدەزانی نە کتێب و نە ئیمانیش چییە، چۆن ئیمان بەخوا بێنی؟ وە چۆن ژیانی خۆت وکۆمەڵگایەکەت ڕێك بخەی؟ (وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا) بەڵام ئێمە ئەو وەحییەمان کردە ڕووناکییەك، کەواتە: وەحی خوا ڕووحە خەڵك ووڵاتی پێ زیندوو دەبێتەوە، وە نوورە بەرچاوی خەڵکی پێ ڕووناك دەبێتەوە (نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا) هەرکامێك لەبەندەکان کەیمانەوێ بەهۆی ئەو وەحییەوە ڕێنمایی دەکەین (وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) {الشورى٥٢}. وەبێگومان تۆ بەهۆی وەحییەوە خەڵك ڕێنمایی دەکەی بەرەو ڕاستە شەقام.

لێرەدا دەمەوێت بڵێم: ئەو وەرچەرخانەی کە لە ژیانی موحەممەددا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دروست بوو لەو کاتەوە دروست بوو کە وەحی بۆ هات، جا لێرەوە دەمەوێ ئاماژە بە شتێکی دیکە بکەم: زۆرجار کە یادی لە دایك بوونی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکرێ، باسی هاتنی پێش وەحی دەکرێ! کە پێش هاتنی وەحی موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەڵێ خاوەنی گەورەترین عەقڵ وپاکترین فیترەت و چاکترین ئاکار بووە، بەڵام هەر ئینسانێ بووە وەك ئەوخەڵکە، واتە: جارێ کە وەحی بۆ

نەهاتبوو، نەك هەر نەیدەتوانی ڕێ بەخەڵك پیشانبدا، بەڵكو بۆ خۆیشی بەو ڕێیە نەدەزانی، خوا بە دەقی ئایەت دەفەرمویٚ: (مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ )، بۆیە ئێمە كاتێ كەباسی پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەكەین، قەیناكا ئەگەر باسی پێش وەحی بۆ هاتنی بكەین، كەسایەتیی چۆن بووە و، تەمەنی چۆن گوزەراوەو، قۆناغەكانی چۆن بوون؟ بەڵام دەبێ تەركیزمان لەسەر قۆناغی دوای هاتنی وەحی بێ، چونكە لەدوای هاتنی وەحییەوە موحەممەد(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پێغەمبەری خوایە، ئەگەر نا پێشتر هەر (موحەممەد)ی كوڕی (عبدالله) بووە(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ).

ئنجا یەكەمین ئایەتانێك كەبوونە دەستپێكی وەحی، ئەم پێنج ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (العلق) بوون، كە خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾، ئەم (پێنج) ئایەتە یەكەمین ئایەتێك بوون كەدابەزینەسەردڵی موبارەكی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەسەر زمانی(جبریل) كەلەشێوەی پیاوێكدا خۆی بەرجەستەكرد، وەك لەصەحیحی بوخارییدا هاتوە.[1]

كاتێك پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە ئەشكەوتی حیڕاء دا وەكو عادەتی خۆی لە خەڵوەدا بوو و خەریكی خواپەرستیی بوو، بەو شێوەیە كە فیترەت و عەقڵی سەلیم داوا دەكا، نەك بەو شێوەیەكە شەریعەت داوا دەكا، كە ئەوەی نەدەزانی، لەو كاتەدا، كە وەك من لەكتێبی (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا ڕوونم كردۆتەوە،

---

[1] صحيح البخاري: ٣.

لەشەوی (٢١)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٤١)ەمینی تەمەنی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا بووە، (جبریل) هات بۆلای، وە پێغەمبەری خوای بەخۆیەوە گوشی و فەرمووی بخوێنە، پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) یش فەرمووی خوێندەوار نیم، جارێکی دیکەبەخۆیەوە گوشی و فەرمووی بخوێنە، دیسان فەرمووی: خوێندەوار نیم، ئنجا جاری سێیەم بەخۆیەوە گوشی و فەرمووی: {ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١} . بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەت کە درووستی کردوە، واتە: هەموو شتێکی دروست کردوە، {خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢}، لە ڕیزی ئەو شتانەدا کە دروستی کردوون، ئینسانی لە خوێن پارە (علق) دروستکردوە، کە یەکێکە لە قۆناغەکانی درووست بوونی ئینسان، {ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣}، بخوێنەو پەروەردگارت هەرە بەخشەرە، ئەو پەڕی کەرەم وبەخشندەیی هەیە، واتە بخوێنەو پەروەردگارت هەموو شتێکت فێردەکات{ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤}، لە کەرەم و بەخششی خوا ئەوەیە کە بەقەڵەم خەڵکی فێری خوێندن و نووسین کردوە، واتە خوا لەنێو هەموو دروست کراوەکانیدا باسی دروست بوونی مرۆڤ دەکات لە خوێن پارە، وە لە ڕیزی هەموو بەخشراوەکانیشدا باسی بەخشینی زانست و خوێندەواریی دەکا، بەهۆی قەڵەمەوە {عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ۝٥}، ئینسانی فێری شتێك کردوە کە نەیدەتونی بیزانێ، واتە: خوا لەڕێی وەحییەوە ئینسانی فێری شتێك کردوە کە نەیدەتوانی بیزانێ، یاخود لەڕێی عەقڵ و ئەو هەستەوەرانەوە، کە بە ئینسانی داون، ئەو توانایەی بە ئینسان داوە، شتانێك بزانێ کە ئەگەر خوای پەروەرگار ئەو هۆکارانە و ئەو ئامرازانەی پێ نەدابایە، نەیدەتوانی ئەو شتانە بزانێ.

بەڵێ ئەم ئایەتانە یەکەمین ئایەتانێك بوون کە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دابەزین، ئنجا ئایا لەم ئایەتانەوە چی وەردەگیرێ؟، ئەوە وەردەگیرێ کە یەکەمین پەیوەندیی خوا، بە دواهەمین پێغەمبەری خواوە (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) لە رِێی (جبریل)ەوە بووەو، (جبریل) هێنەری وەحی خوابووە بۆ هەموو پێغەمبەران(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ)، وە لەسەر رِای زۆربەی زانایان (جبریل) گەورەی هەموو فریشتەکانیشە، خوا گەورەی هەموو فریشتەکانی، بە گەورەترین کتێبی خۆیەوە، بۆ سەر دڵی گەورەترین بەشەر، وە گەورەترین پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) وە بۆ چاکترین و دوایین ئۆممەت ناردوە، کە دەبێ لە سەر وەحی خوای پەروەدەگار پەروەردە بکرێ.

ئنجا ئەو پێنج ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە دەبێ بەناوی خواوە بژین و، بەرِێوە بچین، {ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾}، خواش (سبحانه وتعالی) ئەو پەروەردگارەیە کە ئێمەی دروست کردوە، ئنجا ئەو پەروەدگارە لە گەڵ ئێمەدا خاوەنی ئەوپەرِی بەخشش و کەرِەمە، وە گەورەترین کەرِەمی لەگەڵمان ئەوەیە کە ئێمەی فێری زانست کردوە، فێری خوێندەواریی کردووین، یاخود لەرِێی وەحییەوە فێری شتانێکی کردووین کە بەبێ وەحی نەمان دەتوانی بیانزانین.

کەواتە: بەندایەتیی بۆ خوا لەسەر بناغەی زانیاری و، بەرچاو رِوونیی یە، لەسەر بناغەی ئەوەیە کە تۆ بزانی داخۆ تۆ چی و؟ کێ تۆی دروست کردوەو؟ بۆچی دروستی کردووی؟ لە کوێوە هاتووی؟ وە بۆ کوێ دەچی؟ ئەمە قۆناغی یەکەمی کاری پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) بوو کە جارێ خۆی دەبێ بزانێ، چی بکاو چۆن بکا؟!

دیارە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەم (نبي)یە و هەم (رسول)ە، واتە: هەم پەیام بۆ نێردراوە و هەم ڕەوانەکراوە، ئنجا: قۆناغی پەیام بۆ نێردرانی پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (النبوة)ی (موحەممەد) دە (١٠) شەو و ڕۆژی خایاندوە، وە دە شەوو ڕۆژی کۆتایی ئەو مانگی ڕەمەزانەیە، کە دەکەوێتە ساڵی (٤١)ەمینی تەمەنی پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) واتە: لە(٢١)ی ڕەمەزان تا مانگی ڕەمەزان تەواو بووە، لە دوای ئەوە ئنجا قۆناغی دووەم دەست پێ دەکات، واتە: قۆناغی ڕەوانەکران (رسالة)ی.

**قۆناغی دووەم: بانگەواز و هۆشیارکردنەوەی خەڵك:** واتە: بانگکردنی خەڵك بۆ ئەو هیدایەتەی کە خۆی وەریگرتوە، وە بەرچاو ڕوون کردنەوەیان بەو حەقیقەتانەی کە خوای بەرز و مەزن عەقڵ و دڵی ئەوی پێ ڕۆشن کردووەتەوە، ئنجا ئەگەر قۆناغی یەکەمی کاری پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (العلق) دەستی پێکرد، ئەوە قۆناغی دووەم بە حەوت ئایەتی سەرەتای سوورەتی (المدثر) دەست پێ دەکا کە دەفەرموێ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ، يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴿٧﴾)المدثر.

ئەم حەوت ئایەتە موبارەکە مانایان بە کورتیی ئاوایە:

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە،

(يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾) ئەی ئەو کەسەی کە خۆت لە نوێن وپێخەفەوە پێچاوە! هەروەك لە (صحیح مسلم)دا هاتووە، کە دایکمان عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە دیارە ئەویش لە هاوەڵانی بەرێزەوە یان لە خودی

پێغەمبەرەوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەگێڕێتەوە، کە دوای ئەوەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە ئەشکەوتی حیرائدا جبریل(علیه السلام) ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سووڕەتی( العلق) ی بۆ دینێ، دەچێتەوە بۆ ماڵ وە بەخەدیجەی خێزانی (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: {دَثِّرُونِي دَثِّرُونِي}[1]. واتە: داميۆشن داميۆشن، مەترسیی لە خۆی پەیدا دەبێ کە دەستی لێ وەشێنرابێ و، گومان دەبات کە ئەوە شەیتانێك بێت هاتبێتە لای، دایکمان (خەدیجە)ش (خوای لێ ڕازی بێ)، دەیبات بۆ لای (وەڕەقەی کوڕی نەوفەل)ی ئامۆزای، وەڕەقەش دوای ئەوەی کە لە پێغەمبەر دەپرسێ و ئەویش حاڵ و وەزعی خۆی بۆ ڕوون دەکاتەوە، پێی دەڵێ: ئەوەی هاتوە بۆ لات، هەر ئەو فریشتەیە کە بۆلای پێغەمبەرانی پێش تۆ هاتوە.

شایانی باسە (دثار) ئەو شتەیە کە ئینسان خۆی پێ دادەپۆشێ، جا هەندێك لە زانایان گوتویانە: مەبەست ئەوە بووە: ئەی ئەو کەسەی کە تا ئێستا خۆت کوشمەڵە کردوە و حەقت بەسەر کەسەوە نەبووە، لەمەودوا هەستەو دەبێ حەقت بەسەر خەڵکەوە هەبێ، لەمەودوا دەبێ بۆ خەڵك بژی {قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢}، هەڵسەو خەڵك وریا بکەرەوە، ئەرکی سەرەکی پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بریتی بووە لە هۆشیار کردنەوە و ئاگادار کردنەوە و بێدار کردنەوەی خەڵك (وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣)، وە پەروەردگاری خۆت بە گەورە بگرە، واتە: پەروەرگارت لەلا گەورەتر بێ لە هەموو شتێك، لە هەموو کۆسپێك کە دێتە ڕێت، هەر هەڕەشەیەکت لێ دەکرێ، هەر تەماعێك پێشانت دەدرێ، هەر ترسێك وەبەرت دەنرێ،

[1] رواه أحمد برقم: (١٤٥٢٣)، ومسلم برقم: (١٦١).

پەروەرگارت پێ گەورەتر بێ لە هەموو ئەوانە، وە گەیاندنی پەیامی خوات پێ گەورە تربێ لە هەموو ئەوانە، وە هیچ شتێك كارت تێ نەكات {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾}، وە پۆشاكی خۆت پاك بكە، ئەمە زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن مەبەست پێی مانای مەجازییەتی، وەك: عەرەب دەڵێن: (فلان طاهر الذيل) یان (نظيف الذيل) واتە: فڵان كەس داوێنی پۆشاكەكەی پاكە، واتە پەرێزی پاكەو سیڕەو ژیانی چاكەو، ڕەوشتی بەرزو جوانە، واتە: تۆ لە هەر شتێك كە دەبێتە هۆی ناشیرین كردن و لائیقی تۆ نیە و، شایستەی ئەو پەیامە بەرزەت نیە، خۆت بەدوور بگرە. هەڵبەتە پێشتریش خۆی بەدوور گرتوە بە حوكمی فیتڕەتی پاك و ساغی، بەڵام ئەمجارە هەم بە حوكمی فیتڕەت و هەم بە حوكمی ئەو وەحی و پەیام و شەریعەتەی كە بۆی دێ (وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾) **(وَالرُّجْزَ)** واتە گوناه، یاخود پیسی، كە لێرەدا دەگونجێ پیسی مەعنەویی بێ، یان پیسی ماددیی، واتە: واز لە گوناهو هەڵەو پیسی بێنە. (وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾) وە منەت مەكە، ئەوەی كەبە خەڵكی دەدەی بە زۆری بزانی، یاخود ئەگەر بەخششێكت لەگەڵ كەسێك كرد و شتێكت پێ بەخشی، بە زۆری مەزانە، یاخود ئەگەر شتێكت بە كەسێك دا چاوەڕێی ئەوە مەبە لە بەرانبەردا شتێكی زیاتر وەربگریتەوە (وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴿٧﴾) وە بۆ پەروەردگارت خۆ ڕاگر بە، واتە لە پێناوی گەیاندنی پەیامی پەروەردگارتدا و چەسپاندنی دین وشەریعەتەكەیدا و، هۆشیار كردنەوەی بەندەكانیدا و، لە خوا نزیك خستنەوەیاندا ، خۆڕاگر بە، وە نەفەست درێژ بێ.

### ئاشكراكردنی بانگەواز

بەڵام ئاشكرا كردنی بانگەوازی ئاشكرای پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە ئایەتی (٩٤) ی سوورەتی (الحجر) دەستی پێكرد (فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾) واتە: ئەوەی فەرمانت پێكراوە بە دەنگی زوڵاڵ وبەرز رایبگەنە وە ڕوو لە هاوبەش پەیدا كەرەكان، وەرگێڕە و گوێیان پێ مەدە، وشەی (صدع) لە زمانی عەرەبیدا بۆ شتێكی ڕەقە كە بشكێ (**الصَّدع: الشقّ في الشيء الصُّلبِ**)[1] واتە: تۆ ئەو بانگەوازە بتەقێنەوەو بە دەنگی بەرز بیزرنگێنەوەو بە گوێی خەڵكیدا بدە، ئەمەش دوای ئەوە بوو كە قۆناغی بانگەوازی نهێنی تێپەڕی، خوای كاربەجێ بەم ئایەتە پێغەمبەری (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مولزەم كرد كە لە قۆناغی پەنهانەوە بگوازێتەوە بۆ قۆناغی ئاشكرا، هەڵبەتە لێرەدا وەك لەسەرەتایشدا ئاماژەم پێدا، ئێمە ئەگەر بمانەوێ هەركام لەو قۆناغانە بچینە نێو وردەكارییەكانییەوە، مانای وایە بابەتەكەمان دەبێتە سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەڵام ئێمە لێرەدا دەمانەوێ تەماشای ژیانی پێغمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بكەین كەچۆن واقیعی كۆمەڵگای گۆڕیوەو، چۆن دەوڵەت و قەوارەی ئیسلامیی یەكەمی بنیاتناوە؟ بۆیە بەناچاریی دەبێ هەڵوەستەی كورت كورتیان لە بەردەمدا بكەین .

ئنجا ئاشكرایە كە لە دوای پێغەمبەرەوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەرگای وەحی داخراوە، لە (صحیح البخاری)دا هاتوە كە یەكێك لە ئافرەتانی مسوڵمان (خوایان لێ ڕازی بێ) زۆر پەرۆشی پێغەمبەری دەبێ‌و دەگری و

---

[1] - المعجم الوسیط، ص٥١٠.

ناڕەحەت دەبێ، ڕۆژێك كۆمەڵێك لە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێ) دەچن بۆ دڵدانەوە وسەردانی، ئەویش دەڵێ: ئەوەی كە منی ناڕەحەت كردوە: (إِنقَطَعَ عنَّا خَبَرُ السَّماءِ) هەواڵی ئاسمانمان لێبڕا، ئیدی ئەو قسەیە وای كرد كە هەمویان بگرین!

بەڵێ بەكۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەحی نەماوە، بەڵام ئایا ئەركی ئێمە چییە؟ ئەركمان ئەوەیە ئەو وەحییە كە بۆ پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هاتوە، ئێمەش لەو وەحییە تێبگەین، وەری بگرین و لێی حاڵی بین و لە خۆماندا بەرجەستەی بكەین، ئەوەی كەبە خۆمان دەكرێ، ئەوە وەك قۆناغی یەكەم، ئنجا هەوڵ بدەین بیگەیەنین بە خەڵك، واتە: وەك چۆن پێغمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پێشێ خۆی ئەو ڕاستییانەی لەڕێی وەحییەوە دەزانرێن وەریگرتوون و لە دڵ و عەقڵی خۆیدا جێی كردوونەتەوەو قەناعەتی پێیان بووە، كە بەرجەستە بوون لە بوونناسیی‌و عەقیدەو عیبادەت‌و ڕەوشت‌و ڕەفتاری بەرزو پەسنددا، ئێمەش دەبێ هەموو ئەوانە تاك تاكمان لە خودی خۆماندا بەرجەستەیان بكەین، پاشان وەك چۆن دوایی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەڵدەستێ بە ئاگاداركردنەوەی خەڵك و هۆشیار كردنەوە و بانگ كردنیان، ئێمەش بە هەمان شێوە دەبێ ئەو قۆناغە لە گەڵ دەوروبەری خۆماندا ببڕین.

**قۆناغی سێیەم: تێگەیاندن و پێگەیاندنی كۆمەڵە مسوڵمانێكی هەڵبژاردە:**

سەرەتا پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بانگەوازی كردو خەڵكی هۆشیار كردەوەو تێگەیاندو، ڕایچڵەكاندن، كە خەڵكینە! لە خەوی بێئاگایی هەڵسن! ئێوە ئاژەڵ نین تەنیا بۆ خەوو خواردن بن، بەڵكو ئێوەی مرۆڤ مەخلووقێكی ناوازەن، شتێكی گەورەن، دەبێ بزانن بۆچی دروست كراون

و بۆکوێ دەچن و لە کوێوە هاتوون؟، ئنجا دوای ئەوەی خەڵکی ڕاچڵەکاندو هۆشیارکردەوە، قۆناغی سێهەمیی کارەکەی دەست پێدەکات کە بریتی یە لە (تێگەیاندن وپێگەیاندنی کۆمەڵە مسوڵمانێکی هەڵبژاردە) دوای ئەوەی کە خەڵك هۆشیار دەکرێتەوە، ئەوجار دەگونجێ پەروەردەبکرێ، کەسێك هۆشیار نەبووبێتەوە چۆن دەگونجێ پەروەردە بکرێ! تێگەیاندن و پێگەیاندن وپەروەردەکردن قۆناغێکە دوای ئەوە دێ کەمرۆڤ هەڵساوەتەوەو هۆشیار بوەتەوە و بەرچاوی ڕوون بۆتەوە و، دەزانێ بۆچی دروستکراوە و، کێ دروستی کردوە و لە کوێوە هاتوەو، بۆ کۆێ دەچێو ئەرکی چییە لەم ژیانەدا؟، ئنجا ئەگەر تەماشای چەند ئایەتێك بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە قۆناغی سێیەمی کارەکەیدا چی کردوە؟ بۆ وێنە: لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٢٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾الكهف، خوا بە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: (نەفسی خۆت ڕابگرەو حەپسی بکە لە گەڵ ئەوانەدا کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بەیانیان وئێواران، واتە: بەندایەتیی بۆ پەروەردگاریان دەکەن، ئەوانە کێن؟ ئەوانەن کە بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتوونو عەقڵیان هۆشیار بۆتەوە و دڵیان بێدار بۆتەوە.

بەڵێ خوا (سبحانه وتعالى) بەپێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: ئەوانەی کە بەدەم بانگەوازەکەتەوە هاتوونو هۆشیاربوونەوە وبێدار بوونەوەو بڕیاریان داوە بەندەی خوا بنو بەو شێوەیە بژین کەخوا فەرمانی پێکردوون و خوا پێی خۆشە، نەفسی خۆتیان لە گەڵ حەپس

بکە، واتە: لەگەڵیان بە، ئەوانەی بەیانیان و ئێواران لەخوا دەپاڕێنەوە، واتە: لەهەموو کاتەکاندا بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، ئنجا ئایا ئامانجیان چییە؟ (يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ) تەنیا مەبەستیان ڕووی خوایە، واتە: دیداری ڕووی بێ وێنەی خوایە لە دوارۆژدا. یا خود مەبەستیان ڕەزامەندیی خوایە، چونکە (وَجْه): بە مانای (ڕوو) هاتوە کە سیفەتێکی خوایەو بەو شێوەیە کە بۆخوا شایستەیە، یاخود مەبەست پێی ڕەزامەندیی خوایە یان پاداشتی خوایە، بەو مانایەش هاتوە، (وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ) وە چاوت لە سەریان لا مەدە، واتە: هەمیشە چاوت لەسەریان بێ و بیانخە ژێر چاودێریی خۆتەوەو، ئاگات لێیان بێ و پەروەردەیان بکە، (تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا) چاوتیان لە سەرلامەدە بەتەمای جوانیی و زریق وبریقی دنیا بی، واتە بە هۆی سەر گەرم بوونت بە دنیاوە ئاگات لە هاوەڵەکانت نەبڕێ، لە پەروەردە کردن ولە مشورلێخواردن و تەزکیە کردنیان و فێرکردنیان (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا) وەبە دوای کەسێك مەکەوە کە دڵیمان بێئاگا کردوە لە یادی خۆمان، وەبەدوای ئارەزووی خۆی کەوتوە، وە کارەکەی تێپەڕیوە، واتە: حیسابی ڕۆیشتوە، لە بەر ئەوە کە ڕێیەکی چەوتی گرتوە، واتە بە هۆی ئەوانەوە کە دڵیانمان بێ ئاگا کردوە لە خۆمان و ئاگایان لە خواو لە خۆیان نیەو بە دوای ئارەزووی خۆیان کەوتوون، تۆ مەچۆ لە هاوەڵە ڕەش و ڕووتەکانت و هاوەڵە چەوسێنراوەکانت بێ ئاگابی، بەڵکو هەر لە گەڵ ئەوان بەو بیانخە ژێر چاودێریی خۆتەوە و پەروەردەیان بکەو تێیان بگەیەنەو پێیان بگەینە.

هەروەها چەند ئایەتێکی دیکە تیشکمان بۆ دەخەنە سەر ئەو قۆناغە، کە ئەو ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی (عبس)ن، کە خوای بەرزو مەزن بۆمان باسی ڕووداوێك دەكات‌و دەفەرموێ: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ۝٣ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ۝٤ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ۝٥ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ۝٦ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ۝٨ وَهُوَ يَخْشَىٰ ۝٩ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ۝١٠ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ۝١١ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ۝١٢﴾.

ڕۆژێك پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرگەرمی قسە كردن دەبێ بۆ كۆمەڵێك لە زلە زلانی قوڕەیش، كە ئەوان خۆیان پێ لەوە گەورەتربووە كە بێنە كۆڕو مەجلیسی پێغەمبەرەوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كە هاوەڵانی ڕەش وڕووت‌و سادەو چەوساوە لە دەوری كۆ دەبنەوە، گوتوویانە ئێمە لەوە بەرزترین بێینە مەجلیسی ئەوانەوە، پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرگەرمی قسە كردن بووە بۆ ئەوان، لەو كاتەدا (عبدالله)ی كوڕی (أم مكتوم) دێ بۆ خزمەتی، كە هاوەڵێكی نابینابووەو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)! هیچ ئایەتی تازەت بۆ نەهاتوون، یان وەحی تازەت بۆ نەهاتوون فێرم بكەی؟ پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕووی لێ وەردەچەرخێنێ‌و ڕووی لێ گرژ دەكات، بەو بۆنەوە ئەم ئایەتانە دێنە خوار[1] كە دەفەرموون:

بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، ڕووی خۆی گرژ كردو ڕووی خۆی وەرچەرخاند لەبەر ئەوەی كە كوێرەكە هات بۆلای. ئنجا تۆ چووزانی! دەبینی تەزكیە دەبوو، واتە: ئەو ئیمان‌و تەقوایەی هەیەتی زیادی

---

[1] رواه الترمذي: ٣٣٣١، والطبري في جامع البيان (٣٠/٣٢)، وأبو يعلى في المسند: ٤٨٤٨ وابن حبان في صحيحه: ١٧٦٩، وصححه مؤلف: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٣ ص٤٩٣.

دەكرد بەهۆی ئەو وەحییە تازەیەوە كەپێت ڕادەگەیاند. یاخود پەندی وەردەگرت‌و وپەند وەرگرتنەكە سوودی پێ دەگەیاند. بەڵام ئەوەی بێ نیازیی پێشان دەداو بێ منەتیی پێشان دەدا، تۆ خۆت ڕوو لەو دەكەی بەوەوە خەریك دەبی‌و سەرگەرمی دواندنی دەبی! ئنجا ئەو كابرا خۆ بە زلگرە كە ئامادە نیە بێتە مەجلیسی تۆوە، كاتێك كە ئەو مسوڵمانە ڕەش‌و ڕووتانەی تێیدان، ئەگەر هیدایەتیش وەرنەگرێ، تۆ چ زیانێك دەكەی، بۆچی تۆ شێوەی كاری خۆت‌و شێوازی خۆت دەگۆڕی بۆڕازی كردنی ئەو، بۆچی دڵی ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەڕەنجێنی بۆ ڕازیكردنی بابایەكی خۆبەزلگر، واتە: وامەكە بەڵام ئەو كەسەی بەپێی خۆی هاتوە، وە بەئامانج‌و مەبەستەوە هاتوە بۆلات وەلە خواش دەترسێ، تۆ خۆت لەوە بێ ئاگا دەكەی! نەخێر، جارێكی دیكە ئەوە دووبارە مەكەرەوە، یاخود ئەو (كَلا)یە بۆ بێ بڕوایانە، واتە: نەخێر ئەوەی ئێوە دەیڵێن، ڕاست نیە، بێگومان ئەم قورئانە هەمووی بیرخەرەوەیە، ئنجا هەركەسێك دەیەوێ با بێ ئەو حەقیقەتانەی بیر بكەونەوە كە لەفیترەت‌و سروشتیدا تێك هەڵكێشراون، وەحی ئەو حەقیقەتانەی بیر دەخاتەوە.

بەڵێ پێغەمبەرای خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەوجۆرەو بە گوێرەی ڕێنمایی یەكانی خوای كاربەجێ لە قورئاندا، سەرگەرمی تێگەیاندن‌و پێگەیاندنی هاوەڵە هەڵبژاردە دڵسۆزەكانی بوو.

**<u>قۆناغی چوارەم</u>: گەڕان بەدوای بنكەی جەماوەریی و پێگەی دەوڵەت دا:**

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كۆمەڵە مسوڵمانێكی هەڵبژاردەی تێگەیاندو پێگەیاندو پەروەردەكرد، وە زانی كە لە(مەككە) لەگەڵ خەڵكەكەدا گەیشتۆتە بنبەست (طريق مسدود)، دەستی كرد بە

گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوەی خەڵك و شوێنێك کە بۆی ببنە پێگەو بنکەی پەیام و بانگەوازەکەی، چونکە زانیویەتی کە ئەو پەیام و بەرنامەیەی بۆی نێرراوە بەبێ قەوارەی سیاسی، بەڕێوە ناچێ و قەوارەی سیاسییش پێویستی بە شەرعییەتی خەڵکی و زەمینیی هەیەو شەرعییەتی خوایی و ئاسمانیی بەس نیە بۆ بنیاتنانی.

(إبن هشام) لە ژێر ناوونیشانی: (**عَرْضُ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ نَفْسَهُ عَلَى الْقَبَائِلِ**)دا لە (إبن إسحاق)ەوە هێناویەتی: {**فَكَانَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَعْرِضُ نَفْسَهُ فِي الْمَوَاسِمِ إذَا كَانَتْ عَلَى قَبَائِلِ الْعَرَبِ يَدْعُوهُمْ إلَى اللّهِ وَيُخْبِرُهُمْ أَنّهُ نَبِيّ مُرْسَلٌ وَيَسْأَلُهُمْ أَنْ يُصَدّقُوهُ وَيَمْنَعُوهُ حَتّى يُبَيّنَ لَهُمْ مَا بَعَثَهُ اللّهُ بِهِ**}[1]. واتە: ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە بۆنەکانی حەجدا دەهات خۆی لەسەر هۆزەکانی عەرەب ڕادەنواند، بانگی دەکردن بۆ لای خوا، وە هەواڵی پێدەدان کە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، وە داوای لێدەکردن کە بەڕاستی بزانن و بەرگری لێ بکەن تاکو ئەوەی خوا پێیدا ناردوویەتی بۆیان ڕوون بکاتەوە.

هەروەها (إبن هشام) لەژێر ناوو نیشانی: (**بَدْءُ إسْلَامِ الْأَنْصَارِ**)دا، گوتوویەتی:

{**قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: فَلَمّا أَرَادَ اللّهُ عَزّ وَجَلّ إظْهَارَ دِينِهِ وَإِعْزَازَ نَبِيّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ وَإِنْجَازَ مَوْعِدِهِ لَهُ خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فِي الْمَوْسِمِ الّذِي لَقِيَهُ فِيهِ النّفَرُ مِنْ الْأَنْصَارِ، فَعَرَضَ نَفْسَهُ عَلَى قَبَائِلِ الْعَرَبِ، كَمَا كَانَ يَصْنَعُ فِي كُلّ مَوْسِمٍ، فَبَيْنَمَا هُوَ عِنْدَ الْعَقَبَةِ لَقِيَ رَهْطًا**

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢١٨.

**مِنْ الْخَزْرَجِ أَرَادَ اللّهُ بِهِمْ خَيْرًا ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: فَحَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ أَشْيَاخٍ مِنْ قَوْمِهِ قَالُوا: لَمّا لَقِيَهُمْ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ لَهُمْ: مَنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَفَرٌ مِنْ الْخَزْرَجِ}**[1].

واتە: ئیبنو ئیسحاق گوتوویەتی: ئنجا کاتێك خوای بەرزو زاڵ ویستی ئایینەکەی ئاشکرا بکاتو سەربخاتو پێغەمبەرەکەی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پشت ئەستوور بکاتو گفتی خۆی بۆ بەرێتە سەر، پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا کە حەجی تێدا دەکرا گەیشتە کۆمەڵێك لە ئەنصارییەکان، خۆی ڕانواند لەسەر هۆزەکانی عەرەب وەك هەمیشە وایدەکرد، ئنجا لە کاتێکدا کە لەلای عەقەبە بوو گەیشتە کۆمەڵێك لە خەزرەج، کە خوا ویستی خێریان بێنێتەڕێ... ئنجا لەگەڵیان دانیشتو بۆ لای خوای پایە بەرزو زاڵ بانگی کردن، وە ئیسلامی بۆ خستنە ڕوو و قورئانی بەسەردا خوێندنەوە...ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو بەڕاستیان زانیو ئەو ئیسلامەی لەسەری ڕانواندبوون لێیان وەرگرت... پاشان لەلای پێغەمبەری خواوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)) گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، دوای ئەوەی ئیمانیان هێناو مسوڵمان بوون.

ئیبنو ئیسحاق گوتوویەتی: وە وەك بۆم باسکراون ئەوانە شەشە کەس بوون لە هۆزی خەزرەج.

شایانی باسیشە مسوڵمانبوونی ئەو شەش کەسە لە ئەنصارییەکا زەمینە خۆشکەری پەیمانەکانی یەکەمو دووەمی عەقەبە بوو و، لەساڵی یازدەیەم (١١)ی پێغەمبەرایەتیش دا بووە، وە پەیمانەکانی یەکەمو دووەمی عەقەبەش لە ساڵەکانی: (١٢و١٣)دا بوون.

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٢.

**<u>قۆناغی پێنجەم</u>: بەستنی پەیمانی یەكەم و دووەمی عەقەبە لەگەڵ نوێنەرانی هەردووك هۆزی ئەوس و خەزرەجدا:**

١- بەستنی پەیمانی یەكەمی عەقەبە لەساڵی دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی دا:

(إبن هشام) لەو بارەوە گوتوویەتی: **{حَتَّى إذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ وَافَى الْمَوْسِمَ مِنْ الْأَنْصَارِ اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَلَقَوْهُ بِالْعَقَبَةِ، (قَالَ) وَهِيَ الْعَقَبَةُ الْأُولَى، فَبَايَعُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى بَيْعَةِ النِّسَاءِ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُفْتَرَضَ عَلَيْهِمْ الْحَرْبُ}**[١].

واتە: لە ساڵی داهاتوودا دوازدە پیاو لە ئەنصارییەكان لەكاتی حەجدا هاتن و لەلای عەقەبە پێیگەیشتن، دەڵێ: ئەوە پەیمانی یەكەمی عەقەبە بوو، وە بەگوێرەی پەیمانی ئافرەتان پەیمانیان بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دا، ئەویش پێش ئەوەبوو كە جەنگیان لەسەر پێویست بكرێ.

ئنجا لەبارەی نێوەڕۆك و بڕگەكانی ئەو پەیمانەوە با گوێ بۆیەكێك لە بەشدار بووانی بگرین كە (عبادة بن صامت)ە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: **{بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ الْأُولَى عَلَى أَنْ لَا نُشْرِكَ بِاَللَّهِ شَيْئًا، وَلَا نَسْرِقَ وَلَا نَزْنِيَ وَلَا نَقْتُلَ أَوْلَادَنَا، وَلَا نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ مِنْ بَيْنِ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا وَلَا نَعْصِيَهُ فِي مَعْرُوفٍ فَإِنْ وَفَيْتُمْ فَلَكُمْ الْجَنَّةُ، وَإِنْ غَشِيتُمْ مِنْ ذَلِكَ (شَيْئًا) فَأُخِذْتُمْ بِحَدِّهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَإِنْ سُتِرْتُمْ عَلَيْهِ إلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَأَمْرُكُمْ إلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إنْ شَاءَ عَذَّبَ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ}**[٢].

[١] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٢٢.
[٢] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٢٣.

واتە: شەوی یەکەمی عەقەبە پەیمانمان بە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دا کە: هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی خوا، وە دزیی نەکەین، وە زینا نەکەین، وە منداڵەکانمان نەکوژین، وە هیچ بوختانێك لەنێوان دەست و پێیەکانماندا هەڵنەبەستین، وە لەشتی باش و پەسندا سەرپێچیی لێنەکەین (فەرمووی:)، ئەگەر وەفادارو پابەند بوون بەهەشتتان هەیە، وە ئەگەر تووشی بەشێك لەوانە بوون، وە لەدنیادا لەسەری سزادران ئەوە مایەی سڕینەوەیەتی، بەڵام ئەگەر هەتا قیامەت بۆتان پۆشرا، ئەوە بەدەست خوای زاڵ و پایەدارەو، ئەگەر ویستی سزا دەدات، وە ئەگەر ویستیشی دەبووری.

شایانی باسیشە بۆیە ئەم جۆرە پەیمانەی یەکەمی عەقەبە ناونراوە پەیمانی ژنانە (بيعة النساء) چونکە باسی جەنگ و کوشتاری تێدا نیە کە تەنیا لەسەر پیاوان فەرزە، وە هەمان پەیمانیش کە لەسووڕەتی (الممتحنة)دا باسکراوەو لە ژنان وەرگیراوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة.

٢- پەیمانی دووەمی عەقەبە: پەیمانی دووەم، کە ئەویش هەر لە عەقەبە بەستراوە، بەڕاستیی هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو لە لایەن پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەیەوە کە پەیمانیان پێدا، واتە: مسوڵمان بوون و پەیمانیان پێدا کە لە گەڵیدا هاوکارو دەسبارگربن بۆ پێکهێنانی قەوارەی سیاسی، لە شاری (يثرب) کە دواتر ناوی دەبێتە

(مدينة الرسول) شاری پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، ئەو پەیمانەش لە سەرچاوەکانی سیرەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا بە چەند ڕیوایەتێك هاتوە، کە ئەمە یەکێکیانەو (جابر بن عبدالله) دەیگێڕێتەوە کە ئامادەی بەستنی ئەو پەیمانە بووە:

{عَنْ جَابِرٍ قَالَ مَكَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ يَتْبَعُ النَّاسَ فِي مَنَازِلِهِمْ بِعُكَاظٍ وَمَجَنَّةَ وَفِي الْمَوَاسِمِ بِمِنًى يَقُولُ مَنْ يُؤْوِينِي مَنْ يَنْصُرُنِي حَتَّى أُبَلِّغَ رِسَالَةَ رَبِّي وَلَهُ الْجَنَّةُ، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيَخْرُجُ مِنْ الْيَمَنِ أَوْ مِنْ مُضَرَ كَذَا قَالَ فَيَأْتِيهِ قَوْمُهُ فَيَقُولُونَ احْذَرْ غُلَامَ قُرَيْشٍ لَا يَفْتِنُكَ وَيَمْشِي بَيْنَ رِجَالِهِمْ وَهُمْ يُشِيرُونَ إِلَيْهِ بِالْأَصَابِعِ، حَتَّى بَعَثَنَا اللَّهُ إِلَيْهِ مِنْ يَثْرِبَ فَآوَيْنَاهُ وَصَدَّقْنَاهُ فَيَخْرُجُ الرَّجُلُ مِنَّا فَيُؤْمِنُ بِهِ وَيُقْرِئُهُ الْقُرْآنَ فَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ فَيُسْلِمُونَ بِإِسْلَامِهِ، حَتَّى لَمْ يَبْقَ دَارٌ مِنْ دُورِ الْأَنْصَارِ إِلَّا وَفِيهَا رَهْطٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ يُظْهِرُونَ الْإِسْلَامَ ثُمَّ ائْتَمَرُوا جَمِيعًا فَقُلْنَا: حَتَّى مَتَى نَتْرُكُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُطْرَدُ فِي جِبَالِ مَكَّةَ وَيَخَافُ، فَرَحَلَ إِلَيْهِ مِنَّا سَبْعُونَ رَجُلًا حَتَّى قَدِمُوا عَلَيْهِ فِي الْمَوْسِمِ فَوَاعَدْنَاهُ شِعْبَ الْعَقَبَةِ فَاجْتَمَعْنَا عَلَيْهِ مِنْ رَجُلٍ وَرَجُلَيْنِ حَتَّى تَوَافَيْنَا فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نُبَايِعُكَ قَالَ: تُبَايِعُونِي عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي النَّشَاطِ وَالْكَسَلِ وَالنَّفَقَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ وَعَلَى الْأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنْ الْمُنْكَرِ وَأَنْ تَقُولُوا فِي اللَّهِ لَا تَخَافُونَ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ وَعَلَى أَنْ تَنْصُرُونِي فَتَمْنَعُونِي إِذَا قَدِمْتُ عَلَيْكُمْ مِمَّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ أَنْفُسَكُمْ وَأَزْوَاجَكُمْ وَأَبْنَاءَكُمْ، وَلَكُمْ الْجَنَّةُ، قَالَ: فَقُمْنَا إِلَيْهِ فَبَايَعْنَاهُ}[1].

---

[1] بڕوانە: مسند الإمام أحمد، رقم الحديث: ١٤٤٥٦، وإسناده صحيح على شرط مسلم المحقق: شعيب الأرناؤوط وآخرون، ط٢ ١٤٢٠هـ- ١٩٩٩م.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دە (١٠) ساڵان لە مەککە مایەوە، شوێن خەڵکی دەکەوت لە مەنزڵگایەکانیان دا لە عوکاظ و مەجەننە وە لەکاتی حەجدا لە مینا، دەیفەرموو: ((کێ دەمگرێتە خۆیو پشتم دەگرێ، تاکو پەیامی پەروەردگارم بگەیەنمو لە بەرانبەردا بەهەشتی هەبێ؟))

هەتا پیاوی وا هەبوو لە یەمەن یان لە موضەڕ دەردەچوو گەلەکەی دەهاتنە لای پێیان دەگوت: وریای گەنجەکەی قورەیش بە فریوت نەدات! وە (پێغەمبەر) بەنێو پیاوەکانیاندا ڕەت دەبوو بە پەنجەکانیان ئاماژەیان بۆ دەکرد.

هەتا خوا ئێمەی لە (یثرب)ەوە نارده لا، ئیدی ئێمە پشتمان گرتو بڕوامان پێهێنا، پیاوێك لە ئێمە بۆ لای دەچوو بڕوای پێدەهێناو ئەویش قورئانی فێر دەکرد، ئیدی دەگەڕایەوە لای کەسو کاریو بەهۆی مسوڵمانبوونی ویەوە ئەوانیش مسوڵمان دەبوون، هەتا وای لێهات گەڕەكو بنەماڵەیەك لە هی پشتیوانەکان نەما کە کۆمەڵێك مسوڵمانیان لەنێودا نەبنو مسوڵمانەتیی خۆیان ئاشکرا کرد.

پاشان لەنێو خۆیان دا کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد (واتە: پشتیوانەکان) وە گوتمان: هەتاکەی واز لە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بێنین لە شاخو داخەکانی مەککە دەربکرێو بترسێنرێ! ئیدی ئەوەبوو حەفتا پیاو لە ئێمە بەرەو لای کەوتنە ڕێ هەتا لە کاتی حەج دا لەلای شیوی عەقەبە بەڵێنگەمان داناو، یەك یەكو دوو دوو لەلای کۆبووینەوە، گوتمان:

ئەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پەیمانت پێ دەدەین، فەرمووی: پەیمانم پێدەدەن لەسەر:

١- گوێ بۆگرتن‌و بەقسەکردن لەکاتی چالاکیی‌و تەمبەڵیی دا.
٢- وە بەخشین لە کاتی تەنگدەستیی‌و فەرەحنایی دا.
٣- وە لەسەر فەرمان بەچاکە کردن‌و ڕێ لە خراپە گرتن.
٤- وە کە لە پێناوی خوادا هەق بڵێن‌و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسن.
٥- وە کە پشتم بگرن‌و سەرم بخەن کە هاتمە نێوتان لە هەرشتێك کە خۆتان‌و هاوسەرانتان‌و کوڕەکانتانی لێ دەپارێزن.

وە لەبەرانبەریش دا بەهەشتتان دەبێ.

دەڵێ: ئێمەش هەڵساین‌و پەیمانمان لەگەڵ بەست.

ئەگەر تەماشا بکەین ئەم پێنج مەرجە کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە سەر ئەوهاوەڵە بەڕێزانە دایانـدەنێ، لە ڕاستیدا هەر پێنجیان پێویستن بۆ هەر کۆمەڵگاو کۆمەڵێکی توندوتۆڵ کە بیەوێت واقیع بگۆڕێ:

١- گوێ بۆ گرتن و بە قسەکردن لەکاتی پێ خۆشبوون وپێ ناخۆشبووندا، ئەو خەڵکە دەبێت گوێ بگرن بۆ قیادەی خۆیان وە بە قسەشی بکەن، دیارە لەسنووری شەرعدا .
٢- وە پاشان ماڵ سەرف کردن، هەر ئەوەندە بەس نیە کە تۆ گوێ بگری‌و بەقسە بکەی، بەڵکو دەبێ ماڵیش ببەخشی، ئەو ماڵ بەخشینەش لە کاتی هەرزانیی و لەکاتی گرانییدا، لە کاتی نارەحەتیی و لەکاتی فەرەحانییدا.
٣- وە پاشان فەرمان بەچاکەوڕێگریی کردن لە خراپە، دەبێ هەر کامێکیان ئەندامێکی گورج وگۆڵ بێت بۆ پاکسازیی کردنی کۆمەڵگەی خۆی لە ناشەرعییەکان، وە ڕازاندنەوەی بەئاکاری شەرعیی وپەسەند.
٤- وەپاشان حەقبێژیی ونەترسان لە لۆمەی لۆمەکاران.

٥- وە پاشان پێنجەمیان بەرگریی کردن لە پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەسەرخستن وپاراستنی لە هەرشتێك کە تۆ خۆت و ماڵ ومنداڵی خۆتی لێ دەپارێزی، هەر پێنجیان پێویستن، چونکە بەبێ بوونی هەر کام لەم پێنج مەرجە، کاری هەرەوەزیی و بەکۆمەڵ ناکرێ.

شایانی باسیشە ئەو حەفتاو پێنج (٧٥) کەسە نوێنەری سەرجەم ئەو خەڵکە مسوڵمانە بوون، کە هەر لەدوای دیداری پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەگەڵ شەش کەسەکەدا لە (یثرب)دا پەیدابوون، نەك لە دوای پەیمانی یەکەمی عەقەبەشەوە، هەر لەو کاتەوە خەڵکێکی زۆر مسوڵمان بووە وئێمە پێشتر باسمان کرد کە یەکێك لە ڕاوییەکان دەڵێ: **(فلم يبق دار من دور الأنصار الاّ ودخلها الإسلام)** واتە هیچ گەڕەك وبنەماڵەیەکی ئەنصاریی نەمابوو کە ئیسلامی نەچووبێتە نێو، وەك خوای پەروەردگاریش ئاماژە بەوە دەکات و دەفەرموێ: { وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ }الحشر٩، واتە: وە ئەوانەی کە پێش کۆچکەران مەنزڵگایان بۆ ئیمان ساز کردبوو..

ئنجا من لێرەدا مەبەستم لە باسکردنی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە زانایانی ئیسلام بنچینەیەکیان داناوە دەڵێ: فەرزی عەین ئینسان دەبێ خۆی پێی هەڵسێ، ئەوجار لەسەری لادەچێ، وەك: (نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) بەڵام فەرزی کیفایە هەیە ئەوەیە کە ئەگەر کۆمەڵێك لەنێو مسوڵماناندا بایی ئەوەندە کە پێیان ئەنجام بدرێ، پێی هەڵستان، لەسەر ئەوانی دیکەش لادەچێ، بەڵێ ئەرکەکانی ئیسلام بەگشتی دەبنە دووبەش: بەشێکیان (الواجبات العينية)ن واتە: لەسەر تاك تاکی مسوڵمانان پێویستە پێیان هەڵسن و هەرکامێکیان دەبێ لە زاتی خۆیدا

ئەو فەرزە ئەنجام بدات، ئەوجار لەسەری لادەچێ، بەشێکی دیکەی ئەو فەرزانە کە زۆرترینیانن، بریتین لە (الواجبات الكفائية) ئەمانیش ئەوانەن کە دەبێت هەندێك لە جیاتی هەمووان پێیان هەڵسن، ئنجا دیارە نەدەگونجا کە مسوڵمانانی (يثرب) هەموویان بێن بۆلای پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەم کەشف دەبوون، وە هەم ناشگونجێ ئەو خەڵکە هەمووی بێت، وە هەمووشیان ڕەنگە لە ئاستی ئەوەدا نەبووبن کە بێن پەیمان لەگەڵ پێغەمبەردا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ببەستن.

*چۆنیەتی ئەو پەیمان بەستنە*

ئنجا با تەماشا بکەین شێوازی ئەو پەیمان بەستنە چۆن بووە؟ (كعب بن مالك) (خوای لێ ڕازی بێ) کە یەکێکە لە بەشداربووانی ئەو پەیمانە لەو بارەوە دەڵێت: {**قَالَ فَنِمْنَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ مَعَ قَوْمِنَا فِي رِحَالِنَا، حَتَّى إِذَا مَضَى ثُلُثُ اللَّيْلِ خَرَجْنَا مِنْ رِحَالِنَا لِمِيعَادِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَتَسَلَّلُ تَسَلُّلَ الْقَطَا[1] مُسْتَخْفِينَ حَتَّى اجْتَمَعْنَا فِي الشِّعْبِ[2] عِنْدَ الْعَقَبَةِ، وَنَحْنُ ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ رَجُلًا، وَمَعَنَا امْرَأَتَانِ مِنْ نِسَائِنَا: نُسَيْبَةُ بِنْتُ كَعْبٍ أُمّ عُمَارَةَ إحْدَى نِسَاءِ بَنِي مَازِنِ بْنِ النَّجَّارِ، وَأَسْمَاءُ بِنْتُ عَمْرٍو**}[3].

دیارە پێشتر ئەنصارییەکان مسوڵمان بوون، بەڵام لەوکاتەدا پەیمانی پێ دەدەن، پەیمانی پێ نادەن کە مسوڵمان بن، چونکە پێشتر مسوڵمان بوو ون هەر لە مەدینە مسوڵمان بوون لە دوای پەیمانی یەکەمی عەقەبەوە، بگرە ڕەنگە پێشتریش مسوڵمان بووبن، هەر لەوکاتەوە کە (مصعب بن

---

[1] القطا: ضرب من الحمام، الواحدة: قطاة. المصباح المنير: للفيومي، ص٣٦٣.

[2] الشّعب: إنفراج بين الجَبَلَين، ج: شعاب. المعجم الوسيط: ص ٤٨٣.

[3] السيرة النبوية لابن هشام. ج٢ص ٢٢٨ ط ٢٠٠٦. دار ابن الهيثم.

عمیر) (خوای لێ ڕازی بێ) چووە بۆ مەدینە، بەڵام ئەوە کارێکی گەورەی دیکەیە پێی هەڵدەستن، کە بریتیە لە بنیاتنانی قەوارەی سیاسی.

کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: ئەو شەوە خەوتین لەلای بارەکانی خۆمان لە گەڵ گەلەکەی خۆماندا، (واتە: لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە نامسوڵمانەو لە(یثرب)ەوە هاتوون بۆ حەج، چونکە موشریکەکان حەجیان دەکرد) هەتا سێیەکی شەو تێپەڕی، دواتر ئێمە لە مەنزڵگاکانی خۆمانەوە بەرەو بەڵێنگاکە ڕۆیشتین، {واتە: ئەو شوێنەی کە بەڵێنمان دابوو لێی کۆببینەوە لەگەڵ پێغەمبەردا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)}، وە ڕۆیشتین بە پەنامەکیی‌و ئەسپایی وەك ڕۆیشتنی کۆتر (کە زۆر نەرم دەڕوات، یانی بە جۆرێك ڕۆیشتین کە هیچ کەس هەستمان پێ نەکات و دەنگی پێمان نەیەت) هەتاکو لەلای دالآنی نزیك عەقەبە کۆبووینەوە لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وە ئێمە حەفتاو سێ پیاو بووین‌و دوو ژنیشمان لە ئافرەتانمان لەگەڵ بوون: نوسەیبەی کچی کەعب (أم عمارة)، وە ئەسمائی کچی عەمر.

کەواتە: کە (جابر بن عبدالله) دەڵێت (٧٠) کەس بووین، ئەوە بە شێوەی نیزیکخستنەوە گوتوویەتی، ئەگەرنا بە وردیی (٧٣) پیاو و (٢) ئافرەت) بوون، هەڵبەتە لێرەشدا ئەوە وەردەگیرێ کە ئافرەتان لە هەموو قۆناغەکانی کاری ئیسلامیی دا بەشدار بوون، هەروەك چۆن لە قۆناغی مەککەدا یەکەمین شەهید ئافرەت بووە: (سُمَيَّة)ی خێزانی (یاسر) دایکی (عمّار)، لەو ڕووداوە گرنگەشدا بەشدارن، لە هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەتدا، چونکە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو پەیمانە کەپێی دەدەن، وەك گوتم پەیمانی ئیمان پێهێنان نیە، چونکە پێشتر زانیویانە

کە پێغەمبەری خوایە، بەڵکو پەیمانی هەڵبژاردنیەتی بە سەرۆکی دەوڵەت وولات.

*چەند هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر پەیمانی دووەمی عەقەبەدا*

١) هەڵوەستەی یەکەممان لەبەرانبەر قسەیەکی (عبادە بن الصامت)ە (خوا لێی ڕازی بێ) کە ئەویش یەکێکە لە بەشداربووانی پەیمانەکە، کە دەڵێت: **(بايَعْنا رسولَ الله بيعةَ الحرب)**[1] واتە: پەیمانمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەست، بە پەیمان بەستنی جەنگ، ئنجا ئایا بۆچی ناوی لێناوە پەیمان بەستنی جەنگ؟ چونکە بە پێی بەندەکانی ئەو پەیمانە، زانیویانە کە لەمەودوا دەبێ ئامادە بن کە بەسەرو ماڵ دیفاع لە ئیسلام و پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بکەن.

٢) پێویستە هەڵوەستەیەکی دیکە بکەین لە بەردەم قسەکانی (أسعد بن زرارة)دا کە وەك گوتراوە: (وكان من أحدثهم سناً) لە هەموویان گەنجتر، یاخود یەکێك بووە لەوانەی لە هەمووان گەنج تر بووە، بەڵێ جاری وا هەیە قسەیەکی زۆر چاك، یان هەڵوێستێکی زۆر جوامێرانە پەکی لە سەر گەنجێك دەکەوێ.

ئەو گەنجە مسوڵمانە قسەیەکی زۆر حەکیمانەو دووربینانە دەکات، کە بەڕاستی بۆ ئێمە جێی پەند لێوەرگرتنن، دەڵێ: **(رُوَيْدًا يَا أَهْلَ يَثْرِبَ فَإِنَّا لَمْ نَضْرِبْ أَكْبَادَ الْإِبِلِ إِلَّا وَنَحْنُ نَعْلَمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِنَّ إِخْرَاجَهُ الْيَوْمَ مُفَارَقَةُ الْعَرَبِ كَافَّةً وَقَتْلُ خِيَارِكُمْ وَأَنَّ تَعَضَّكُمْ السُّيُوفُ، فَإِمَّا أَنْتُمْ قَوْمٌ تَصْبِرُونَ عَلَى ذَلِكَ وَأَجْرُكُمْ عَلَى اللَّهِ، وَإِمَّا أَنْتُمْ**

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٣٥، دار ابن الهيثم ط: ٢٠٠٦.

قَوْمٌ تَخَافُونَ مِنْ أَنْفُسِكُمْ جَبِينَةً فَبَيِّنُوا ذَلِكَ فَهُوَ عُذْرٌ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ، قَالُوا أَمِطْ عَنَّا يَا أَسْعَدُ فَوَاللَّهِ لاَ نَدَعُ هَذِهِ الْبَيْعَةَ أَبَداً...)[1]

بەڵێ ئەم هەڵوێستەی (أسعد بن زرارة) زۆر شتی لێ وەردەگیرێ، کە لە گەرمەی قساندا دەڵێت: ڕاوەستن ئەی خەڵکی (یثرب)! ئێمە سواری حوشتر نەبووین، واتەخۆمان ئەزیەت نەداوە لە (یثرب)ەوە هاتووین پەیمانی لەگەڵ ببەستین، مەگەر لەبەر ئەوەی دەزانین کە پێغەمبەری خوایە، وە ئێمە دەزانین ئەمڕۆ ئەگەر لە شاری خۆی بیهێنینە دەر و ببیەین بۆلای خۆمان، ئەوە مانای وایە کە لە تێکڕای عەرەب جیا دەبینەوە، {واتە: ئێمە دەبینە بەرەیەك لە بەرانبەر هەموو عەرەبدا} وە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی پیاوە ئازاو چاکەکانمان بکوژرێن، و دەبێتەهۆی ئەوە کە شمشێر بمانگەزێ، جا یان ئەوەتا ئێوە ئارام دەگرن لەسەر ئەو ناڕەحەتییانەی کە دێتە ڕێتان بەهۆی ئەوپەیمانەوە، ئەوەپاداشتتان لەسەر خوایەو بەردەوام بن، یاخود ئەگەر دەترسن دوایی ترسێك بچێتە دڵتانەوە و پاشەکشەبکەن، ئەوە ئێستا ڕوونی بکەنەوە، چونکە بۆلای خواتان ئەوەباشترە، کە لەئێستاوە پەیمانی پێ نەدەن (نەك پەیمانی پێ بدەن و دواتر پاشەکشە بکەن و بە گورگان خواردووی بدەن) خەڵکەکە گوتیان: ئەی ئەسعەد! دەستت لادەو خۆت دوور بخەرەوە، (واتە: ڕێمان بکە، چونکە وا دیارە دەستی بەدەستی پێغەمبەری خواوە بووە) ئێمە هەرگیز ئەم پەیمانە واز لێ ناهێنین، (واتە: ئێمە بە هەرچی بۆمان تەواوبووبێ ئەم پەیمانە لەگەڵ

---

[1] بڕوانە: مسند الإمام أحمد بن حنبل-ج٢٢-ص٣٤٩- المحقق : شعيب الأرنؤوط وآخرون- الناشر : مؤسسة الرسالة- الطبعة : الثانية ١٤٢٠هـ ، ١٩٩٩م.

پێغەمبەری خوادا(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەبەستین، ئەگەر سەروماڵیشمان تێدا فیدا کردوە).

بەڵێ هەرکەسێك بیەوێ پەیمانێك بەرێتە سەر، ئەو پەیمانە لە سەر بناغەیەکی کۆنکرێتی دەبەستێ، واتە: ئەگەر ئینسان بیەوێ بەڵێنێك بەرێتە سەر، پێش ئەوەی بەڵێنەکە بدات سەد جار بیر دەکاتەوە، بەڵام کەسێك گوێ بە پەیمان وبەڵێن نەدات، باکی نیە چ پەیمانێك دەداتو چ بەڵێنێك دەدات، چونکە بە تەما نیە بیباتەسەر، بەڵێ ئەو هاوەڵە بەرێزانە زانیویانە لەگەڵ کێ مامەڵە دەکەن، پێش پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پەروەردگاریان بینیوە، ئەوەتا (أسعد بن زرارة) دەڵێ: (**فَهُوَ عُذْرٌ لَكُمْ عِنْدَ اللّه**) ئەگەر لە خۆتان ڕانابینن‌و دەترسن دوایی ترس بچێتە دڵتانەوەو پاشەکشە بکەن، ئەوەزیاتر عوزری تێدایە بۆ لای خواتان، کە هەر لە سەرەتاوە پەیمانی لە گەڵ نەبەستن، زانیویانە کە ئەوە مامەڵە کردنە لەگەڵ خوادا (سبحانه وتعالى)، ئنجا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وە بە تەماش بوون پەیمانەکە بەرنەسەرو کاری پێ بکەن، بۆیە زۆر هەڵوەستەیان تێدا کردوە و پەلەیان تێدا نەکردوە.

٣) ئنجا قسەکەی (أبوالهیثم) دەکەینە جێی هەڵوەستە، کە دەڵێ: (**يا رسول الله! إن بيننا وبين الرجال حبالاً، وإنا قاطعوها -يَعني اليهود- فهل عسيت إن نحن فعلنا ذلك ثم أظهرك الله، أن ترجع الى قومك وتدعنا؟ قال: فتبسَّم رسولُ الله صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثم قال: بل الدَّمُ الدم والهَدْمُ الهدم، أنا منكم وأنتم مني، أُحارِب من حاربتم وأُسالِمُ مَنْ سالمتم**)[1].

[1] السيرة النبوية لابن هشام – ج٢ ص٢٢٨، ط٢٠٠٦/ دار إبن الهيثم.

واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) لـە نێـوان ئێمـە و پیاوانێکـدا -کـە مەبەسـت پێـی جوولەکەکانـە- پـەیمان وبـەڵێن هـەن کـە پێشتر بوومانـە، وەبـە هـۆی ئـەو مسـوڵمان بوونەمانـەوە، لەگـەڵ ئـەوان پەیوەندییمان دەپچڕێ (بێ ئـەوەی ئـەوان پـەیمان بشکێنن، بـەڵکو هـەر جوولەکـەکان لێیـان قبـووڵ ناکـەن و بـە تەبیعـەت دەپچڕێ)، جـا ئایـا چـاوەڕێ دەکـرێ کـە ئێمـە وامـان کـردو دوایـی خـوا تـۆی سەرخسـت، بگەڕێیەوە بـۆلای قەومەکـەت و بچیتەوە بـۆ مەککەو ئێمـە واز لێبێنی (وە بمێنیتـەوە ئێمـەو جوولەکـەکان و سـەرەنجام ئـەوانیش تۆڵـەمان لـێ بستێننەوە؟).

پێغەمبـەر (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَلّمَ) یـش زەردەخەنـەی هـاتێ، (هەڵبەتـە زەردەخەنەکـە ئەوەیـە کـە سەرسـام بـووە بـە عـەقڵ ودووربینیـی (أبـوالهیثم)، وەپاشـانیش دیـارە قسـەکەی پـێ خـۆش بـووە، وە دواتـریش زەردەخەنەکە ئەوە دەگەیەنێ کە شتی وا لە پێغەمبەر (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَلّمَ) ناوەشێتەوە، چونکە زەردەخەنـە جاری واهەیـە چەند مانایـەکی هەیە، بەڵێ، لە پێغەمبـەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) ناوەشـێتەوە کـە ئێستا کەسانێك بە سـەروماڵ فیـداکاریی لـە پێنـاو پەیامەکەیـدا بکـەن، کەچی ئـەویش بـە جێیـان بهێڵـێ) بۆیـە دەفـەرموێ: (بـەڵکو خـوێنم لـە گـەڵ خوێنتانەو، مردنم لە گەڵ مردنتانە، من لە ئێوەم وئێوەش لەمنن، شـەڕ لە گەڵ کەسێکدا دەکـەم کـە شـەڕتان لەگـەڵ بکـات، وە لەگـەڵ کەسێکدا ئاشتیی دەکەم کە ئێوە ئاشتیی لە گەڵدا دەکەن.

٤) هەڵوەسـتەیەکی دیکـە: کـە ئـەوەش دیسـان وردەکـاریی ئیشـی پێغەمبـەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) مان بۆ دەردەخات، کە پێغەمبەری خـوا (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْهِ وَسَـلّمَ) زۆر وردەکـاریی و کارامـەیی بـەکارهێناوە لـە ئیشـی خۆیـدا:

(كعب بن مالك) دەڵێت: **(وقد قال رسول الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: أخرجوا إليَّ مِنْكُم اثْنَي عَشَرَ نَقِيباً لِيَكُونُوا عَلَى قَومهم بما فِيهم. فأخرجوا منهم اثني عَشَرَ نقيباً، تسعة من الخزرج وثلاثة من الأوس)**،[1] واته: وه پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: دوازده (١٢) کەسم لە نێو خۆتاندا بۆ هەڵبژێرن وەك مشوورخۆر، بۆئەوەی بەسەر خەڵكەكانی خۆیانەوە سەرپەرشتیاربن و ئاگایان لێیان بێ و مشووریان بخۆن، ئیدی (١٢) نەقیبیان هەڵبژاردن، ("نقیب" دیارە زاراوەیەك بووە بەمانای مشورخۆر و كاربەدەست و بەرپرس)، نۆ (٩) كەسیان لە خەزرەج و سێ (٣)شیان لە ئەوس، لە بەر ئەوەی هۆزی خەزرەجییەكان زیاتر بوون، دیارەپشكی زیاتریان دراوەتێ، وە هۆزی ئەوس كەمتر بوون كەمتریان پێ براوە.

دیارە ئەمەش چەند شتێكی لێ وەردەگیرێن:

أ- مەسەلەی هەڵبژاردن (إنتخاب)، شتێكی ریشەییە لە ئیسلامدا، واتە: هەڵبژاردنی بەرپرسان و مشوورخۆران، دیارە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەیتوانی بفەرموێ: فلان و فلان و فلان ئێوە نەقیبی ئەو خەڵكەن، بەلام ئەوەی گێڕاوەتەوە بۆ خۆیان: **(أخرجوا إلَيَّ منكم اثني عشر نقيباً كي يكونوا على قومهم بمافيهم)** لە نێوان خۆتاندا (١٢) نەقیبم بۆ دیاریی بكەن، تاكو هەركامێك لەو نەقیبانەسەرپەرشتی ئەو كۆمەڵەی خۆی بكات.

ب- وە ئەوەشی لێوەردەگیرێ كە دەستەڵات (سلطة) دەگەڕێتەوە بۆخەڵك، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پارێزراو (معصوم)ە

---

[1] - السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ص٢٢٩، والمعجم الكبير للطبراني، ١٧٤، وتأريخ الإسلام، للذهبي، (٨٥/١)، وعيون الأثر، لابن سيد الناس(٢٧١/١).

لە هەڵە، بەڵام ئەو مافە بە خۆی نادات خۆی دیارییان بکات، چونکە خۆیـان باشـتر یەكـدی دەناسـن، بـا بۆخۆیـان بـەرپرس و مشـوور خۆرەكانی خۆیان دیاریی بكەن، بەڵێ جارێ هەر لەو سەرەتایەوە كە كـاری ئیسـلامیی لـە سـەرەتادا بـووە و هێشـتا دەوڵـەت دانەمـەزراوە، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) كاری بـە هەڵبـژاردن بـووەو ویستوویەتی كە دەستەڵات (سلطة) بگێڕێتـەوە بـۆ خـەڵك، ئایا چی بكەن وچۆن بكەن و كێ و كێ بەبەرپرس و مشوور خۆر دابنـێین؟ ئایا چـی حەڵاڵـەو چـی حەرامـە؟، بێگومـان ئـەوە خـوا دیـاریی دەكـاتو حوكمڕانێتی یاسادانان (الحاكمية التشريعية) هی خوای پـەروەردگارە، بەڵام حاكمیەتی سیاسیی(الحاكمية السياسية): كێ بەرپرس و مشوور خۆر بێ؟ دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی و پاشانیش بۆ خەڵك.

ج- وە بۆیەش پێغەمبەر (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) وایكردوە، چونكە هـەر عەقڵو فیتڕەتـیش وا دەخـوازن كـە تـۆ ئەگـەر بتـەوێ ئیشت ڕێـك و پێك بێ، دەبێ سەرێكی هەبێو بزانرێ: كێ پرس بە كێ دەكات؟ خۆ نـابێ هـەر كـەس ڕاسـت بـووەوە بـەرپرس بـێ، وەك بۆخۆشـی دەیگێڕمـەوە: جارێـك ئێمـە سـەردانی یـەكێك لـە بنكـەی لایەنـە عەلمانییەكانمان كرد، ئەو كاتەی كە لە (قەڵاتووكان) بووین، سڵاومان لێكردنو گوتم كێ بەرپرستانە؟ گوتیان: كەس، گوتم جا چۆن دەبـێ؟ گوتیان: هەمووومان بەرپرسین! منیش زەردەخەنەیـەكم كـردو گـوتم: نابێت، چونكە خـوا هـیچ شـتێكی دروسـت نـەكردوە سـەرێكی نـەبێ، پاشان گوتم: ئەگەر من ئێستا هەندێك پرسیارم هەبێت چۆن وەڵـامم دەدەنەوە؟ خۆ بەگەڕە لاوژێ وەڵامم نادەنەوەو كۆڕس نیە هەمووتان پێكـەوە قسـە بكـەن، دەبـێ یـەكێكتان قسـە بكـات، وە گـوتم: ئەگـەر

بتانەوێ لەم ژووره بچنه دەرەوە، خۆ دەبێت یەکێکتان پێش بکەوێ، دەنا (عاسێ) دەبن!!.

د- لەڕاستییدا هەبوونی ڕێك وپێكیی و (نظم) عەقڵ دەیخوازێ، بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چاوەڕێی ئەوە نەبووە خوا ئایەتێك بنێرێتە خوارێو بفەرموێ: (١٢) کەسیان لێ جیا بکەرەوەو وەك نەقیب لێیان هەڵبژێرە، بەڵکو هەر بە عەقڵ و ئەزموونی خۆی زانیویەتی کە ئەگەر وانەبێ ئیشەکە بەڕێوە ناچێ.

٥) ئنجا هەڵوەستەیەکی دیکە لە بەرانبەر وەڵامی پێغەمبەری خوادا بۆ قسەکەی (العباس بن نضلة): **(فقَالَ رسول الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ: ارفضُّوا إلى رحالكم. فَقَالَ لَهُ الْعَبّاسُ بْنُ عُبَادَةَ بْنِ نَضْلَةَ: وَاَللّهِ الّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ إنْ شِئْتَ لَنَمِيلَنّ عَلَى أَهْلِ مِنى غَدًا بِأَسْيَافِنَا؟ قَالَ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: لَمْ نُؤْمَرْ بِذَلِكَ، وَلَكِنْ ارْجِعُوا إلَى رِحَالِكُمْ، قَالَ فَرَجَعْنَا إلَى مَضَاجِعِنَا، فَنِمْنَا عَلَيْهَا حَتّى أَصْبَحْنَا).**[1]

(كعب بن مالك) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ مەنزڵەکانی خۆتان {(رَحْل) کۆیەکەی (رحال)ە، بەو بارە دەگوترێ کە دەخرێتە سەر پشتی وڵاخ، دوایی بەو مەنزڵگایە دەگوترێ کە هەرکەسێك لەوانە لێی دابەزیوە} (عبّاس بن نضلة) پێی گوت: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەر! (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەگەر بتەوێ بەیانی بە شمشێرەکانمان بەسەر خەڵکی (مینا) دا دەدەین، {چونکە موشریکەکان لە(مینا)دا کۆبوونەتەوە بۆحەجکردن بەپێی ئەو دینەی

[1] - السيرة النبوية لابن هشام- ج٢-ص٢٣١- (ألبانی)یش لە (تحقيق)ی (فقه السيرة)ی (محمد الغزالي)دا بەڕاست (صحيح)ی داناوە.

خۆیان}، پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: (لم نؤمر بذلك) فەرمانمان بەوە پێ نەکراوە.

لەم دەقەشەوە دوو مەسەلەی گرنگ دەفامرێتەوە:

أ- جەنگ و جیهاد دەبێ خوا فەرزی بکات و هەرکەس بۆی نیە لە خۆڕا مل بنێ، ئنجا دوای ئەوەی کە فەرزیش کرا لەمەشەوە دوو مەسەلەی گرینگ دەفامرێنەوە: ئەو هەل و مەرجەی کە تێیدا فەرز کراوە، بێتەوە گۆڕێ، ئەوجار دەکرێ، کە دیارە ئەوەش دەبێ پسپۆڕان بڕیاری لەسەر بدەن.

ب-پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هیچ هەنگاوێکی نەناوە بەبێ وەحی، بەلاّم دیارە هەنگاوی گەورەو گرنگ؟ ئەگەرنا لەو شتانەدا کە لەمەودای ئیجتیهادو مەودای بیرکردنەوەی مرۆڤدا بوون، ئیشی خۆی لەسەر ئەوە ڕانەگرتوە داخۆ خوای زانا چی دەفەرمویْ؟، چونکە ناگونجێ بۆ وردو درشت خوای پەروەردگار بفەرموێ: وا بڕۆو وا مەڕۆ!! بەڵکو ئەو شتانەی کە پەکیان لەسەر وەحی کەوتوەو لە توانای عەقڵدا نەبوون، چاوەڕێ بووە تا وەحی بۆ دێ، بۆ وێنە کە ئایا دەست بە جەنگ بکەن یان نا؟!

(ابن هشام) لەژێر ناوونیشانی: (العباس يستوثق من الأنصار)دا ئەم قسانەی هێناون:

**{قال (كعب بن مالك): فَاجْتَمَعْنَا فِي الشّعْبِ نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ حَتّى جَاءَنَا وَمَعَهُ (عَمّهُ) الْعَبّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطّلِبِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ عَلَى دِينِ قَوْمِهِ إلّا أَنّهُ أَحَبّ أَنْ يَحْضُرَ أَمْرَ ابْنِ أَخِيهِ وَيَتَوَثّقَ لَهُ، فَلَمّا جَلَسَ كَانَ أَوّلَ مُتَكَلّمٍ الْعَبّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطّلِبِ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الْخَزْرَجِ – قَالَ: وَكَانَتْ الْعَرَبُ إنّمَا يُسَمّونَ هَذَا الْحَيّ مِنْ الْأَنْصَارِ:**

الْخَزْرَجَ، خَزْرَجَهَا وَأَوْسَهَا -: إنّ مُحَمّدًا مِنّا حَيْثُ قَدْ عَلِمْتُمْ وَقَدْ مَنَعْنَاهُ مِنْ قَوْمِنَا، مِمّنْ هُوَ عَلَى مِثْلِ رَأْيِنَا فِيهِ فَهُوَ فِي عِزّ مِنْ قَوْمِهِ وَمَنَعَةٍ فِي بَلَدِهِ وَإِنّهُ قَدْ أَبَى إلّا الِانْحِيَازَ إلَيْكُمْ وَاللّحُوقَ بِكُمْ فَإِنْ كُنْتُمْ تَرَوْنَ أَنّكُمْ وَافُونَ لَهُ بِمَا دَعَوْتُمُوهُ إلَيْهِ وَمَانِعُوهُ مِمّنْ خَالَفَهُ فَأَنْتُمْ وَمَا تَحَمّلْتُمْ مِنْ ذَلِكَ وَإِنْ قَالَ فَقُلْنَا لَهُ: قَدْ سَمِعْنَا مَا قُلْت، فَتَكَلّمْ يَا رَسُولَ اللّهِ فَخُذْ لِنَفْسِك وَلِرَبّك مَا أَحْبَبْت }[١]

واتە: کەعبی کوڕی مالیك گوتی: ئێمە لە نشێوەکەدا کۆبووینەوە چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەکرد، هەتا هاتو عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامیشی لەگەڵی بوو، کە ئەو ئەوکاتە هەر لەسەر ئایینی گەلەکەی بوو، بەلاّم حەزی کردبوو بێتو لە ئیشی برازایەکەیدا ئامادەبێو لەبارەیەوە دڵنیابێ. ئنجا کاتێك دانیشت یەکەمین قسەکەر عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، گوتی: ئەی کۆمەڵی خەزرەج:- گۆتی: وە عەرەب هەموو خەڵکی (يثرب)یان بە ئەوسو خەزرەجەوە هەر بە خەزرەج ناودەبرد —موحەممەد ئەوە خۆتان دەزانن کێیە! وە ئێمە لەبەرانبەر ئەو کەسانەدا لە خزمەکانی کە ڕایان لە بارەیەوە وەك هی ئێمەیە پاراستوومانەو لە شاری خۆیدا سەلامەتو پارێزراوە، بەلاّم هەر سوورە لەسەر هاتن بۆ لای ئێوەو پەیوەستبوون پێتانەوە.

---

[١] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢٢٨.

تێبینی: مەبەست لە (استوثاق العباس من الأنصار) ئەوەیە کە عەبباسی مامی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ویستوویەتی دڵنیابێ کە پشتیوانەکان پێغەمبەر دەگرنو بەڵێنی لەگەڵ دەبەنە سەرێ.

ئنجا ئەگەر پێتـان وایـەو لـەخۆتان ڕادەبیـنن کە ئەو پەیمانـەی پێتـان داوەو بانگتـان کـردووە بـۆی بـەجێ دێـنو لـە ناحــەزو نـەیارەکانی دەیپارێزن، ئەوە خۆتانو ئەوەی بڕیارتان داوە، بەڵام ئەگەر پێتـان وایـە پاش دەرچوونی بۆلاتان تەسلیمی دەکەنو پشتی بەردەدەن، ئەوە هەر لە ئێستاوە وازی لێبێنن، چونکە لە نێو خەڵكو وڵاتـی خـۆی دا سـەلامەتو پارێزراوە دەڵێ: ئێمەش پێمان گوت:

ئەوە قسەی تۆمان بیست، ئەی پێغەمبەری خـوا! (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) فەرموو قسە بکەو چ شتێك بۆخـۆتو بـۆ پـەروەردگارت حـەز دەکـەیو داوا دەکەیو بەمەرج دەگری بیفەرموو.

٦) قسەکانی (عباس بن عبدالمطلب)یش چەند هەڵوەستەیەك هەڵدەگرن:

١- پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە پێی عورف وباوی ئەو کاتە هەتا لە مەککەو لـە دەورو بەریـدا بـووە، لـە ژێـر سایەو پەناگـەی هۆزەکـەی خـۆی (بـني هاشـم)دا، حاواوەتـەوەو پـەنا دراوە، دیـارە ئـەوان وەك دەمارگیریی تیرەگەریی (التعصُّب القبلي) بـەرگرییان لـە پێغەمبـەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کـردوە، وەك خزمێکـی خۆیـان، ئنجا دیـارە دەمـارگیریی تیرەگـەریی شـتێکی نەفامانەیـەو ناڕەوایـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەش دا پێغەمبـەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سـوودی بینیـوە لـەو عورف باوەی کە ئەو کاتە هەبووە، کە بریتی بـووە لـەوەی عەشـیرەت دیفاعیان لە خەڵکی خۆیان کـردوە گـەر چـی لەسـەر دیـنی ئـەوانیش نـەبووبێت.

٢- پاشان دەبینین کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە مـامی نـاڵێ: جا خۆ تۆ مسوڵمان نی، چ حەقی منت هەیە؟! ڕەنگە ئەگەر مسوڵمانێکی کـرچ و کـاڵی ئێمـە بـێ ئەگـەر بـابی یـان خزمێکـی نـا ئیسـلامیی

قسەیەکی خێری بۆ بکا، بڵێت: جا تۆ حەقت چییە خۆ تۆ مسوڵمان نی، یان تۆ لەگەڵ ئێمە نی!!، واینەفەرمووە، بەڵکو ڕێزی مامی گرتوە، وە لێگەڕاوە مامی بەناوی ئەوەوە قسە بکات، چونکە قسەکەی (عباس) زۆر گەورە بووە کە گوتوویەتی: موحەممەد لە لای ئێمە ڕێز لێ گیراوەو ئێمە دیفاعی لێ دەکەین ودەیپارێزین، دیار چاکیشیان نەپاراستوە، بەڵام بۆیە وایگوتوە تاکو بیکاتە منەتێك لە سەر ئەوس و خەزرەج، وە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وا نەیەتە بەر چاو کە کەسی نیە پشتیوانیی لێ بکات، هەروەها مولزەمیشیان بکات بەوەی کە ئەو بواری هەبوو لەلای ئێمە خۆمان بمێنێتەوەو لێی نەقەوماوە، پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هیچ قسەیەك ناکات کە عەبباسی مامی بە ناوی ئەوەوە قسە دەکات، ئنجا ئەوانیش چۆن وەڵام دەدەنەوە.

ئەوانیش دەڵێن: ئێمە دەزانین بۆچی هاتووین وە پەیمانی پێ دەدەین و دەیشی پارێزین، هەڵبەتە ئەو هەڵوێستەی (عباس) نیشانی خۆی دەپێکێ، وە هەردووك هۆزی ئەوس وخەزرەج) هان دەدات کە زیاتر دیفاع لە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بکەن، کەواتە: ئەو هەڵوێستەی عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) کۆمەڵێك ئامانجی پێکاون.

٣- پاشان ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە ئێمە دەبێت بەهرە وەربگرین لە هەموو وزەو توانایەکان پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر فەرمووبای: ئەی بەنی هاشیم! ئێوە حەقی منتان نەبێ و فڵان کەس ئەتۆ حەقی منت نەبێ بێگومان کەلێن و بۆشایی زۆر دەکەوتە ئەو پشتیوانییەی کە لێی دەکرێ. بەڵام مادام عەبباس نەهاتوە بڵێت: وەرە من پشتیوانییت لێ دەکەم، بە مەرجێ تۆ تەنازول لە فلاّن شتە

بکەی، هەروەها (أبو طالب) هیچ مەرجێکی دانەنابوو کە دیفاعی لێ دەکرد، ئێمەش دەبێ هەر کەسێك پشگیریمان بکات بۆ کارو کاروان‌و پرۆژەی ئیسلامیی، ئەگەر مسوڵمانیش نەبێ، کە دیارە ئێمە میللەتی خۆمان بە زۆریی بە مسوڵمان دەزانین، بەڵام ئەگەر کەسێك مسوڵمانیش نەبێ، هەر دەبێ سوپاسی بکەین، مادام بەبێ بەرانبەر یارمەتییمان دەدات.

لە کۆتایی توێژینەوەماندا لەبارەی پێنجەمین بنەمای کارو پرۆژەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی کۆمەڵگا، سەرنجتان بۆ مەسەلەیەکی گرنگ ڕادەکێشم:
پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی کاری لەسەر بانگەواز، لەسەر هۆشیار کردنەوەو تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵك، بەڵام بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامیی هاتوە کاری سیاسی کردوە، واتە: بۆ پەیدا کردنی کۆمەڵە خەڵکێکی ئیسلامیی‌و کۆمەڵگایەکی مسوڵمان لە ڕێی بانگەوازو تێگەیاندن وهۆشیارکردنەوەی خەڵکەوە کاری کردوە، بەڵام لە دوای ئەوەی کە کۆمەڵ وکۆمەڵگایەکی مسوڵمان دروست بووەو ویستوویەتی قەوارەیەکی سیاسییان بۆ دروست بکات، کە بیان پارێزێ وە چەترو سایەو سێبەرێکیان هەبێ، هاتوە شێوازی کارەکەی گۆڕیوەو دێنێ کاری سیاسیی دەکات: وەك پەیمان وەرگرتن‌و جم‌و جوڵکردن بە شەوو پەنهانکاریی‌و، نەقیب دیاری کردن و، ڕێکخستنی کاروباری ئیداریی! کەواتە: ئێمەش پێویستە بۆ ئەنجامدانی کاری ئیسلامییمان، ویستمان هەر کارێك بکەین، شێوازی خۆی بۆ لە بەر چاو بگرین کاری بانگەواز شێوازەکانی خۆی دەوێ، کاری سیاسیی شێوازەکانی خۆی دەوێ، وەدروست کردنی قەوارەی سیاسی

شێوازی خۆی دەوێ، پێغەمبەری ئێمە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وای کردوە، دیارە لە بەرچاو گرتنی ئەو هەل ومەرجەی ئەو کاتە بە گشتیو، ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا بووە، دەجا ئێمەش دەبێ بە لەبەر چاو گرتنی ئەو هەل ومەرجە فیکرییو سیاسییو کۆمەڵایەتییەی کە ئێستاکە کۆمەڵگای بەشەریی بە گشتیو کۆمەڵگای خۆمان بە تایبەتیی تێیدا دەژین، کارەکەمان ئەنجام بدەینو بۆ هەر ئامانجەو لەهەر قۆناغەدا شێوازو ئامرازو ڕێبازە پڕ بە پێستو پێویستەکان بگرینە بەر.

**قۆناغی شەشەم: کۆچکردنی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پێش ئەویش هاوەڵانی بۆ (یثرب) وەك پێشەکییەك بۆ بنیاتنانی قەوارەی سیاسی:**

کۆچ (هجرة) بریتی بوو لە گواستنەوەی پێغەمبەری خواو (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە مەککەوە بەرەو مەدینە، لە مەککەیەك کە کاروکاروانی ئیسلامیی تێیدا گەیشتۆتە بنبەست، بەرەو مەدینەیەك کە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُو الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ...﴾ الحشر. لە مەککەوە بەرەو مەدینەیەك کە مسوڵمانانێکی تێدان کە باوەشیان گرتۆتەوە بۆ پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و بۆ بەرنامەکەیو بۆ هاوەڵانی کۆچکەری بەڕێزی، ئنجا ئەو کۆچکردنە ئێمە ئێستا کە سیرە دەخوێنینەوە، ڕەنگە بەشتێکی ئاسان تێیبفکرین، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر شتێکی قورس بووە بۆیەش من کۆچکردنم بە پێشەکی بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگای ئیسلامییو پاشان دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی داناوە، چونکە تەنیا بە مسوڵمانانی مەککە کە دوایی بوون بە کۆچکەران (مهاجرون) دەوڵەتی ئیسلامییو کۆمەڵگای ئیسلامیی پێك نەدەهات. هەروەها بە مسوڵمانانی مەدینەش کە دوایی ناویان لێنرا: پشتیوانان

(الأنصار) بەوانیش پێکتەدەهێنرا، بەڵکو ئەو دووە لەیەکیان دا و پێکەوە ئاوێتە بوون، ئەوجار کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی دروست بوو، وە لەهەناوی ئەو کۆمەڵگایە دەوڵەتی ئیسلامیی هاتەدەر، بەڵێ ئەو مسوڵمانانەی کە پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) سێزدە ساڵی ڕەبەق بەپەروەردەکردنیانەوە خەریك بوو، ئەو مسوڵمانانەی کە دوایی ناویان لێنرا: کۆچکەران، وە پاشان ئەو مسوڵمانانەی دیکەش کە لەمەدینە بوون، کە پشتیوانان بوون، کە لەڕووی ژمارەوە زیاتر بوون، وەلە ماڵ و حاڵی خۆشیان دا بوون، پێویست بوو ئەو دووانە هەردووکیان لێك بدرێن، کەسانێك کە پێغەمبەری خوا سێزدە ساڵ تەمەنی پڕ بەرەکەتی خۆی بەپەروەردەکرن و بارهێنان و ڕاهێنانیانەو خەرج کردبوو، وە کەسانێکیش کە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرگای خۆیان خستبووە سەرپشت بۆ پێشوازیی لێکردنی ئیسلام و پەیام و بانگەوازی پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) ئنجا کۆچیش ئاوا دەستی پێکردوە:

لە (السیرة النبویة)دا هاتوە،[1] هەروەها لە (طبقات ابن سعد)دا[2] **(قالَ رَسولُ اللّهُ صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ قَد أخبِرتُ بدارِ هِجرَتِکُم وَ هيَ یَثرِب فَمَن أرادَ الخُروجَ فَیَخرُجُ اِلیها وَ خَرَجَ المسلمونَ جَمیعاً الی المَدینةَ فَلَم یَبقَ بِمَکةَ مِنهُم الاّ رَسولُ اللهِ صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ وَ أبوبَکر وَ عَلي، أو مَفتونُ أو مَریضُ أو ضعیفُ علی الخُروج )** پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) وەکو زەمینە سازیەکی نەفسی بە هاوەڵانی بەرێزی دەفەرموێ: هەواڵم پێدراوە بە مەنزڵگای کۆچ بۆکردنتان – ئەو شوێنەی کە دەبێت کۆچی بۆ بکەن- ئەویش (یەسریبە)، لە فەرموودەیەکی دیکەدا

---

[1] السیرة النبویة لابن هشام: ج٢ ص٦٧، ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ

[2] طبقات ابن سعد، ج١ ص٣٢٥.

دەفـەرموێ: هـەواڵم پێـدراوە شـوێنێکە کـە دارخورمـای لێیـەو کەوتۆتـە نێـوان دوو زنجـیرە شـاخەوە، بـەڵام دوایـی بۆیـان دیـاریی دەکـاتو دەفەرموێ: یەسریبە، هەرکەسێك دەیەوێ ئێرە بـەجێ بهێڵێت بـا بـۆی بچـێ، واتـە: فـەرمانیان پێـدەکات بەدەرچـوون، دوایـی (إبـن سـعد) لـە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: مسوڵمانان هەموویان ڕۆیشتن بەرەو مەدینـە، هیچ کەس لە مەککە نەمایەوە، جگە لە پێغەمبـەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و ئەبوبەکرو عەلی (خوا لێیان ڕازی بێت)، یاخود کەسێك کە سجن کرابـێ یـان لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا بێـت لـە هاوەڵـان، یـاخود نەخۆشـبێ، یـاخود نـەتوانێ بچێتە دەر، وەکو ئافرەتـان و منـداڵ و پیرو پەککەوتـە، واتـە: هەموویان ڕۆیشتن، ئینجا وەکو گوتم لە سـەرەتاوە ئامـاژەم پێـدا هەنـدێ کەس پێیان وایە کە ئەو کۆچە تـەنیا سـەفەرێك بـووە لـە مەککەوە بـۆ مەدینـە –کـە ماوەکـەی دەوری (٦٠٠) کـم دەبـێ- کـە بـە دووسـێ ڕۆژ گەیشتوونەتە ئەوێ بەڵام کتێبەکانی سیرە باسی ئەوەمان بـۆ دەکەن کـە ئـەو کۆچکردنە زۆر سـەخت بـووە، وە موشـریکەکانی مەککـە کۆمـەڵێك شێوازیان بەکارهێناوە، بۆ ڕێگرتن لەو کۆچ و کۆچبارەی هاوەڵان:

یەکـەم/ یەکـەم شـێوازیان بـریتی بـووە لـەوەی کـە ژن و مێـرد و منـداڵیان لەیەك جیا بکەنەوە، کە ئـەوە بـۆ (ئوممـو سـەلەمە)و (ئـەبو سـەلەمە)و (سەلەمەی) کوڕیان ڕووی دا، کاتێك ئەبو سەلەمە ویستی لەگەڵ (ئوممو سـەلەمە)و (سـەلەمەی) کـوڕی بـەرەو مەدینـە بچـن، خزمـەکانی ئوممـو سەلەمە هاتن گوتیان: ئێمـە نـاهێڵین ئـەو ئافرەتـەی ئێمـە لەگـەڵت بـێ، ئیدی ئەویان ڕاکێشا، خزمەکانی ئـەبو سـەلەمەش گوتیـان: ئێمـەش ئـەو منداڵەی خۆمان نادەینـە ئێـوە، ئـەوانیش منداڵەکـەیان لێسـتاند، ئوممـو

سـەلەمە دەڵـێ: مـن لەشـوێنێك بەتـەنیاو کوڕەکەشـم لای خزمـەکانی مێردەکەم‌و مێردەکەشم کۆچی کرد بۆ مەدینە[1].

دووەم/ شـێوازێکی دیکـە بـریتی بـوو لـە ڕفانـدن (اختطـاف) کـە ئـەوە لـە (عیاش بن ربیعة) ڕوویدا کە لەگەڵ (عمر بن الخطـاب) (خـوا لێیـان ڕازی بێت) بەڵێنیان دا بەیەکەوە کۆچ بکەن، دوایـی ئـەوەبوو کـە (عیـاش بـن ربیعــة) هەڵدەخەڵــەتێ‌و (أبــو جهــلء الحــارث بــن هشــام) دەیــڕفێنن‌و دەیگێڕنەوە[2]

سێیەم/ شێوازێکی دیکە بریتی بوو لە حەپسکردن، یانی کە زانیویانە کـابرا دەیـەوێ کـۆچ بکـات، حەپسـیان کـردوە، بـۆ وێنـە: کۆیلـەکان بـە زۆری زینـدانیی دەکران، وە (عیاش بن ربیعة) کە لە ژوورێکدا حـەپس کرابـوو کە سەربانی نەبوو[3].

چوارەم/ یەکێکی دیکە لە شێوازەکانی ڕێگرتن لە کۆچکردنی هاوەڵان بریتی بووە لەوە کە کەسێك زانیبیان کۆچ دەکات ئەگەر سامانـدار بـووبێ، مـاڵ و سامانەکەیان لێ ستاندوە. بۆ وێنە: صـوهەیبی کـوری سـینانی ڕۆمیـی، دەڵێ: گوتیان: ڕێـت نـادەین مەگـەر هەرچـی مـاڵ و سـامانت هەیـە بمـان دەیـتێ ئینجا ڕێ دەدەیـین دەربـازبی‌و بـڕۆی! ئنجا دوای ئـەوەی مـاڵ و سـامانەکەی خـۆی دانــێ، لێیگــەڕان کــە کــۆچ بکــات[4]، کەواتــە: ئــەو کۆچکردنە جاری وابووە سەریان لە پێنـاودا دانـاوە، وە جـاری وابـووە لـە پێناویدا گیراون‌و ڕفێنـدراون‌و ڕووت کـراون!! هـەروا کـۆچ و سـەفەرێکی ئاسان نـەبووە.

---

[1] السیرة النبویة لابن هشام، ج٢ ص٦٧، ٦٨، ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ.
[2] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٧٢، ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ.
[3] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٧٣.
[4] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٧٤.

هەروەها پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)یش دیسان کۆچەکەی زۆر زەحمەت بووە، خوا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى) لە سورەتی (الأنفال)دا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ واتە: وە یاد بکەوە کاتێك ئەوانەی بێبڕوان پیلانیان لە دژی تۆ دەگێڕا کە سجنت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانیان گێڕاو خواش نەخشەی دانا، وەخوا باشترین تەگبیر سازە.

ئنجا ئەو کۆچەم بۆیە بە پێشەکیو زەمینە خۆشکەری بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامییو پاشان دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی داناوە، چونکە ئەگەر ئەو مسوڵمانە کۆچکەرانە کۆچیان نەکردبایە بۆ مەدینە، بێگومان مسوڵمانانی مەدینە بەتەنیا بایی ئەوەندە نەبوونو ئەوەندە پەروەردە نەکرابوون کە بتوانن دەوڵەتی ئیسلامیی بەڕێوە بەرن، هەروەك چۆن کۆچکەرانیش ئەگەر هەر لەمەککە مابوونایەتەوە، دیسان بارودۆخی (مەککە)یش گونجاوو لەبار نەبوو بۆئەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی تێدا ڕابگەیەنرێ، بۆیە پێویست بوو ئەو کۆچ و کۆچبارە ئەنجام بدرێ.

## قۆناغی حەوتەم: دانانی پێنج پایەی گرنگ: دروستکردنی مزگەوت، برایەتیی نێوان کۆچکەرانو پشتیوانان، نووسینی صەحیفە (دەستوور)، بانگ، ڕووگە (قبلە):

### ١// دروستکردنی مزگەوت:

هەر لە سیرەی (ابن هشام)دا کە دیارە کۆنترینو موعتەبەرترین کتێبە لە ژیاننامەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا نووسرابێ، چۆنیەتی بنیاتنانی یەکەم مزگەوت بەدەستی موبارەکی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) کە ئێمە بە یەکەمین پایەی پێکهاتنی دەوڵەتی ئیسلامیی دادەنێین، بخەینەڕوو، (ابن هشام) لە درێژەی باسکردنی ئەوەدا کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەچێتە مەدینەو بە سواریی حوشترەکەی خۆی مەنزڵ بە مەنزڵ دەڕوات دەڵێت:

**(حَتى إذا أتَت دارَ بَني مالِك من بَني النَجار بَركَتْ على بابِ مَسجِدِهِ وَ هُوَ يَومَئِذِ مِربَدُ لِغُلامَينِ يَتيمينِ مِن بَني النجار وَسَألَ عَنِ المِربَدِ لِمَن هُوَ؟ فَقالَ لَهُ مُعاذُ بْنُ العَفراء: هُوَ يارَسولَ الله لِسَهل وَ سُهَيل ابني عَمرو وَهُما يَتيمانِ لي وَ سأُرضيهِما مِنهُ، فاتَّخِذْهُ مَسجِداً، قالَ فَأمَرَ بِهِ رسولُ اللهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أن يبنى المَسجِد).**

واتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەسواری حوشترەکەی ڕۆیشت تا گەیشتە لای بەنی مالیك لە بەنی نەججار، لەوێ لەدەرگای مزگەوتەکە یەخ بوو (واتە: ئەو شوێنەی کە دوایی کراوە بەدەرگای مزگەوت) ئەو کاتە (جۆخین) (واتە: شوێنی خەرمانی خورما و دەغڵ بوو و تەخت کرابوو) هی دوو منداڵی هەتیو بوو لە بەنی نەججار، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: ئەم جێخوون (جێخەرمان)ە هی کێیە؟ (موعازی کوڕی عەفرا) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوە هی (سەهل و سوهەیلە) کوڕانی عەمر، کە دوو هەتیون لەلای منن و من سەرپەرشتیان دەکەم، وەمن ڕازییان دەکەم، (واتە: بۆیان قەرەبوو دەکەمەوە و پارەیان دەدەمێ) تۆ بیکە بە مزگەوت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی کردو کردیان بەمزگەوت. کەواتە: چۆنیەتی دروستکردنی مزگەوتەکە بەو شێوەیە بوو، شوێنێکی سادە، هی دوو منداڵی هەتیو، کە دوای ئەوە قەرەبوو

دەكرێنەوەو، بێگومان قەرەبووەكە بۆ ئەوان باشتر بووە لەو شوێن خەرمانە.

شایانی باسە كە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خۆیشی ئیشی لە دروستكردنی مزگەوتەكەدا كردوە، وەك (ابن هشام) دەڵێ: **(فَعَملَ رَسولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ لَيُرَغّبَ المُسلمينَ في العَمَلِ وعَمِلَ المُهاجِرونَ والأنصارُ فيهِ)**[1] واتە: پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خۆیشی ئیشی تێدا دەكرد (لە دروستكردنی مزگەوتەكەدا) بۆ ئەوەی مسوڵمانان هانبدات كە ئەوانیش كاری تێدا بكەن، بۆیە كۆچكەران و پشتیوانانیش ئیشیان تێدا دەكرد، ئنجا (ابن هشام) دەڵێ: **(فَقالَ قائِلُ مِنَ المسلمين: لإن قَعَدنَا والنَبيُّ يَعمَلُ لَذاكَ مِنَّا العَمَلُ المُضَلَّلُ)**. واتە: یەكێك لە مسوڵمانان گوتی: ئەگەر ئێمە دابنیشین و پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كار بكات، ئەوە بەڕاستی كارێكی زایەیەو مایەپووچییە بۆ ئێمە!

هەروەها (إبن هشام) دەڵێ: مسوڵمانان ئەمەشیان بە شیعر دەگوت لە كاتی بیناكردن دا، كەواتە: با خەڵك بزانێ كە جەوی نێو مسوڵمانان جەوێكی وشكو ڕەقو تەقو بێ زەوق نیە! دەیانگوت: **(لاعَيشَ الاّ عَيشَ الاخِرةَ، أللهُمَ ارحَمِ الأنصارَ وَالمُهاجرة)** واتە: ژیان نیە جگە لە ژیانی دوارۆژ، ئەی خوایە! بەزەییت بەپشتیوانان و كۆچكەراندا بێتەوە.

(ابن هشام) دەڵێ: **(فَيَقولُ رَسول اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: لاعيشَ الاّ عَيشَ الآخِرةَ، اَللهُمَ ارحَمِ المُهاجرينَ وَالأنصار)**[2] واتە: پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئاوا شیعرەكەی دەفەرموو: ژیان نیە جگە لە ژیانی دوا ڕۆژ، ئەی خوایە! بەزەییت بە كۆچكەران و پشتیوانان دا بێ، واتە: وای

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٨٦، ٨٧، ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ.

[2] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص ٨٧، ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ.

نەفەرمووە کە ببێت بە شیعر، دیارە ئەوەش میصداقی ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: (وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ) (يس) واتە: نەشیعرمان فێر کردووە نە بۆیشی هەیە بیلێت، واتە: پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەك زانایان دەڵێن: ئەگەر ویستباشی شیعر بڵێ، بە جۆرێکی دەگوت کە لە شیعر دەشۆرا و کێش (وزن)ەکەی تێکدەچوو، یاخود سەروا (قافية) تێکدەچوو.

**ڕۆڵی گرنگی مزگەوت:**

اتی خۆی مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وە مزگەوت لە ئیسلام دا بەگشتی، شوێنی وەرگرتنی زانست بوو، وە شوێنی پەروەردەکردن بوو، وە شوێنی ڕاوێژکردنو نەخشەدانانو تەگبیر کردن بوو، وە شوێنی چارەسەرکردنی کێشەکان بوو، وەشوێنی عیبادەتو پەروەردەکردنی ئیمانییو ڕووحیو ڕازو نیاز بوو لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، وە شوێنی کۆمەڵێك چالاکی دیکەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی‌و بەڵکو جیهادییو سەربازییش بوو، زۆر جاران سوپا لە مزگەوت دا ڕێك خراوەو کاروباری بۆ دیاریکراوە.

یەکێك لەو زوڵمانەی کە لەئیسلام و مسوڵمانان دەکرێ، بریتیە لە پەکخستنی مزگەوتەکانو خاڵی کردنەوەیان لە نێوەڕۆکی خۆیان، ئەویش بە ڕێگرتن لە تێدا ئەنجامدانی چالاکییە جۆراو جۆرەکان، من چووم بۆ هەندێك لە ولاتانی ئەورووپا، مزگەوت لەوێ وێڕای نوێژو تاعەت، شوێنی کۆبوونەوەی مسوڵمانانە، شوێنی چالاکیی فیکرییو هاوکاریی پێکەوە کردنو، شوێنی پێك ئاشنابوونو یەکدی بەسەرکردنەوەی مسوڵمانانو...هتدە، کە بە داخەوە لێرە لە زۆربەی ولاتانی مسوڵماناندا ئەو چالاکییانە لە مزگەوت قەدەغە کراون، کە ئەوە

بەڕاستی زوڵمێکە لە ئیسلام و لە مسوڵمانان دەکرێ‌و، ستەمێکە مسوڵمانان لە خۆیان و دینەکەیانی دەکەن، بەڵێ ئێمە حەقمان نەداوەتەماڵەکانی خوای پەروەردگارو، یەکێك لە هۆیەکانی پاشکەوتنمان‌و یەکێك لە هۆکارەکانی بەلارێدا چوونی چینی گەنجمان، کە سەری لێ دەشێوێ‌و بەملاو لادا دەڕوات‌و ڕوو لە بارو مەیخانەکان و شوێنی خراپ دەکات، ئەوەیە کە دەرگای ماڵەکانی خوای لێ بەستراوە، بەڵێ بۆ نوێژ کراوەتەوە، بەڵام مزگەوت تەنیا جێگای نوێژکردن نیەو، پێویستە مزگەوت جێگای ڕۆشنبیریی بێ، شوێنی پەروەردەکردن‌و پێگەیاندن‌و ڕاهێنان بێ، شوێنی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان بێ، شوێنی سیاسەت و پرس و ڕاوێژ کردنی مسوڵمانان بێت، وە ئەوە کە ئیمام لەمیحراب دا دەوەستێ، ئەوە دەگەیەنێ، کە مسوڵمانان دەبێ سەرکردەو پێشەوایەکیان هەبێ‌و بە دوای ئەودا جووڵە بکەن، وە دەبێ ڕوویان پێ بکاتە یەك ڕووگەی دیاری کراو، نەوەك هەر کەسە ڕووی لەلایەك بێ، وە پێشەوا کە پێیان دەڵێت: ڕێك بوەستن پاڵ وێك بدەن! ئەوە بەڕاستی هەمووی مەشق و ڕاهێنانە بۆ مسوڵمانان‌و ئەو مەشق و ڕاهێنانە تەنیا بۆ نوێژەکان نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لە سەرجەم لایەنەکانی دیکەی ژیانیشیان دا، ئاوا بە هەرەوەزیی‌و ڕاوێژو ڕێك‌و پێکیی کاری خۆیان بکەن.

**٢// برایەتیی لە نێوان کۆچکەران‌و پشتیوانانندا:**

دیارە (ابن هشام) بۆ سیرەکەی خۆی پشتی بە (ابن اسحاق) بەستوە خۆیشی هەندێ زیادەی دەخاتە سەر، جا (ابن هشام) دەڵێ: **{قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: وَآخَى رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، فَقَالَ - فِيمَا بَلَغَنَا، وَنَعُوذُ بِاَللّهِ أَنْ نَقُولَ عَلَيْهِ مَا**

لَمْ يَقُلْ-: تَآخَوْا فِي اللّـهِ أَخَـوَيْنِ أَخَـوَيْنِ }[1] واتـە: (ابـن اسـحاق) دەڵێـت پێغەمبەر (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) برایـەتیی بڕیـاردا لـە نێـوان هاوەڵـانی بەڕێزیـدا لـە كۆچـكەران و پشـتیوانان، وەك پێمـان گەیشـتوە –پـەناش بـەخوا دەگـرین كـە شـتێك بەدەمییـەوە بلـێین كـە نەیفـەرمووبێ- فـەرمووی: لـە پێنـاوی خـوادا برایـەتیی بكـەن، دوو دوو، واتـە: هـەر كۆچـكەرو پشـتیوانێكی دەكـردە بـرا. دیـارە ئـەو برایەتییـەش چـەند حیكمەتێكی تێدابوون:

یەكـەم: ئـەو كۆمەڵگایـە دەبێتـە كۆمەڵگایـەكی تۆكمـەو پتـەو و پێكـەوە جۆشـدراو و ئـەوە نـابێ كـە بگـوترێ: ئـەوە مەككەییـەو ئـەوە مەدینەییە، چونكە ئەو كۆمەڵگایەی كە دەمارگیرییان بۆ شارو تیرەو هـۆز دەبـێ، كۆمەڵگایـەكی دواكـەوتوون، تاكـەكانی كۆمـەڵگا دەبـێ پێكـەوە قاڵـب بـن و جـۆش بخـۆن و، هـەموویان لەسـەر یـەك پـەیام و بەرنامە خڕ ببنەوە، پێغەمبـەر (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) ویستی ئـەو خەڵكە هیچی دەمـارگیریی بـۆ هـیچ شـتێك نـەبێ جگـە لەئیسـلام، وە لەقاڵب و جوغزی تەسك و گچكەی شارو تیرەو هۆزی دەرهێنـان و یـەك ئینتیمای گشتی بۆ دروست كـردن، كـە بەیەكدییـەوە بیانبەسـتێتەوە: ئینتیما بۆ ئیسلام و برایەتیی ئیسلامیی.

دووەم: پاشان چارەسەری كێشەیەكی ئابووریی وكۆمەڵایەتییشی پێكرد، كۆچكەران كە لەمەككەوە هاتبوون، زۆربەی هەرە زۆریان ماڵ وحاڵی خۆیان بەجێ هێشتبوو، هەبوو خێزانیشی بەجێ هێشتبوو، بـۆ وێنـە عومـەری كـوڕی خـەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بـێ) ئـەو كەڵـەپیاوە دوو هاوسەری هەبوون، هیچیان لەگەڵی نەهاتن، هەردووكیان كافر بـوون،

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، ج٢- ص٣٦٤، دار ابن الهیثم.

بۆیە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە نێوان کۆچکەرانی بێ ماڵو حاڵو، پشتیوانان دا برایەتیی بڕیاردا، کە ئەوە بوو پشتیوانان بەڕاستیو بەمانای وشە برایەتیی ڕاستەقینەیان لەگەڵ کۆچکەراندا کرد، هەتا هی وایان هەبوو بە برا کۆچکەرەکەی دەگوت: نەك هەر لە ماڵ و سامانمدا بەشدار بە، بەڵکو وەرە من دوو هاوسەرم هەن، هەیە وەرە تەماشایان بکە، کامیانت بە دڵە من تەڵاقی دەدەمو دوایی کە عیددەی بەسەرچوو مارەی بکەرەوە، برایەتیی یەکەیان گەیشتبووە لووتکە! کەواتە: ئەو برایەتییە بۆ پڕکردنەوەی ئەوکەلێنە سیاسییو ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و عاتیفییە بوو، کە لە لای کۆچکەران دروست بووبوو، بەهۆی کۆچکردنیانەوە، پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو گرفتانەی پێ چارەسەر کردن، هەر بۆیەش دوایی دوای ئەوەی ئەو قۆناغە کاتییە بەسەر دەچێ، خوای پەروەدگار ئەو جۆرە برایەتییە کە میراتیان لە یەك دەبرد، برایەتیی یەکە هەروەك خۆی دەبێت، بەڵام میراتەکەی گەڕاندەوە سەر ئەصڵی خۆی، وەك دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...(٧٥)﴾ الأنفال٧٥. واتە: ئەوانەی کە خزمن لەیەکدی لەپێشترنو نزیکترن (بۆمیرات گرتن) لە کتێبی خوادا، واتە مەسەلەی میراتی گەڕاندەوە سەر حاڵەتە ئاساییە یەکەی خۆی، دوای بەسەرچوونی ئەو حاڵەتە تێپەڕ(طاريء)ە بەڵام برایەتییەکە هەر لەجێی خۆی مایەوە.

هەڵبەتە ئەو هەڵوێستە بەڕاستی لووتکەی خەڵك بەسەرخۆدا هەڵبژاردن (إيثار)و بەخشندەیی و برایەتییو پێ لە نەفسی خۆنانە، ئەگەرنا دەست هەڵگرتن لە هاوسەری خۆ زۆری دەوێ، بەڵام ئەوان

ئیمان و ئیسلام و برایەتیی‌و عەتف و سۆزیان لەگەڵ یەكدی، وای لێ كردوون، ئاوا پێ لە نەفسی خۆیان بنێن.

بەلاّم ئەگەر پشتیوانەكان ئەو جوامێریی یەیان هەبووە، لە بەرانبەردا كۆچكەرەكانیش ئەگەر ئەو جوامێریی یەیان زیاتر نەبوبێ كەمتر نەبووە، بۆ وێنە: (سعد بن الربیع) كە لەگەڵ (عبدالرحمن بن عەوف)دا دەبێتە برا، پێی دەڵێ: وەرە لە ماڵی من چیت دەوێ هەڵیگرە، ئەویش دەڵێت: (**بارك الله في أهلك ومالك ولكن دلّني على السوق**)[1] واتە: خوا پیت وبەرەكەتی زیاتر بخاتە ماڵ وسامان وخێزانیشت، بەلاّم تۆ ڕێگای بازارم پێشان بدە! كەواتە: كۆچكەرانیش لەگەڵ هەژاریی‌و نەدارییشدا، دانیان بەخۆیاندا گرتووەو پشتیان بەخۆیان بەستوە.

## ٣// نووسینی (صحیفة):

پایەیەكی دیكە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕەچاوی كرد بۆ بنیاتنانی قەوارەی ئیسلامیی یەكەم، نووسینی دەستوور بوو، ئێمە بە زاراوەی ئەمڕۆ دەڵێین: دەستوور، بەلاّم لە سەرچاوەكانی سیرەدا بە سێ وشە هاتوە: (الكتاب) و (الصحیفة) و (الوثیقة)، كتاب واتە: نووسراو، صەحیفە واتە: لاپەڕەیەكی نووسراو، وەسیقەش وەك چۆن دەڵێی (دۆكیۆمێنت –پەیماننامە-) ئنجا (ابن هشام) لەوبارەوە گوتوویەتی: {**قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ: وَكَتَبَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ كِتَابًا بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، وَادَعَ فِيهِ يَهُودَ وَعَاهَدَهُمْ وَأَقَرّهُمْ عَلَى دِينِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ وَشَرَطَ لَهُمْ وَاشْتَرَطَ عَلَيْهِمْ**}[2].

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٩٣، ط دار صادر، ١٤٢٤هـ.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص٢٦٢-٢٦٤، دار إبن الهيثم، وە ج٢ ص ٩٠- ٩٣. ط دار صادر/ ١٤٢٤هـ.

واتە: (ابن اسحاق) دەڵێت: پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) نووسراوێکی نووسی لەنێوان کۆچکەران و پشتیوانان دا، وە پەیمانی بەست لە گەڵ جوولەکەکان، وە پەیمانی دانێ کە لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە و لەسەر ماڵ وسامانی خۆیان بمێننەوە، وە مەرجیشی بۆ گرتن و مەرجیشی لەسەر گرتن، ئنجا دواتر باسی بەندەکان دەکات، دیارە ئەو وەسیقەیەیە یەکێکە لە دۆکیۆمێنتە گرنگەکان لەسەردەمی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دا، کە لە (٤٦) ماددە پێك دێ، وە بە وردیی پێکهاتەکانی مەدینە، هەموو تیرەو هۆزەکانی نێو (یثرب) لە عەرەبەکانی باس کردوە، وەتیرەو هۆزی جوولەکەکانیشی باس کردوە، وەمافە هاوبەشەکانی مسوڵمان وجوولەکەشی پێکەوە باس کردوون، وەسەربەخۆیی هەرکامێکیشیانیشی ڕاگەیاندوە، وە مسوڵمانانی بە ئۆممەتێك ناو بردوەو، جوولەکەکانیشی بە ئۆممەتێك ناو بردوە، واتە: هەرکامێکیان سەربەخۆیی خۆی هەیەو، خاوەنی ئیدارەو قەوارەی خۆیەتی، بەڵام هەردووکیشیان لە قەوارەیەکی فراوانی سیاسییداخۆیان دەبیننەوە، وە کۆمەڵێك ئەرکی هاوبەشیان هەیە، کە پێکەوە ڕایان دەپەڕێنن.

شایانی باسە زۆر لە مێژوونووسان ئەو دەستوورە بە یەکەمین دەستووری نووسراو لەسەردەمی کۆندا دەبینن، دیارە پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەو دەستوورەی بۆ ڕێکخستنی پێکهاتەکانی مەدینە داناوە، لەڕووی سیاسیو ئابوریی ئیدارییەوە، چونکە لەو (٤٦) ماددەیەدا کە دەستوورەکە دەیانگرێتە خۆی، گەلێك شتی گرنگ باس دەکات، بۆ نموونە:

١) ئەگەر کەسێك کەتنێکی کرد، هەڵوێستیان لەبەرانبەریدا چی بێ.

٢) وە مەسەلەی ماڵو نەفەقە خەرجکردن، ڕوونکراوەتەوە.
٣) ئەگەر کێشەو فیتنەیەك بوو، چۆن چارەسەر بکرێ؟
٤) ئەگەر لایەنێك هێرشی کردە سەر مەدینە چۆن بەیەکەوە هاوکاری بکەن بۆ بەرگریی؟
٥) ئەگەر کەسێك لێی قەوماو هەژار کەوت چۆن چارەسەری گرفتەکەی بکرێ؟ ...هتد.

ئەوەش بەڕاستی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زۆر پێش سەردەم ورۆژگاری خۆی کەوتوە، بۆ چۆنیەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، وە دیاریکردنی ئەرك ومافەکانی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی کە بەبەرچاوڕوونیی یەوە پێکەوە مامەڵە بکەن.

**٤// دانانی بانگ:**

بانگ وەك دروشمێك کە مسوڵمانەکان کۆ بکاتەوە، بەتایبەتی لە مزگەوت دا بۆ خوا پەرستیی، یان گەورەترین جۆری خواپەرستیی، کە نوێژە، دیارە مەسەلەی بانگ شتێکی ئاساییە لەلای ئێمە، بەڵام لە ڕاستییدا بانگ یەکێکە لەو شتانەی کە مسوڵمانان جیادەکاتەوە لە غەیری خۆیان، هەر بۆیە لەزۆر لە وڵاتاندا کاتێك دوور دەکەوینەوە لە وڵاتانی ئیسلامیی، بەچی دەردەکەوێ کە ئەو شوێنە مسوڵمانی لێن یان نا؟ بە بانگ، وە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و لەکاتی فتووحاتی ئیسلامییدا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: ئەگەر ویستتان بچن بۆ ناوچەیەك بۆ لای تیرەو هۆزێك، بۆ ئەوەی بزانن مسوڵمانن یان نا؟ گوێ هەڵبخەن داخۆ بانگ دەدەن یان نا؟ واتە: بانگ دروشمێکە مسوڵمانی پێ لەنامسوڵمان جیا دەکرێتەوە، وەك

کۆمەڵو کۆمەڵگاو وڵات، وەك چۆن نوێژ مسوڵمانی پێ لە نامسوڵم جیا دەکرێتەوە، وەك تاك.

(ابن اسحاق) بە درێژیی بۆمان باس دەکات کە مەسەلەی دانانی بانگ چۆن بووە؟[1] کورتەکەی ئەوەیە دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە مەدینەدا نیشتەجێ بوو وە هاوەڵانی لە کۆچکەران وە پشتیوانان لێی کۆبوونەوە، وە ئیسلام هێزو پێزی پەیدا کردو سەقامگیربوو، نوێژ فەرز کرا، دیارە پێشتر نوێژ فەرز کرابوو، لە شەوی (ئیسراو میعراج)دا، بەڵام ئەم جارە مسوڵمانان نوێژەکانیان بە کۆمەڵ دەکردو لە پێنج کاتی دیاری کراودا، دیارە بەر لەوەی بانگ دابنرێ پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خەڵکی کۆدەکردەوە بۆنوێژ، بێ ئەوەی کە بانگیان بکات، واتە: مسوڵمانان بۆ خۆیان دەیانزانی کە کاتی نوێژە، ئنجا هەبوو دوا دەکەوت، وەهەبوو پێش دەکەوت، بۆیە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە چووە مەدینە، بیری لەوە کردەوە کە دەبێ شتێك هەبێ مسوڵمانان کۆبکاتەوە بۆ نوێژ، جارێك ویستی (بوق)ێك وەك هی جو ولەکە کە پێی بانگ دەدەن، بەکاربێنێ، دواتر پێی ناخۆش بوو و ئەوەی واز لێهێنا، ئنجا (ناقوس)ی هێنا کە وەك جەرەس لێ دەدرێو هی نەصرانییەکانە، ئەوەی بەکاردەهێنا، ئیدی ئەوان لەو مشت ومڕەدا بوون، یەکێك لە مسوڵمانان بەناوی (عبدالله بن زید) خەونی بە بانگەوە بینیو هات بۆ پێغەمبەری خوای (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) گێڕایەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من دوێنێ شەو لە خەونمدا بینیم کە پیاوێك دوو بەرگی سەوزی لە بەردابوون، ناقووسێکی بەدەستەوە بوو، وەك هی نەصرانییەکان، گوتم: ئەی بەندەی خوا! ئەو ناقووسەم پێ نافرۆشی؟

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص ٢٦٦، دار إبن هيثم، وە: ج٢ ص ٩٥، ط دار صادر/ ١٤٢٢هـ.

گوتی چی پێ دەکەی؟ گوتم: خەڵکی پێ بانگ دەکەین بۆ نوێژ، گوتی: شتێکی لەوە باشترت پێ بڵێم؟ گوتم: بەڵێ، ئەوە چییە؟ گوتی بڵێ: (**اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ**) بەو شێوەیە بانگ بکەن، دەڵێ: دوای ئەوەی هەواڵم دا بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (**إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَقُمْ مَعَ بِلَالٍ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ**)[1]، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واتە: (إن شاءالله) خەونێکی ڕاستە، هەڵسە فێری بیلالی بکە، با بەو وشانە بانگ بدات، چونکە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترە. ئنجا کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێ گوێی لێبوو بیلال بانگی دا، لە کاتی نوێژدا، هەستا بەهەڵە داوان هاتو عەباکەی لە دوای خۆی ڕادەکێشاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سوێند بەوەی کە تۆی بەحەق ڕەوانە کردوە، منیش بەهەمان شێوە بینیومە لە خەوندا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (فلله الحمد على ذلك) ستایش بۆ خوا لەسەر ئەوە، واتە: ئەوە شتێکی حەقە.

بەڵێ بانگ بەو شێوەیە دانراوە، ئنجا بانگ بۆ ئێمە ئێستا کە پێنـ فەرزە دەدرێ، وەك گوتم پێمان شتێکی ئاساییە، بەڵام بە ڕاستیی بانگ شتێکی گەورەیەو دروشمێکە مسوڵمانانی پێ لە نامسوڵمان جیا دەکرێنەوە، وە بانگ بەشێکە لە ناسنامەی مسوڵمانان، وە ئەگەر

[1] أخرجهُ أحمد برقم: (١٦٥٢٥)، وأبو داوُد برقم: (٤٩٩)، والترمذيُّ برقم: (١٨٩)، قال الألباني: حسن صحيح.

تەماشــای وشــەكانی بكــەین، دەبیــنین هێڵــە گشــتییەكانی بوونناســیی ئیسلامیو، ئیمانو عەقیـدەی ئیسـلامیی تێـدان، بـانگ چۆن دەست پـێ دەكـات؟ (الله اكـبر الله اكـبر) بـە موتڵـەقیی خـوا گـەورەترە، هەرچـی بـە تەصـەووری تـۆدا دێ، خـوا لـەوە گـەورەترە بـە گەورەییـەك كـە قیـاس ناكرێ، پاشان باسی خوا بەیەكگرتن (توحید) دەكات: (أشهد ان لا الـه إلّـا الله) شایەتیی دەدەم كە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێكی دیكـە نیـە، ئنجا باسی ڕەوانەكرانی پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دەكات (أشهد أن محمداً رسـول الله)، ئنجا باسـی خـەڵك بـانگ كـردن دەكـات بـۆ نوێـژ، وەخـەڵكی بانگ دەكات بۆ سەر فرازیی، پاشان دووبارە گەورەیی خوا ڕادەگەیـەنرێ، وە لەكۆتایی دا یەكتایی خوا لە پەرستراوێتیی دا ڕاداگەیەنرێ.

بـەڵێ بـانگ یـەكێك بـووە لـە پایـەكانی بنیاتنـانی كۆمـەڵگاو دەوڵـەتی ئیسـلامیی، وە ئێسـتاش بـۆ كۆمـەڵگای ئیسـلامیی گرنگییـەكی تایبـەتی خۆی هەیە، ئنجا ئـەوەش زۆر جێـی سـەرنجە كـە پێغەمبـەر (صَـلّی اللّـهُ عَلَیْــهِ وَسَــلّمَ) ئـەو (عبـدالله بـن زیـد) كـە خەونەكـەی بـینی بـوو، پێـی نەفەرموو: خۆت بانگ بدە، خـۆت خـەونت بینیـوەو خۆشـت بـانگ بـدە، بــەڵكو فــەرمووی: بچـۆ وشــەكان فێـری بـیلال بكـە، ئنجـا حیكمـەتو پاساوەكەش چی بوو؟ فـەرمووی (**إنَّهُ أندی صوتاً منـك**) دەنگـی ئـەو لـە دەنگـی تـۆ خۆشـترە، كەواتـە: پێویسـتە بـانگ بێـژان، كەسـانێك بـن كـە دەنگیان خۆش بێو دەنگێكی زوڵاڵو كاریگەریان هەبێ، بـەڵێ ئـەو وشـە گـەورەو موبارەكانـە، حەیفـە بـەدەنگی كەسـێكی دەنـگ زوڵـاڵو دەنـگ خۆش نەگوترێن.

## ٥// دیاریکردنی ڕووگە:

پایەی پێنجەم بۆ پێك هێنانی كۆمەڵگای ئیسلامیی و دەوڵەتی ئیسلامیی بریتی بوو لە دانانی ڕووگە (قبلة) کە ئەمیش لەلای ئێمە ئێستا زۆر ئاساییە کە خەڵکی مسوڵمان بۆ نوێژ دەوەستیٚ و ڕوو لە (کعبة الله) دەکات، بەڵام بۆ ئەو کاتە شتێکی زۆر گەورەبووە.

چۆنیەتی دانانی ڕووگە (قبلە)ش بەم شێوەیە بووە، وەك (ابن هشام) هێناویەتی، وە (بخاري)یش هێناویەتی: **{عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَوَّلَ مَا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَزَلَ عَلَى أَجْدَادِهِ أَوْ قَالَ أَخْوَالِهِ مِنْ الْأَنْصَارِ وَأَنَّهُ صَلَّى قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا وَكَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ تَكُونَ قِبْلَتُهُ قِبَلَ الْبَيْتِ}**[1]، بەرائی کوڕی عازیب دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکەم جار کەچوو بۆ مەدینە لە لای باپیرەکانی، (واتە: تەرەفی دایکی) یان لەلای خاڵەکانی لە پشتیوانەکان دابەزی، وەماوەی شازدە مانگ یان حەڤدە مانگ بەرەو (بيت المقدس) نوێژی کرد، بەڵام حەزی لەوە بوو کە قیبلەکەی کابە (بيت الحرام)بیٚ واتە: مەککە، وەك خوای پەروەدگار دەفەرمویٚ:﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥۗ ... ﴿١٤٤﴾﴾البقرة، بێگومان خوا ئاگای لە دڵی موبارەکی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووە، ئەها دەفەرمویٚ: (قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ ) دەبینین ڕووت هەر لە ئاسمان دەکەی، دیارە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕووی هەر لە

[1] رواهُ البُخاريُ برقم: (٤٠).

ئاسمان بووە و دەستی بەرزکردۆتەوە و دوعای کردوە، پێی خۆش بووە خوا فەرمانی پێبکات کە ڕووبکاتە مزگەوتی حەرام (المسجد الحرام)، بەلاّم پێشتر دیارە فەرمانی پێکراوە ڕووبکاتە مزگەوتی قودس (بیت المقدس)، ئنجا خوا فەرمووی: (فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا )، واتە ئەوەی کە لە دڵی تۆدایە و ئاواتی بۆ دەخوازی، ئەوە بۆمان هێنایتە دی: ڕووت پێ وەردەگێڕین بەرەو ڕووگەیەك کە پێت خۆشە (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ) دەجا ڕووی خۆت بکە مزگەوتی حەرام، (وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ) وە ئێستا کە لە مەدینەی و لەهەر شوێنێکی دیکەش بووی، هەر ڕووتان بکەنە مەککە، واتە: ئەویّ بوو بە قیبلەی کۆتایی، بۆیە ئێستا بە (المسجد الأقصى) دەگوترێ: (أولى القبلتين وثالث الحرمين) یەکەمین ڕووگەی مسوڵمانانو سێیەمین حەرەم، یەکەمین حەرەممان مەککەی پیرۆزو، دووەمین حەرەممان مزگەوتی پێغەمبەرە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وە سێ یەمیان مزگەوتی (أقصى)یە. دیارە شتێکی ئاشکرایە کە مەسەلەی ڕووگە (قبلة) کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر لە کەسایەتیی کۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامیی هەبووەو هەیە، بەتایبەت لەڕووی سەربەخۆیی فیکریی‌و ڕووحیی‌و کۆمەلاّیەتیی‌و سیاسییەوە.

ئەمانە ئەو پێنج پایە بوون کە من پێم وایە کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کۆمەڵگای ئسلامیی لەسەر بنیات نان، وەپاشان لە نێو هەناوی ئەو کۆمەڵگا ئیسلامیی یە، دەوڵەتی ئیسلامیی هاتە دەر، وە دەوڵەتی ئیسلامیشی لە سەر ئەو پێنج پایەو چەند بنەمایەکی دیکە دامەزراند.

## پێگەی جەنگ و جیهاد لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا:

جەنگ وجیهاد یەکێك نیە لەو پایەو بنەمایانەی کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بنیات ناون، بەڵێ، کۆمەڵگای ئیسلامیی‌و دەوڵەتی ئیسلامیی بە ڕاستی هیچ پەیوەندیی بە هێزەوە نیە، واتە: بە کارهێنانی هێز یەکێك نیە لە پایەکانی بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامیی، لە ڕاستییدا پێگەی جەنگ‌و جیهاد، بریتیە لەوەی کە دەبێتە پەرژین‌و قەڵاو سوپەر بۆ سەر مسوڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامیی، بۆیە ئێمە تەماشا دەکەین، دوای ئەوەی کۆمەڵگای ئیسلامیی بنیات دەنرێ‌و دەوڵەتی ئیسلامیی دادەمەزرێ، ئەوجار خوای کاربەجێ ئەو ئایەتە دەنێرێتە خوارێ ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾الحج، واتە: مۆڵەتدرا بەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ دەکرێ‌و ستەمیان لێ دەکرێ، وە خوا لەسەر یارمەتیدانی ئەوان بەتوانایە، ئنجا دواتر خوای پەروەردگار پاساوی ئەو مۆڵەت درانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ...﴿٤٠﴾﴾الحج، واتە: ئەوانەی کە لە ماڵ وحاڵی خۆیان وەدەرنران، بێ ئەوەی حەقی خەڵکیان لەسەر بووبێ، تەنها ئەوەنەبێت کە دەیانگوت: پەروەردگارمان خوایە، ئنجا دواتر خوای پەروەردگار تیشك دەخاتە سەر حیکمەتی فەرزبوونی جەنگ‌و جیهاد، لەکات وشوێنی خۆیدا لە هەلومەرجی خۆیداو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾﴾الحج. واتە: وەئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکی بەهەندێکیان پاڵ پێوە نەنابایە، (واتە: خەڵکی خراپ وزاڵمی بەخەڵکی مسوڵمان وچاك پاڵ پێوە نەنابایە)، پەرستگاکانی ڕەبەنەکان‌و جوولەکەو

نەصرانیی‌و مسوڵمانان کە یادی خوایان زۆر تێدا دەگرێ، دەرووخێنران، واتە: خواپەرستیی کاتێك دەمێنێتەوە کە ئەهلی حەق چەك و هێزێکیان هەبێ دیفاعی پێ لەخۆیان‌و پەرستگاو دین‌و ژینیان بکەن، دوایش دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾الحج، واتە: ئەوانەی کاتێك کە دەسەڵاتمان پێدان لە زەویدا، نوێژ بەرپا دەکەن‌و زەکات دەدەن، وە فەرمان بەچاکەو رێگریی لەخراپە دەکەن. بەڵێ بەبێ هێز کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی ناپارێزرێ‌و بۆ پارێزگاریی لێکردنی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی‌و دین‌و ژینی مسوڵمانان، وە زەفەر پێ نەبرانیان لەلایەن دوژمنانیانەوە، دەبێ هێزو پێزیان هەبێ، بەلام نەك بۆ چەسپاندنی ئیسلام و بلاوکردنەوەی ئیسلام، ئیسلام دەبێ بۆ خۆی بلاو ببێتەوە، لەرێی بانگەوازو تێگەیاندنی خەلکەوە، بەلکو بۆ پارێزگاریی لێکردنی دین‌و ژینیان.

ئەگەرنا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆ ئەگەر نەیتوانیبا جەنگی بەرەیی‌و ئاشکراش بکا لەگەڵ کافرەکاندا، دەیتوانی جەنگی پەنهانکوژیی (اغتیالات) بکات، واتە: هەندێك لەسەرانی کوفر بەپەنهانیی بکوژێ، وەك لەمەدینە کردی، بەلام لەگەڵ کەسانێك کە لەگەڵیاندا لە جەنگدایە، وەك (کعب بن الأشرف)و (سلام ابن ابي حقيق) و (خالد بن سفيان الهُزَلي) کە ئەوانە سەرانی ئەهلی کوفربوون‌و لە جیاتی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بچێ کەسانی زۆر لەقەومەکەیان بکوژێ لەحالەتی جەنگدا، هەندێك لەسەرکردە شەرەنگێزەکان کە ئاگریی بن کاو سەری مار بوون‌و ئەوانەی لەکۆڵ کردەوە، بەلام ئایا هۆی چی بوو کە ئەوەی لەمەککەدا نەکرد؟ چونکە لە بنچینەدا بەکارهێنانی هێز رەوا نەبوو لەوێدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کەئیسلام هێز بەکاردێنێت بۆ بەرگریی کردن لە کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی

ئیسلامیی، لە قەوارەیەك کە هەیە، نەك بۆ دروست کردنی، ئنجا ئەگەر لەمەککە هێزی بەکار بهێنایە، دەیانگوت: ئەوئیسلامە دەبێ خەڵکی بکوژێ ئنجا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام نا، ئیسلام با خۆی بڵاو بێتەوەو، با خەڵکە مسوڵمانەکە لەڕێی بانگەوازو تێگەیاندنەوە پەیدا ببێ‌و بە قەناعەتەوە لە ئیسلام کۆببێتەوە، ئەوسا چەك‌و هێز بەکار دەهێنرێ بۆ دیفاع کردن لە ئیرادەی ئەو خەڵکەی کە ئەو بەرنامەو پەیام‌و شێوە ژیانەی بەقەناعەتی ئازادانەی خۆی هەڵی بژاردوە.

ئنجا خوێنەری بەڕێز! ئێستا کە زانیمان پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چۆن قەوارەی ئیسلامیی دروست کردوەو دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراندوە، دەڵێین: هەڵبەتە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرمەشقە بۆ ئێمە نەك تەنیا بۆ چۆنیەتی نوێژ کردن‌و ڕۆژوو گرتن‌و حەج‌و عومرە، بەڵکو بۆ هەموو شتێك‌و لەهەموو بوارەکاندا سەرمەشقمانە کەواتە: پێویستە پێغەمبەری ئێمە چۆن کۆمەڵگای خۆی گۆڕیوەو چۆن قەوارەی سیاسیی دروست کردوە، ئێمەش شوێن پێی هەڵبگرین، دیارە بە لەبەرچاو گرتنی هەلومەرجی خۆمان، بەڵام لە هێڵە گشتی یەکاندا دەبێ تەماشای پێغەمبەری خۆمان (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بکەین، کە لەڕێی قەناعەت پێهێنانی خەڵکەوەو، لەڕێی بانگەوازو هۆشیار کردنەوەی خەڵکەوە، خەڵکی لە پەیامەکەی کۆکردۆتەوە ، پاشان پەروەردەی کردوون، وە دوایی ڕێکی خستوون وە پەیمانی لێ وەرگرتوون، وە قۆناغ بە قۆناغ لە گەڵیاندا ڕۆیشتوە، تاکو ئەو کۆمەڵگایەی پێ بنیات ناون، وە دوایی لە هەناوی ئەو کۆمەڵگەیەدا کە لەسەر ئیمان وئیسلام کۆبۆتەوە وبنیات نراوە و پێکهێنراوە، قەوارەی ئیسلامیی ودەوڵەتی ئیسلامیی بنیات ناوە، ئێمەش پێویستە بە هەمان ڕێبازدا لە هێڵەگشتییەکاندا بەرەو ئەوئامانجە بچین.

لێرەشدا دەگەینە کۆتایی بەشی دووەمی ئەم تەوەرەی یەکەمە.

# بەشی سێیەم

# سیستەمی حوكمڕانیی (نظام الحكم) لە ئیسلام دا

١- هەبوون‌و نەبوونی سیستەمێكی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا.

٢- ئەزموونی مێژوویی سیستەمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا.

٣- سروشت‌و چۆنیەتی سیستەمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا.

٤- بناغەی فیكریی‌و عەقیدەیی سیستەمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا.

خوێنەری بەڕێز!

خوا پشتیوان بێ لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەكی گشتی تیشك بخەینە سەر سیستەمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا، ئەویش لە چوار بڕگەدا:

١- لە بڕگەی یەكەمیان باسی ئەوە دەكەین كە ئایا لە ئیسلامدا شتێك هەیە بگونجێ پێی بگوترێ: سیستەمی حوكمڕانیی (نظام الحكم) یان نا؟

٢- وە لەبڕگەی دووەم دا باسی ئەزموونی مێژوویی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی دەكەین، لەو ڕووەوە كە ئایا تا چ ڕاددەیەك پابەندكەر (مُلزِم)ە بۆ مسوڵمانان؟

٣- وە لە بڕگەی سێیەم دا باسی سروشتو چۆنیەتیی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی دەكەین، كە ئایا هێڵە گشتییەكانو سروشتو بازنەی فراوانیی پێكهێنانی قەوارەی سیاسی لە ئیسلام دا چینو چۆنن؟

٤- وە لە بڕگەی چوارەمو كۆتایی دا تیشك دەخەینە سەر بناغەی فیكریيو عەقیدەیی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی.

شایەنی باسیشە كە بڕگەكانی: ٢و٣و٤، لە هەمان كاتدا كە ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییانەن كە كراون بە ناوو نیشانیان، وەڵامیشن بۆ ئەو پرسیارەی كە لە بڕگەی یەكەم دا وروووژێنراوە.

بەڵام بێگومان وەڵامی تێرو تەسەلی ئەو پرسیارە لە دوو توێی هەرسێك تەوەری: دووەمو سێیەمو چوارەمی ئەم كتێبە دایە.

## أ- هەبوون و نەبوونی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا:

لە بارەی هەبوون و نەبوونی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لە نێو شارەزایان و زانایانی ئیسلام دا، وە لە نێو مسوڵمانان دا بەگشتی، سێ بۆچوونی سەرەکی هەن:

١) هەندێکیان پێیان وایە کە ئەصڵەن ئیسلام سیستەمێکی تایبەتی دیاریی نەکردوە بۆ چۆنیەتی حوکمکردن، یەکێك لەوانە (علي عبدالرازق)ە، لە کتێبی (الإسلام وأصول الحكم)دا کە لە ساڵی (١٩٢٥) دایناـ ساڵێك دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی، دوا ئاڵقەی دەوڵەتی ئیسلامیی- دەڵێت: (مسوڵمانان ئیسلام هیچ چوارچێوەیەکی بۆ دیاریی نەکردوون و بۆ چۆنیەتیی حوکمڕانیی کردن و دەوڵەتداریی کردن بۆیان هەیە حکوومەتی دیموکراسی دابمەزرێنن، وەبۆیان هەیە حوکمێکی دیکتاتۆریی، یان بەلشەفیی، یان ئیمپراتۆریی یان هەبێ، چۆنی بیانەوێ دەتوانن ئیدارەی دەوڵەت و وڵاتی خۆیان بکەن)[1].

٢) بۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێ: نەخێر وانیە، بەڵکو ئیسلام چوارچێوەیەکی تایبەتی بۆ حوکمڕانی داناوە، وە لەو بوارەدا نوختەی خستۆتە سەر پیت و دروست نیە مسوڵمانان لەو چوارچێوەیە لابدەن، (حیزبی تەحریر)یش ئەو جۆرە بیرو بۆچوونەیان هەیەو ئەگەر تەماشای کتێبەکانیان بکەی هەر لە خەلیفەوە پێدا وەرە، ئنجا وەزیرەکانی: (تفویض)و (تنفیذ)و پاشان (ولاة)و (عمال)و..هتد وەك (الماوردي) لە کتێبی (الأحكام السلطانية) دا هێناویەتی، ئەوان پێیان وایە ئەوە قاڵبێکە ئیسلام دایڕشتوەو نابێت لێی لابدەین!!

---

[1] الإسلام وأصول الحكم، ص٥٨، ط/٢٠١١، مطبعة: جداول.

٣) هەندێکی دیکە پێیان وایە کە نە بەو شێوەیەیە کە (علي عبدالرازق ) گوتوویەتی، کە گوایە: ئیسلام هیچ هێڵی گشتیو بازنەی فراوانی بۆ حوکمڕانیی دیاریی نەکردوون، وە نە بەو شێوەیەشە کە ئەوانی دیکە دەڵێن: کە ئیسلام قاڵبو فۆڕمو چوارچێوەیەکی دیاری کردبێو دروست نەبێ لێی لابدەی! بەڵکو ئیسلام چەند بنەمایەکی بنەڕەتیی دیاریی کردوون، وە چوار چێوەیەکی فراوانیی دیاریی کردوە، بەڵام بۆشاییەکی زۆری بەجێهێشتوە، بۆ ئەوەی کە مسوڵمانان بەگوێرەی هەل و مەرجو باردۆخە گۆڕاوەکانی خۆیان، ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوەو وڵات و کۆمەڵگای خۆیان لە بەر ڕۆشنایی پرەنسیبو بنەما گرنگەکان دا کە قورئان وسوننەت دیارییان کردوون، وە لەو چوار چێوە فراوانەدا کە دەستیان کراوەتەوە، ئیدارە بکەن.

هەڵبەتە ئێمە ئەو بۆچوونەی سێیەممان پێ ڕاستەو لە درێژەی باسەکە دا ئەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە .

وە من پێم وایە یاساکانی ئیسلام دوو بەشنو شەریعەتی ئیسلامیی دوو جۆرە یاسای داناون:

أ- بۆ ئەوشتانەی کە نەگۆڕ (ثوابت)ن لە کیانی ئینسان و لە ژیانی ئینسان دا، وەك لایەنی ئیمان عەقیدە، لایەنی بوونناسییو دنیابینی، لایەنی عیبادەت، لایەنی ئەخلاق، لایەنی باری کەسێتیی، ئەوانە ئیسلام نوختەی تێدا خستوونە سەرپیت، ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّـهُ عَلَیْـهِ وَسَـلّمَ) بکەین، زۆر بە ڕوونیی دیارە کە نوختە خراوەتە سەر پیت لەو بوارانەدا، بۆچی؟ چونکە ئەو بوارانە لە کیانی ئینسان و لە ژیانی ئینسان دا، وە لە بوون (وجود)دا ناگۆڕدرێن: خوای بێ وێنە هەر وەك خۆیەتیو سیفەت و ناوە

بەرز و بێ وێنەکانی نەگۆڕن، مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا (سبحانه وتعالى) شتێکی نەگۆڕە، ئێمە بەندەین و خوای بەرزو مەزن پەروەرگارە، حەقیقەتی بوونی دوا ڕۆژو بەهەشت و دۆزەخ نەگۆڕن، ئەخلاق ئەوە کە ڕاستیی(صدق) جوانەو درۆ (كذب) ناشیرینە، دەستپاکیی (أمانة) جوانەو ناپاکیی (خيانة) ناشیرینە. دادگەریی بەهایەکی بەرزەو زوڵم شتێکی خراپە، ئەوانە نەگۆڕن.

بەکورتیی: ئەو شتانەی کە لە ژێر ناوونیشانی ئوصوڵی دین دا کۆدەبنەوە، یان لەژێر ناوو نیشانی بنچینەکانی بوون و ژین دا، چونکە بوون و ژینیش هەندێك شتیان تێدا هەیە کە ناگۆڕدرێن، ئیسلام بۆ ئەوانە نوختەی خستۆتە سەر پیت.

ب- بۆ بواری گۆڕاوەکان (متغيّرات)، وەك: بواری حوکم و سیاسەت، بواری جەنگ و ئاشتیی، بواری کۆمەڵایەتیی، بواری پیشەسازیی و بازرگانیی، بەکورتیی: بواری مامەڵەکردن لەگەڵ ماددەدا، لەگەڵ دەورو بەردا، لەگەڵ ژیان و گوزەران دا، ئیسلام ئیکتیفای کردوە بە دانانی چەند بنەمایەکی بنەڕەتیی، بەڵام بۆشاییەکی زۆری بەجێهێشتوە بۆ ئەوە کە ئینسان لە ڕێی ئیجتیهادو بەکارهێنانی عەقڵ و ئەزموونی خۆیەوە، پڕی بکاتەوە، جا لێرەدا زانایان بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێن: (إجمال في المتغيرات وتفصيلٌ في الثوابت) واتە: ئەو شتانەی کە دەگۆڕدرێن، ئیسلام بە کورتیی باسی کردوون، وە ئەو شتانەی کە ناگۆڕدرێن، ئیسلام بە وردیی باسی کردوون، من نموونەیەك بێنمەوە بۆ ئەو شتانەی کە ناگۆڕدرێن: دەست نوێژ (وضوء) خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (المائدة)دا هەر چەندە دەستنوێژ شتێکی بچووکە لە چاو مەسەلەی حوکم و وڵات بەڕێوەبردندا، بەڵێ حەقیقەتێکی دینییەو بە بێ دەستنوێژ، نوێژ

دروست نابێت، بەڵام دەستنوێژ لەچاو بەڕێوەبردنی وڵات شتێکی گچکەیە، کەچی خوا هەموو پێویستییەکانی دەستنوێژی لە ئایەتێك دا بەیان کردوون و دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ ...﴿٦﴾﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەرکاتێك هەستان بۆ نوێژ، دەموچاوتان بشۆن، وە دەستەکانتان بشۆن، لەگەڵ ئانیشکەکانتان، وە مەسحی سەرتان بکەن (دەستی تەڕ بەسەر سەرتان دا بێنن)، وە پێیەکانتان بشۆن لەگەڵ گوێزینگان، دوایی باسی بەدیلی دەستنوێژیش دەکات کە تەیەمومە، وەك دەبینین خوا بە وردیی هەموو پایە و فەرزەکانی دەستنوێژی باس کردوون، بەڵام لەولاشەوە بۆ بابەتی گەورەی حوکم و سیاسەت و دەوڵەتداریی خوای پەروەردگار چەند هێڵێکی گشتی و چەند بنچینەیەکی سەرەکیی داناون و وردەکارییەکانی بە جێهێشتوون.

ئنجا حیکمەتی ئەوەش کە خواو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە بواری حوکم و سیاسەت دا وازیان هێناوە بە دانانی چەند بنەمایەکی گشتی و نەچوونە نێو وردەکارییەکانی حوکمڕانی دەوڵەتدارییەوە، وە کەلێن و بۆشاییەکی زۆریان بەجێهێشتوە، حیکمەتەکەی ئەوەیە کە خوای زاناو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زانیویانە کە ژیانی بەشەر لە ڕووە سیاسییەکەی و لە ڕووە مادییەکەیەوەو لە ڕووی ژیان و گوزەرانەوە، زۆر زوو دەگۆڕێ، لەبەر ئەوە دەست و پێی مسوڵمانانیان نەبەستوەو مسوڵمانانیان نەخستۆتە نێو قاڵبێکی داڕێژراوی وشکەوە، تاکو دەستیان کراوە بێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەل و مەرج و کات و شوێنە جیا جیاکان دا، کە ئەوە لە ڕاستییدا حیکمەتێکی زۆر گەورەیە، هەر چەندە هەندێك کەس بە نەزانیی

ئـەوە بـە نوقصـانیی بـۆ ئیسـلام تـەفسیر دەكـەن‌و، پێیـان وایـە كـە ئیسـلام سیستەمی حوكمڕانیی تێدا نیە! بەڵێ ئیسلام سیستەمێكی حومڕانیی تێدا نیە كـە قاڵـب بەسـتووبێ، بـەڵام بێگومـان سیسـتەمی حـومكڕانیی تێدایـە، و هێلەگشتییەكانی‌و بنەما سەرەكییەكانی‌و چوارچێوەی فراوان.

ئنجا ئایا بۆچی ئیسلام لەو بوارەدا نوختەی نەخستۆتە سەر پیت؟ چونكە ئەگەر سیستەمی حوكمڕانیی لە قاڵبێكی دیاریكراودا داڕشتبایەو نوختەی تێدا خسـتبوایە سـەر پیـت، ئـەوە وەك كۆمـاری ئـەفلاتوون و كتێبـەكانی دیكـەی فەیلەسووفەكان‌و، هەموو ئەوەی كە پێی دەگوترێ كەلەپوور، هی مسوڵمانان و غەیری مسوڵمانان، وەك لایەنـە بەشـەرییەكەی، كـاتی بەسـەر دەچوو، چونكە پەیوەست دەبوو بە هەل‌و مەرجێكی تایبەت‌و دیاریكراوەوە.

بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە كـە خـوا قورئـان و سـوننەتی نـاردوون بـۆ هـەموو بەشەر، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، لەبەر ئەوە بە دانانی بازنەیەكی فراوان‌و هێڵە گشتییەكان، وازی هێناوە، تاكو بۆ هـەموو كاتـەكان بشێت، ئـەدی چۆن مسوڵمانان ئەوە بۆشاییە پڕ بكەنەوە؟ بێگومان لە ڕێی ئیجتیهادەوە؟

جا لێرەدا زانایان بنچینەیەكیان داناوە دەڵێن (**الأصلُ في العبادات الحظر الا ما ورد عن الشارع تشريعُهُ، والأصـل فـى العـادات الإباحـةُ الا مـا وَرَدَ عـن الشارع تَحرِيمُهُ**)[1] ئەمە قسـەی (عبـدالرحمن بـن ناصـر السعدي)یـە، هـەروەرها (إبن تـيمية)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە كتێبـی (القواعـد النورانيـة في الفقهيـة)دا، هـەمان ئـەو بنچینـەیەی هێنـاوە، بـە تـەعبیرێكی دیكـە[2]، واتـە: بناغـە لـە عیبادەتـەكان دا {ئـەو گوتوویـەتی: عیبـادەت، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا عەقیـدەیش هەر وایەو ئەخلاقیش هەر وایە} بریتیە لە قەدەغە بـوون. (واتـە: قەدەغەیـە

[1] أصول الفقه المهمة، ص ١٠٥، ١٠٦، عبدالرحمن بن ناصر السعدي.
[2] القواعد النورانية الفقهية، ص ١١٢.

لەخۆڕا عیبادەتێك دابهێنرێ) جگە لەوەی کە لە شەرع دانەرەوە هاتوە (وە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە خوا وەحی بۆ ناردوە، مەگەر ئەوان شەرعییەتیان پێدا بێ، ئەگەرنا هیچ عیبادەتێکی دیکە شەرعیی نیە)، بەلاّم بە پێچەوانەوە ئەصڵ لەعادەتو هەڵسوکەوتەکان دا بریتیە لە دەستکراوەییو لە ڕەوایی، مەگەر شەرعدانەر قەدەغەی کردبێ، واتە: ڕاست پێچەوانەی یەکدین، هیچ عیبادەتێك دروست نیە کە شەرع دیاریی نەکردبێ، وە هەموو هەڵسوکەوتێك ڕەوایە، ئەگەر شەرع قەدەغەی نەکردبێ.

ئنجا لێرەدا ئەوە ڕامان دەکێشێ بۆ ئەوە کە ئێمە لەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چاك حاڵی بین کە لە (صحيح موسلم)دا هاتوە بە ژمارەکانی ٢٣٦١- ٢٣٦٢ – ٢٣٦٣، ئەویش ئەوەیە کە (أبو موسى إبن طلحة) ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ:

**{مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَوْمٍ عَلَى رُءُوسِ النَّخْلِ، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ فَقَالُوا: يُلَقِّحُونَهُ يَجْعَلُونَ الذَّكَرَ فِي الْأُنْثَى فَيَلْقَحُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا أَظُنُّ يُغْنِي ذَلِكَ شَيْئًا. قَالَ: فَأُخْبِرُوا بِذَلِكَ فَتَرَكُوهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنًّا فَلَا تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ، وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ اللَّهِ شَيْئًا فَخُذُوا بِهِ، فَإِنِّي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ}**[1]

ئەو هاوەڵە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەلای کۆمەڵێك دا ڕۆیشتین لەسەر ترۆپکی دارخورما بوون، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: ئەوان چی دەکەن ؟ (بۆچی چوونە سەرێ؟ چونکە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خەڵکی مەککە بووەو مەککەیش دارخورمای لێ نەبووە تا بزانێ بۆچی وا دەکەن) گوتیان: ئەوە موتوربەی

[1] أخرجهُ مُسلِم برقم: (٦٢٧٥)

دەکەن، تۆوی نێرەکە دەخەنە سەر مێیەکە وە موتوربە دەبێتو سەرەنجام بەر دەگرێ، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: پێم وایە ئەوە هیچ سوودی نیە (واتە: ئەگەر وایش نەکەن زیانی نیە). هەواڵیان پێدرا کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وا دەفەرموێ، ئەوانیش وازیان لە موتوربە کردنی دارخورمایەکان هێنا، دوایی هەواڵ درایەوە بە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە ئەوانە وازیان لە ئیشەکەی خۆیان هێناوە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر پێیان وایە سوودیان پێ دەگەیەنێ بۆ دارخورمایەکان وا چاکە، با هەروا بکەن، چونکە من هەر گومانێکم بردو بە بۆچوونی خۆم گوتم ڕەنگە سوودی نەبێت، ئێوە من مەگرن بەوەی کە گومانێك دەبەم، بەڵام ئەگەر شتێکم پێ گوتن کە خوا وای فەرمووە، لێم وەر بگرن، چونکە من درۆ بەناوی خواوە ناکەم.

وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا کە بە ژمارە (٢٣٦٢) هاتوە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: ﴿**لَعَلَّكُمْ لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا كَانَ خَيْراً**﴾ واتە: پێم وایە ئەگە ر واش نەکەن هەر باش بێت، واتە: ئەگەر موتور بەیشی نەکەن هەر بەر دەگرێ! (فتركوه فنفضت أو فنقصت) ئەوانیش وازیان لە موتوربەکردن هێنا، سەرەنجام بەرەکەی وەری، یان نوقصانی هێناو کەم بوو، ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: ﴿**إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ دِينِكُمْ فَخُذُوا بِهِ وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ رَأْيٍ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ**﴾ واتە: منیش بەشەرێکم وەك ئێوە، ئەگەر لەبارەی شتێکەوە لە کاروباری دین دا (واتە: ئیمانو عەقیدەو عیبادەتو ئەوانە) فسەم بۆ کردن، لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم پێ گوتن لە بۆچوونی خۆمو دەربارەی کاروباری دنیاتان، ئەوە من هەر ئینسانێکم دەگونجێ نەمپێکا بێ.

هــەروەها بــەژمارە (٢٣٦٣)یــش هێناویــەتیو لــە کۆتــایی قســەکانی دا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمویەتی: {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِـأَمْرِ دُنْيَـاكُمْ} واتە: ئێوە لە کاروباری دونیاتان دا شارەزا ترن، ئەمە یانی چی؟ یـانی: خـەڵکی پسپۆڕو شارەزا لە کاروباری دنیادا، قسەی کۆتـایی بەدەسـت ئەوانـە، بەنموونـە: لە بواری جەنگ دا حەببابی کوری مونزیر لە جەنگی بـەدردا دوای ئـەوەی کـە لە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەپرسێ: ئەی پێغەمبەری خـوا! (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئایا ئەم مەنزڵگایەی کە ئێمە بارگە و بنـەمان لێخستوە، وەحـی خوایە یان هەر بیرو ڕاو تاکتیکی جەنگە؟! ئنجا دوای ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: بەڵکو تـەنیا بۆچوونو ڕای خۆمـەو تاکتیـکو نەخشـەیەکی جەنگییـە، (الحبـاب بـن المنـذر) پێشـنیارێکی دیکـەی بـۆ دەکـاتو ئـەویش پەسـندی دەکـا.[1] لێـرەدا ئێمـە دەگەینـە ئـەو حەقیقەتـە کـەکاروباری دەوڵەتـداریی‌و حـوکمڕانیی، یـان هـەر کاروبـارێکی دیکـەی دنیـایی، شـەریعەت نەیکردوە بە عادەت کە نوختـەی تێدا بخاتـە سـەر پیـت، بۆچی؟ چونکە ئـەو شێوازەی بۆ ئێستا دەبێ، مـەرج نیـە هـەمان شـێواز بـۆ کـاتو شوێنێکی دیکـە بگونجێو ئەگەر نوختەی خستبایە سەر پیت، دەسـت و پێـی خـەڵکی دەبەسـت، وە ئەوە لە ڕاسـتییدا ئیعجازی ئیسـلام دەگەیـەنێ، دەریـدەخات ئیسـلام بۆچـی بەکەڵکی هـەموو کـات و شـوێنێك دێ؟ چونکە دەسـتی خـەڵکی نەبەسـتوە لـەو بوارانەدا کە ژیانی خەڵك تێیان دا گەشە دەکات و پەرەدەستێنێ.

## ٢- ئەزموونی مێژوویی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا:

خوێنـەری بـەڕێز! ڕاسـتەوخۆ دەچـمە نێـو باسـەکەمانەوەو دەڵـێم: بنـەما سـەرەکییەکانی حـوکمڕانیی لەئیسـلام داو پرەنسـیپەکانی بـە شـتی نـەگۆڕو

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص١٨٢ ط٢، دار صادر، ٢٠٠٥.

بناغەیی‌و دا پارێزراو دادەنرێن، لەبەر ئەوەی لە وەحییەوە سەرچاوەیان گرتوە، بەڵام ئەزموونەکانی حوکمڕانیی، چ ئەوانەی کە ئەزموونی سەرکەوتوو بوون‌و وەفاداربوون بە بنەمایەکانی حوکمڕانیی یەوە لە ئیسلام دا، وە پابەند بوون بە شەریعەتەوە، کە بە مەبەستمان پێی حومکڕانیی چوار خەلیفە ڕاشیدەکانە، (ڕەزای خوایان لێ بێ) وە هەندێکی دیکەش لە حوکمڕانان، وە چ ئەوانەش کە ئەزموونی فاشیل‌و لاڕێ بوون، هیچ کامیان بۆ ئێمە پابەندکەر (مُلزِم) نین، بەڵێ، ئێمە بنەمایەکانی حوکمڕانییمان هەن، کە پابەندیی پێیانەوە فەرزەو لە تەوەرەیەکی سەربەخۆدا باسیان دەکەین، وە ئەزموونی حوکمڕانیی مسوڵمانانیشمان هەیە کە جۆراو جۆرن، لە پابەندیی بەو بنەمایانەوە لە شێوەی حوکمڕانیی دا، ئنجا لە ڕاستییدا ئەگەر حوکمڕانانی مسوڵمان، یان ئەو قەوارە سیاسییانەی کە مسوڵمانان لەژێر ڕۆشنایی وەحییدا بەرجەستەیان کردوون، وەفاداریش بووبن بۆ بنەمایەکانی حوکمڕانیی ئیسلامیی‌و، پابەندیش بووبن بە شەریعەتەوە، ئەوجار -جگە لەوەی کە وەحی خوایە- هیچی پابەندکەر نیە بۆ ئێمە، بۆچی؟ چونکە تەنیا وەحی خوای کاربەجێ بە ئیسلام‌و شەریعەت دادەنرێ‌و، پابەندکەر (ملزم)ەو وەحی خوای پەروەدگاریش -وە ك پێشتریش باسمان کرد- نەچۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە چۆنیەتی حوکمڕانیی کردن، لە بازنەی هەڵسوکەوتەکدایە، هەڵسوکەوتەکانیش لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکەو لە شوێنێکە وە بۆ شوێنێکی دیکەو لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێن، بۆیە حیکمەتی خوای کاربەجێ وای خواستوە، کە وردەکارییەکانی حوکمڕانیی کردن لە ئیسلام دا لە دووتوێی قورئان و سوننەت دا نەخاتە ڕوو، تاکو دەست و پێی خەڵك نەبەستێ، وەك پێشتریش باسمان کرد.

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەینە شێوەی حوکمڕانیی کردنی چوار جێنشینە سەرڕاستەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەبوبەکر وعومەر و

عوسمان و عەلی (خوا لێیان ڕازی بێت)، کە بەیەکدەنگیی هەموو مسوڵمانان یان زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانان، ئەگەر بەشێك لە مسوڵمانانی شیعەیان لێبەرینە دەر! سەرکەوتووترین حوکمڕان بوون لە پابەندیی بەشەریعەت دا، ئەو چوار جێنشینەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە سەرمەشقی مسوڵمانانن، لە شێوەی حوکمڕانیی پابەند بەشەرعەوەو، لە جێبەجێکردنی شەریعەت دا، ئەگەر سەرنج بدەینە ئەزموونی هەرکام لەو چوار جێنشینەی پێغەمبەری خوا لێیان ڕازی بێ، تەماشا دەکەین کەم و زۆر جیاوازییان لەنێوان دا هەیە لەوردەکارییەکان دا، بۆ وێنە: لە شێوەی هەڵبژاردنیان دا، هەر چەندە هەرچواریان بەڕاوێژ هەڵبژێردراون بەپێی فەرمانی خوا﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى، بەڵام شێوەی هەڵبژاردنی ئەبو بەکر جیا بووە لە هی عومەرو هی ئەویش جیا بووە لە هی عوسمان‌و، هی ئەویش جیا بووە لە هی عەلی، (خوا لە هەموو لایەکیان ڕازی بێت)، ئەوە لەلایەك.

هەروەها لە شێوەی ناونرانیان دا، ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) پێی گوتراوە: جێنشینی پێغەمبەری خوا (خليفة رسول الله) بەڵام عومەر نازناوەکەی (أمير المؤمنين) بووە، یەکەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە بەر ئەوەی ڕاستەوخۆ لە دوای وی هەڵبژێرراوە، ئەو نازناوەی بووە، هەرچەندە ئەویش هەر فەرماندەی بڕواداران (أمير المؤمنين) بووە، کەچی دوای وی کە عومەر هات یەکێك پێی گوت: (يا خليفةَ خليفةِ رسول الله) گوتی: ئەوە درێژ دەردەچێ‌و ئەگەر وا بێ دەبێ بەهی دوای منیش بڵێن: (يا خليفةَ خليفةَ خليفةِ رسول الله)! مانای وایە ناوەکە زۆر درێژ دەبێتەوە، بۆیە لەسەر ناوێك ڕێك کەوتن یەکێك گوتی: ئێمە ئیمانداری‌و تۆیش ئەمرمان پێ دەکەی، با بڵێین: (أمير المؤمنين)، دیارە عوسمان‌و عەلیش (خوا لێیان ڕازی بێت)،

هەر ئەو نازناوەیان هەڵگرت، هەروەها حوکمڕانانی ئومەوییو عەبباسیش، بەڵام دواتر لە سەردەمی عوسمانییەکان دا بە گەورەی مسوڵمانان گوتراوە: سوڵتان، وە لە هەندێك شوێنەوار دا هاتوە کە لە دوای چوار خەلیفە ڕاشیدەکان پێیان گوتراوە: پادشا (ملك) لەبەر ئەوەی حوکمەکە بۆتە میراتییو، وشەی مەلیکیش بەکارهێنراوە.

کەواتە: لە ئەزموونی حوکمڕانیی مسوڵمانان دا، تەنانەت ئەوانەشیان کە سەرکەوتوو بوون لە پابەندیی بەشەریعەتدا، جگە لەوەی کە ڕاستەوخۆ لە وەحییەوە سەرچاوە دەگرێ (کە دواتر ئەو بنەمایانەی لەوەحییەوە سەرچاوە دەگرن، باسیان دەکەین کەپابەندکەر (مُلزِم)ن بۆ هەموو جیلەکانی مسوڵمانان) ئەوەی دیکە وردەکارییەکانو ئەو میکانیزمانەی کە خۆیان دایانهێناون، یاخود لە وڵاتانی دیکە وەریان گرتوە، بۆ وێنە عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) زۆر شتی لە فارسو ڕۆم وەرگرتوە لەبواری حوکمڕانییدا، هیچی نابێتە پابەندکەر بۆ ئێمە، هەروەك چۆن شێوەی حوکمڕانیی کردنی ئەبوبکر (خوا لێی ڕازی بێت) لە وردەکارییەکانیدا پابەندکەر نەبوو بۆ عومەر، بەڵکو بۆ خۆی ئیجتیهادی کرد لە زۆر شت دا، هەروەها هی عومەریش پابەندکەر نەبوو بۆ عوسمان، وە هەروەها هی ئەویش بۆ عەلی (خوا لە هەموویان ڕازی بێت)، بەڵکو هەرکامێکیان بە پێی هەل و مەرجی سەردەمی خۆی ئیجتیهادی کردوە، بۆ وێنە: تەماشا دەکەین هەرسێ خەلیفەکان لە مەدینەدا نیشتەجێ بوونو ئەوێیان کردوە بە پایتەخت)، بەڵام عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) پایتەختی حوکمی خۆی گواستەوە بۆ شاری کووفە، دوایی موعاویەش گواستیەوە بۆ دیمەشق.

لێرەدا ئێمە با نموونەیەك بێنینەوە: کتێبێك هەیە بەناوی (الأحکام السلطانیة) کە هەم (الماوردي) کتێبێکی بەو ناوونیشانەوە هەیەو، هەم (ابو یعلی الفراء)یش، (الأحکام السلطانیة)ش واتە: یاساکانی حوکمڕانیی، ئنجا ئێمە

تەماشا دەکەین (الماوردي) لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچییدا کتێبەکەی خۆی نووسیوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو واقیعەی کە تێیدا بووە، بۆ وێنە: هەندێك پێگەی سیاسی باس دەکات کە ئێستا هیچیان بەو ناوانەوە نین، دەڵێ: دەبێ خەلیفە هەبێ، وە لەدوای خەلیفە وەزیری (تفویض) هەبێ، کە لە جێی سەرۆك وەزیرانی ئێستا بووەو، هەموو شتێکی بەدەست بووە، هەروەها دەبێ وەزیری (تنفیذ) هەبێ کە زیاتر فەرمانەکان جێبەجێ دەکات، بەڵام دەستی زۆر ئاوەڵا نیە، ئەمجار دوایی دەبێ سەرپەرشتیاری هەرێمەکان (عمال الأقالیم) هەبن، ئنجا ئایا ئێمە لەسەرمان پێویستە کە ئێستا ئەگەر وڵاتێکی ئیسلامییمان هەبێو، دەوڵەتێکی ئیسلامییمان هەبێ، بە سەرۆکی وولاتەکە بڵێین: خەلیفەو بەوەی خوار ئەو بڵێین: وەزیری (تفویض)و وەبەوانی دیکە بڵێین: وەزیری (تنفیذ)؟ نەخێر بەتەئکید، چونکە ئەوە هیچی لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووەو، خۆیان وایان پێ باش بووەو زۆربەشیان لە ئەزموونی دەوڵەتداریی دەوڵەتانی ڕۆژگاری خۆیان وەرگرتوە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! کتێبی (الأحکام السلطانیة) - هەروەها هاووێنەکانی- کە باسی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکات لەسەردەمی عەبباسییەکان دا، واتە: لەبەر ڕۆشنایی ئەو واقیعەدا کە ( الماوردي)و (أبو یعلی الفرّاء) تێیدا ژیانیان بردۆتە سەر، ئا ئەوە ئیجتیهادی ئەوان بووەو، ئەو کەسەی کە ئێستا باسی حوکمڕانیی دەکات لە لەسەدەی بیستو یەك داو، باسی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت دەکاتو باسی تەشکیلی دەوڵەت دەکات، وە پشت بە کتێبەکەی (الماوردی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەبەستێ، کە زانایەکی گەورە بووە، مانای وایە وەك عەرەب دەڵێ: (یعیش في غیر زمانه) دەیەوێ سەدەی بیستو یەك بگێڕێتەوە بۆ دە دوانزە سەدە پێش خۆی، کە بەتەئکید ئەوە بەرەو دوا گەڕانەوەیەو مەحاڵە.

پاشان ئەوەی (الماوردي) گوتوویەتی، بۆ سەردەمی خۆی گوتوویەتیو لە پێش (الماوردي)یشدا خەڵکی دی قسەی کردووەو، لەو بارەوە شتی دیکەی گوتووەو لە دوای (الماوردي)یش خەڵك شتی دیکەی گوتوەو، بەتەئکید ئێستایش ئێمە بۆ سەردەمی خۆمان دەبێت شتی دیکە بڵێین، وە ئێمە دەبێ کتێبەکەی (الماوردي)و هەموو ئەو کتێبانەی دیکە کە لە دوای ئەوو لە پێش ئەو دا نووسراون، هەتا ئەم ڕۆژگارەی خۆمان، هەمووی وەك کەلەپوور تەماشا بکەین، چونکە هەمووی بۆچوونو ئیجتیهادی زانایانەو، ئەوەی کە بۆ ئێمە پابەندکەرە تەنها قورئانو سوننەتە، وەحییە، ئەوی دیکە ئەزموونەو جۆری تێگەیشتنی ئەوانەو، جۆری بۆچوونی ئەوانە لە بارەی شێوەی حوکمڕانییەوە، جا چ کتێبی (إبن تیمیة) بێ کە (السیاسة الشرعیة )یە، چ هی (ابن القیم) بێ کە (الطرق الحکمیة في السیاسة الشرعیة)یە، چ هی زانایانی دیکە بێ، کە زۆر لە زانایانی دیکە کتێبیان نووسیوە لەو بارەوە، بەلاّم هەموویان وەك کەلەپوورێكو بۆچوونی ئەوان دادەنرێن، کە ئێمە دەتوانین لێیان بەهرە مەند بین، بەلاّم ئەگەر موو بەموو خۆمانیان پێوە پابەند بکەین، ئەوە بەتەئکید لە سەردەمو و زەمانی خۆمان بەجێ دەمێنین.

ئنجا بە پێویستی دەزانم لێرەدا سەرنجێکی ورد لەو ڕاستییە بدەین کە لە دوو ئایەتی قورئان دا دووبارە بۆتەوە، ئایەتی: ژمارە (١٣٧) وە لە ئایەتی ژمارە (١٤١) سووڕەتی(البقرة)دا خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾ ﴾ واتە: ئەوانە کۆمەڵێك بوون ڕابردوون، ئەوەی کە کردوویانە لە شتی باش خۆیان لێی بەهرەمەندن، ئێوەش ئەوەی کە دەیکەن لە شتی باش خۆتان لێی بەهرەمەندن، وە ئێوە دەربارەی ئەوان پرسیارتان لێ ناکرێ.

کەواتە: پێشینان بۆ خۆیان ئیجتهادیان کردوە نەك بۆ ئێمە، وە لێرەدا مـن سەرنجی هەموو لایەك ڕادەکێشم بۆ کتێبێکی (سیوطي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەناوونیشانی: (الرد على من أخلَد الى الأرض، وأنكر أن الإِجتهاد في كل عصر فرض) واتە: {بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسەی کە خۆی بەزەوییەوە نووساندوەو نکوولّیی لەوە دەکات کە ئیجتیهاد کردن لـە هـەموو سـەردەمێك دا پێویستە}، بەتایبـەت لـە بـواری سیاسـەتی شـەرعیی‌و دەوڵەتـداریی دا، پێویسـتە زۆر بـە عەقڵێکی کراوەو بـە دەسـتێکی ئـاوەڵاوە ئیجتهـاد بکـەین، ئەگـەرنا لەسـەردەم‌و زەمـانی خۆمـان بـەجێ دەمێـنین‌و، زوڵمـیش لەئیسـلام دەکـەین‌و، بـە بیـانووی پابەنـدیی بـە شـەریعەتەوە، پێچـەوانەی شـەریعەتەوە ڕەفتـار دەکـەین، چونکە شەریعەت لەو بوارەدا دەست و پێی ئێمەی نەبەستوەو، بە پێچەوانەوە زۆریـش هانی داوین بۆ داهێنان (إبداع) لەبواری دنیاداریی دا.

## ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنێکی هەڵە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەیە کە هەنـدێك کەس بەهەڵـە لێیتێدەگەن‌و وای لێدەفامنـەوە، کـە هەرچـی لـەماوەی سـێ وەچـەکان (الأجيال الثلاثة)دا کراوە، هـەمووی شـتی بـاش یـان بەلایـەنی کەمـەوە دروست (جائز)ەو ڕەوایە، چ لەبواری دینداریی‌و، چ دنیاداریی‌و شـێوەی حـوکمڕانیی دا! فەرموودەکەش بەچەند بێژە (لفظ)ێك هاتوە، بـۆ وێنـە: {خَيْـرُ أُمَّتِـي الْقَـرْنُ الَّذِينَ بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ}، یـەکی دیکـەیان: {خَيْـرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّـذِينَ يَلُـونَهُمْ}[1] ، لـە هەنـدێکیان دا تـا چـوار جیل باس کراوە، لێرەدا مەبەستی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ

[1] رَوَاهُ مُسلِمٌ برقم: (٦٦٣٥)

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر بە دروستی لێی تێ بگەین، هەر ئەوەیە کە دەیەوێ پێمان بفەرموێ: باشترین وەچەی مسوڵمانان هاوەڵانی بەڕێزی بوون، پاشان ئەوانەی دوای وان، پاشان ئەوانەی دوای وان، واتە: لەشێوەی ڕاستتێگەیشتنیان دا لە دین، وە لە شێوەی باش پابەندبوونیان دا بە دینەوە، بەڵام ئەوەی لێوەرناگیرێ کە ئەوانە هەرشتێکیان گوتوەو کردوە، هەمووی هەر ڕاستە و چاکە، چونکە خۆتان ئاگادارن کە ئەو جەنگە گەورە خوێناوییانەی کە بوون، لەو سەردەمەدابوون،[1] هەروەها مەدینە کە لە لەلایەن یەزیدەوە سێ ڕۆژان ئیستیباحە[2] کرا، هەر لەو سەردەمەدا بووە، جا ئایا دەکرێ بڵێین: ئەوە شتێکی باش بووە؟!! بەڵێ مەرج نیە هەر شتێك لەوکاتەدا بووە، وە هەموو ئەوانەی لەو کاتەدا بوون، هەموویان خەڵکی باش بووبن، بەڵام بەگشتی کۆی مسوڵمانان لەو سێ سەدەو وەچەیەدا لە سەدەو وەچەکانی دیکە، یەکەم: باشترو فراوانتر لە دین تێگەیشتوون، دووەم: باشتر پێوەی پابەند بوون، لە کۆی گشتیان دا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەرچی لەو سەردەمەدا بووە باش بووە، بۆ وێنە ئەوەش کە موعاویە سیستەمی حوکمڕانیی لە شوڕایی یەوە گۆڕی بۆ میراتیی، بڵێی ئەوەش هەر شتێکی باشەو دەبێ بە دوای بکەوین!! چونکە ئەوە پێچەوانەی ئایەتەکانی خوایە و پێچەوانەی فەرمایشتی

---

[1] مەبەستم جەنگەکانی: (صفین)و (جمل)و (نهروان)ە، کە بەهەزاران کەسیان لەهاوەڵانو غەیری وانیش تێدا کوژران!!.

[2] واتە: یەزیدی کوڕی موعاویە سێ ڕۆژان هەرچی سوپایەکەی دەیەوێ لەگەڵ خەڵکی مەدینەدا، بۆی ڕەوا کردن!!

تێبینی: بەگوێرەی ڕیوایەتی (الزهري) لەو شەڕەدا سوپای یەزید (١٧٠٠٠) کەسیان لە خەڵکی مەدینە کوشتوەو (١٠٠٠) کچیش بەبێ شووکردن لەو ساڵەدا دوو گیان بوون، لەلایەن سوپای یەزیدەوە!!.

بڕوانە: تأريخ الأمم والملوك للطبري، ج٤ ص٣٧٢. وە: البداية والنهاية لابن كثير، ج٨ ص٢٠٣. وە: الكامل في التاريخ لابن الأثير، ج٣ ص ٣١٠.

پێغەمبەری خواشە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) ئاماژەی پێداوەو فەرموویەتی: {أَوَّلُ مَنْ يغيّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ}[1]، واتە: یەکەمین کەس کە ڕێبازی من (لەحوکمڕانیی دا) دەگۆڕێ، پیاوێکە لە بەنی ئومەییە، کە گومانی تێدا نیە مەبەست پێی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی ئومەویی یە.

ئنجا ئێمە دەبینین حوکمڕانانی ئومەویی‌و عەبباسیی چەند بیرۆکەیەکی ناشەرعییان داهێناوەو تەبەنیی کردوەو، خەڵکیان لەسەر ئیجبار کردوە، بۆ وێنە: ئەوە لەسەردەمی ئومەوییەکان دا داکەوت کە ناویان لە غەیری عەرەب نا (موالي) وەك بڵێی هاووڵاتی پلە دوو!! وە لە ئەنجامی ئەو ڕووحی خۆ بەزلگرتن‌و دەمارگیریی یەشدا، ئەو هەموو شۆڕشانە دژی ئومەوییەکان پەیدا بوون، وەك بزووتنەوەی (زنوج) و (قرامطة)و (خوارج)و...هتد، وە سەرەنجام سەڵتەنەتی ئومەویی لە بەر یەك هەڵتەکێنرا، هەروەها عەبباسییەکان کە بیرۆکەی درووستکرانی قورئان (خلق القرآن)یان تەبەنیی کردو زۆرێك لە زانایانیشیان لەسەر ئەوە کە قبووڵیان نەبوو، کوشت‌و ئازارو ئەشکەنجەداو ئەشکەنجەدانی (أحمد بن حنبل)یش زۆر ناوداره، کەواتە: مەرج نیە هەرچی لەو سەردەمانەدا بووبێ، هەمووی هەر ڕاست‌و چاك بووبێ، بەڵکو لەلایەن حوکمڕانانەوە هەڵەو لادانی زل زل هەبوون!

بەڵام لێرەدا پێویستە وریا بین‌و تووشی هەڵەیەك نەبین، ئەویش ئەوەیە کە بەهەڵە بەکارهێنانی هەندێك لە بنەمایەکانی حوکمڕانیی، یان لێ لادانیان لەلایەن زۆربەی هەرەزۆری حوکمڕانانەوە، لەهەموو چاخەکانی حوکمڕانیی ئومەوییەکان‌و عەبباسییەکان‌و عوسمانییەکان دا، خودی بنەمایەکانی حوکمڕانییمان لە ئیسلام دا، لەمێشك دا بخاتە ژێر پرسیار! بۆ وێنە: یەکێك

[1] أخْرَجَهُ ابْنُ أبي عاصم، وَحَسَّنَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) رقم: (١٧٤٩)

لەبەڵگە نەویستەکانی حوکمڕانیی ئیسلامیی - وەك دوایی باسی دەکەین- ئەوەیەکە دیاریی کردنی حوکمڕان، چ کەسی یەکەم، چ ئەوانەی کە هاوکارنی، گرێبەستێکە لە نێوانی خەڵك و ئەو کەسانەدا کە هەڵدەبژێررێن، وە ئەو کەسانە جێگرو وەکیلی ئۆممەت، یان پێغەمبەری خوان (صلى الله عليه وسلم)، هەندێکیش دەڵێن: جێنشینی خوای پەروەردگارن، بەلاّم هەرچۆن بێ بە ئیرادەی خەڵك، جڵەوی حوکڕانیی بەدەستەوە دەگرن.

کەچی (الماوردي) لە کتێبی (الأحكام السلطانية)دا بزانین چۆن باسی دەکات؟ دەڵێ: (**واختَلَفَ اهل العلمِ في ثبوتِ إمامَتِهِ و انعقادِ ولايتهِ بغيرِ عقدٍ ولا اختيار، فَذَهَبَ بَعضُ فقهاءِ العراقِ الى ثبوتِ ولايتهِ وانعقادِ إمامَتِهِ وحَملِ الأُمَّةِ على طاعَتِهِ وان لم يعقدها أهلُ الإختيار لأنَ المقصودَ بإلاختيارِ تَمَيُّزُ الوّلي وَقَدَ تَميَّزَ هذا بِصِفَتِهِ، وذَهَبَ جمهورُ الفقَهاءِ والمَتَكلِّمينَ الى أنَّ إمامَتَهُ لاتنعقدُ الا بالرضا والإختيار، لكن يلزَمُ أهلَ الإختيارِ عقد الإمامَة لَهُ، فإن إتفَقوا أتموا لأنَ الإمامَةَ عقدٌ ولا يَتِمٌّ الاّ بعاقِد**). واتە: زانایان کەوتوونەتە ڕاجیاییی یەوە کە ئایا (کەسی یەکەم) پێشەوایەتییەکەو سەرپەرشتی کردنەکەی بەبێ گرێبەستێك و بەبێ هەڵبژاردنێکی ئارەزوومەندانەی خەڵك، دادەمەزرێ یان نا؟ هەندێك لە شەرعزانانی عێراق گوتوویانە: بەڵێ سەرپەرشتیارییەتەکەی و پێشەوایەتییەکەی دەدامەزرێ، وە پێویستە خەڵك ناچار بکرێن لەسەر فەرمانبەریی بۆ کردنی، هەرچەندە ئەوانەش کە مافی هەڵبژاردنیان هەیە لە نێو خەڵك دا نوێنەرانی خەڵکن هەڵیان نەبژاردبێ، چونکە مەبەست لە هەڵبژرادن، دیاریکردنی سەرپەرشتیارەو ئەویش بەهۆی سیفەتەکەی خۆیەوە - کە خۆ فەرزکردنە- خۆی دیاریی کردوە، کەواتە دیارەو خۆیەتی! بەلاّم زۆربەی شەرعزانان و بیرمەندان ڕایان وایە کە بەبێ ڕەزامەندیی و هەڵبژاردن پێشەوایەتییەکەی دانامەزرێ، بەلاّم ئەگەر خۆی

فەرز کرد لەسەر ئەوانەی ماڤی هەڵبژاردنییان هەیە، پێویستە گرێبەستی پێشەوایەتیی بۆ ببەستن، جا هەرکات ڕێککەوتن جێبەجێ دەکەن، چونکە پێشەوایەتیی گرێبەستەو ئەمیش بەبێ گرێدەر ناکرێ. واتە: مادام کابرا خۆی سەپاندوەو بەبێ گرێبەست (عقد)یش حوکمی ڕەوا نیە، هەر دەبێ کەسێك ئەو گرێبەستە بکات، ئەوانیش (أهل الحل والعقد)ن‌و بەناچاریی بە ملیان دا هاتوە!!

بەڵێ ئەوە (الماوردي) گوتوویەتی، بەڵام ئەوە تەنیا ڕاو بۆچوونی خۆیەتی‌و ئیستیدلال بەهیچ ئایەت‌و فەرموودەیەك ناکات، وە لە ڕاستییدا قسەکەشی ڕاستەوخۆ لەگەڵ قورئان دا تێك دەگیرێ، کە خوای بالاَ دەست دەفەرموێ: ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة، وە ﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ هود، دەجا ئەوە زوڵمی کردوەو وەبەر لەعنەتی خوا کەوتوە، چۆن دەبێ حوکمڕان‌و براگەورەی مسوڵمانان بێ!؟

ئنجا پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: **{خِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتَدْعُونَ لَهُمْ وَيَدْعُونَ لَكُمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ}**[1]، واتە: باشترین پێشەوایانتان ئەوانەن کە خۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن، وە دوعایان بۆ دەکەن و دوعاتان بۆ دەکەن، وە خراپترین پێشەوایانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانە، وە لەعنەتیان لێ دەکەن‌و لەعنەتتان لێ دەکەن.

---

[1] أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٩١٠)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٢٦٤) وَقَالَ: حَسَنٌ غريب، واللَّفظُ لَهُ، وقال الشيخ الألباني: صحيح.

جا باشە ئەو خراپترین دەسەڵاتدارە، چۆن بەیعەتی دەچێتە گەردنی مسوڵمانانەوەو، چۆن مسوڵمانان مولزەم دەبن بەوەی کە بەحوکمڕان و برا گەورەی خۆیانی بزانن؟!

وەك دەبینین: مەسەلەی هەڵبژێررانی حوکمڕان لەلایەن خەڵکەوەو ڕەزامەندیی هەبوونیان لەسەری و پەیمان (بیعة) پێدرانی، زۆر لە ئەسڵی شەرعییانەی خۆی دوور خراوەتەوەو، لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی کراوەتەوە.

بۆیەش گوتم: دەبێ وریابین و بەهەڵە بەکارهێنانی هەندێك لە بنەمایەکانی حوکمڕانیی ئیسلامیی و لێ لادانیان، ئەو پایەو بنەمایانەمان لەبەرچاو نەخەن و، هەقمان هەر پێ هەق و ڕاست بێ، ئەگەر بەهەڵەو بۆ مەبەستی خراپیش بەکارهێنرابێ!

*بەرپەرچدانەوەی بە مەرجگیرانی قوڕەیشیی بوونی حوکمڕان:*

مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ هەیە کە پێویست بەوە دەکات ئێمە لە داهاتوودا بە تێرو تەسەلیی قسەی لەبارەوە بکەین، بەڵام ئێستا هەر ئەوەندە دەڵێم کە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەیە کە دەفەرموێ: {**الأَئِمَّةُ مِنْ قُرَيْشٍ**}[1]. کە زانایان لەسەر سەنەدەکەی مشتومڕیان هەیە، بەڵام ئەگەر سەنەدەکەی ڕاست بێت، مەبەستی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەیە کە وەك ئەمری واقیع لە ڕۆژگاری ئەودا هۆزو تیرەکانی دیکەی عەرەب ڕازی نەدەبوون، بێجگە لە قوڕەیش برا گەورەیان لە هۆزێکی دیکە بێ، واتە: وەك ئەمری واقیع باسی کردوە، کە ئەگەر دەتانەوێ بەرپرسێك هەڵبژێرن، هۆزو تیرەکانی عەرەب هەموویان بەقسەی بکەن و لە دەوری کۆببنەوە، پێویستە لە هۆزی قوڕەیش بێت، بەبەڵگەی ئەوە کە

---

[1] رواه أحمد برقم: (١٩٧٩٢)، والطبراني في (الكبير) برقم: (٧٢٥)، والبيهقي في الشعب برقم: (١٦١٤)، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) رقم: (٢٧٥٧).

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمایشتی دیکەی هەیە دەفەرموێ: **{اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنْ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ}**[1]، واتە: گوێبیست بن و فەرمانبەردار بن، ئەگەر کەسێکیش بەسەرتانەوە بوو بەبرا گەورەو بەرپرس، کە سەری وەك مێوژێکی ڕەش وابێ!! هەروەها فەرمایشتی دیکەش زۆرن لەو بارەوەو ئایەتەکانیش زۆر بە ڕەهایی باسی حوکمڕانی مسوڵمانان و بەرپرسەکانیان دەکەن.

*بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی: سێبەری خوابوونی حوکمڕان:*

دەمەوێ لێرەدا هەر لە بارەی لادان لە سیستەمی حومڕانیی ئیسلامیی، یان بەهەڵە بەکارهێنانی هەندێك لە بنەمایەکانی یەوە، ئاماژە بکەم بۆ قسەیەکی (أبو جعفر المنصور) دووەمین خەلیفەی بنەماڵەی عەبباسیی، هەڵبەتە ئەویش ئەگەر قسەکەی سەنەدەکەی ڕاست بێت، چونکە (العقد الفريد في الأدب)ی (ابن عبد ربه) هێناویەتی، وەك (د.عبدالحميد متولي) لە (مبادىء نظام الحكم في الإسلام)[2] هێناویەتی، گوایە ئەبوجەعفەری مەنصور ڕۆژێك گوتوویەتی:

**(أيهاالناس! انما أنا سلطان الله في أرضِه أسوسكم بتَوفِيقه وتأييدِه، وحارسهُ على مالِه أعملُ فيهِ بِمَشيئَتِه وارادَتِه وأعطيهِ بإذنِه، فَقَد جَعَلَني اللهُ عليهِ قفلاً، ان شاءَ أن يفتحني فتحني لأعطيكم عطاءَكم وأُقسِّم أرزاقكم، وان شاءَ أن يقفلَني، أقفلني).**

واتە: ئەی خەڵکینە! من دەسەڵاتداری خوام لەسەر زەوی خوا، بەیارمەتی خواو بە پشتگیریی خوا حوکمڕانییتان لە سەر دەکەم {واتە: هەرچی کردم، ئەوە دیارە لە خواوەیە}، وەمن پاسەوانی خوام لەسەر ئەو ماڵ و سامانەی خوا، کەلە بەردەستی من دایناوە وە بەویستی خوا و بە خواستی خوا ئیش لەو

---

[1] أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٦٤) عن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ .
[2] ص ١٩٠.

ماڵ و سامانەدا دەکەم، وە بەفەرمانی خوا دەیبەخشم، وە خوا منی لەسەر ئەو سامان و ماڵەتان کردۆتە قوفڵ، ئەگەر ویستی بمکاتەوە دەمکاتەوە، بۆ ئەوی بتاندەمیٚ و وە مووچەکان تان بەسەردا دابەش بکەم، وە ئەگەر ویستیشی دامبخات، ئەوە دامدەخات و هیچتان نادەمیٚ.

واتە: ئەگەر پێمدان، ئەوە خوا پێی فەرمووم، وە ئەگەر نەشمدانیٚ، ئەوە دیارە هەر خوای پەوەردگار پێی فەرمووم!! کە دیارە ئەوە سیۆکڕاسییەکی زۆر بیٚ مانایە! چونکە سیٚ جۆر ثیۆکڕاسیی هەیە: یەکەم: کە حوکمڕان خۆی بەخوا زانیوە، دووەم: کە حوکمڕان خۆی بە نوێنەری ڕاستەوخۆی خوا زانیوە، سێیەم: کە حوکمڕان و دەستەڵاتدار خۆی بە نوێنەری ناڕاستەوخۆی خوا زانیوە، جا ئەوەی (أبو جعفر) بەلای کەمەوە دەچێتە خانەی جۆری دووەمی سیستەمی سیۆکڕاسیی یەوە !!.

بەلام بە تەئکید ئێمە کاتێك کە هەڵوێستێکی ئاوای ئەبو جەعفەری مەنصوور یان هەر کەسێکی دیکە دەبینین، پێویستە بیگێڕینەوە بۆ تەرازووی شەریعەت، وەك خوای دادگەر دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ... ﴿١٠﴾ ﴾ الشورى. واتە: جا هەرشتێك تێیدا کەوتنە ڕاجیاییەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا، جا ئایا کتێبی خوا چی دەفەرمویٚ؟ دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن، واتە: خوا سەرزەوی بۆ هەموو خەڵك داناوە، وە دەفەرمویٚ: ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ... ﴿٣٣﴾ ﴾ النور، واتە: وەلەو ماڵەی کە خوا پێی داون، پێیان ببەخشن، واتە: لەئەسلٚ دا هی خوایەو بە ئێوەی داوە، ئیدی بەکەسی نەداوە بە تایبەت، وە فەرموویەتی: نیعمەتەکان هەموویان هی خوای پەروەردگارن، بۆ هەموو خەڵك: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة.

## ٣- سروشت و چۆنیەتی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی:

سروشتی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا، سروشتێکی تایبەتەو کۆمەڵێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە، وە بەڕاستیی ئێمە مەدحی ئیسلام ناکەین کاتێك کە سیستەمە حوکمڕانییەکەی بەراوردو قیاس دەکەین لەگەڵ سیستەمێکی حوکمڕانیی دیکەدا، کە لەم سەردەمەی ئێمە دا ڕەواجی هەیەو، ڕەنگە دوای ئەم سەردەمەی ئێمە لە ڕەواج بکەوێ، مانای وایە ئێمە زوڵممان لە ئیسلام کردوە، چونکە وا لێکدەدرێتەوە کە ئەوە ئیسلامیش لە ڕەواج کەوت!!

بەڵێ ئێمە دەبێ ئەوەندە متمانەمان بەخوای پەوەردگاری خۆمان هەبێ و پێی پشت ئەستوور بین و باوەڕ (ثقة)مان بە شەریعەت و بەرنامەکەی هەبێ کە بەراوردی پێ نەکەین لەگەڵ هیچ سیستەمێکی دیکەدا، بەو واتایە کە سیستەمێکی دیکە بکەینە پێوەرو ئیسلامی لەگەڵ بپێوین، بەڵکو دەبێ بڵێین: ئیسلام سیستەمە حوکمڕانییەکەیشی وەك هەر شتێکی دیکەی: وەك بوونناسی یەکەی، وەك عەقیدەکەی، وەك شەریعەتەکەی، وەك هەموو بوارەکانی دیکەی، سروشتی تایبەتیی خۆی هەیە، وە تایبەتمەتدیی خۆی هەیە، وە لە ڕاستییدا زوڵمی لێ دەکەین کاتێك کە دەیخەینە تەرازووەوە لەگەڵ سیستەمێکی دیکەدا.

بۆ وێنە: جاری وا هەیە دەپرسرێ: ئایا سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دەتوانین بڵێین: سیستەمێکی دیموکڕاسییە، لە سەدا سەد؟!! ئەدی ئەگەر دیموکڕاسیی نەبێت، ئایا سیۆکڕاسییە؟ یان ئایا سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دەتوانین بڵێین: سیستەمێکی دینییە؟ ئەدی ئەگەر دینیی نەبێ ئایا مەدەنییە؟ ئنجا ئەگەر مەدەنییە، ئایا بەو واتایەی کە لە ڕۆژئاوا هەیە؟!

بۆیە دەڵێین: لە ڕاستییدا سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، ئەگەر باش سەرنجی بدەین -وەك لە باسەکانی داهاتوودا باش بۆمان ڕوون دەبێتەوە- دڵنیا دەبین کە سروشتێکی تایبەتیی خۆی هەیە، چ لە ڕووی بناغە فیکرییەکەیەوە، چ لەڕووی تایبەتمەندییەکانییەوە، چ لەڕووی میکانیزمەکانییەوە، بەڵام ئەمە

ئەوە ناگەیەنێ کە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی کارتێکراو نابێ‌و نەبووە بە سیستەمەکانی دیکەی حوکمڕانیی، دیسان ئەوەش ناگەیەنێ کە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی کاریگەریی نەبووە بۆ سەر سیستەمەکانی دیکە.

دەتوانم زۆر بە دڵنیاییەوە بڵێم هەرکام لە (تۆماس هۆبز) و (جۆن لۆك) وە (جانجاك ڕۆسۆ) کە دەربارەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی (العقد الإجتماعي) یان گرێبەستی سیاسیی (العقد السياسي) لەکتێبەکانیان دا هەرکامێکیان بە شێوەی خۆی قسەکەی کردوە، دەتوانم بە دڵنیایەوە بڵێم: ئەوە تیشکی شێوەی حوکمڕانیی ئیسلامیی بووە لە ڕۆژئاوای داوەو، ئەوانەی بەهۆش هێناوەتەوە، چونکە لە پێش ئەوەداو لە سەردەمی ئەوانیش دا سیستەمی سیۆکراسیی لە ڕۆژئاوادا هەبوو و حوکمڕان بە پەرستراو (إلە) دادەنرا، دوایی بە وەکیلی ڕاستەوخۆی خواو، پاشان بە وەکیلی ناڕاستەوخۆی خوا!! ئنجا ئایا ئەوانە چۆنیان ئەو بیرۆکەیە بۆ هات؟ لە ڕاستیدا لە سیستەمی حوکمڕانیی‌و لە دەوڵەتی ئیسلامییەوە ئەوە فێر بوون، کە حوکمڕانی کۆمەڵگا نوێنەری مسوڵمانانەو نوێنەری خوا نیە، بەڵکو مسوڵمانان دایدەنێن‌و چاودێریشی دەکەن، وە دەتوانن لاشی بەرن، وەك دوایی ئێمە لە باسەکانی داهاتوودا دەیخەینە ڕوو، هەروەها بە بارەکەی دیکەش دا: ئایا ئێمە ئێستە بۆ کاراکردنی ڕاوێژ (شورى) کە بناغەی کاروبار بەڕێوەبردنە: کاروباری سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی...هتد، ئایا ئێمە بۆ کاراکردنی ڕاوێژ پێویستییمان بە میکانیزمەکانی دیموکراسیی نابێ؟ پێویستییمان بە ئەزموونەکانی دیموکراسیی نابێ؟ با، بەتەئکید پێویستییمان پێیان دەبێ، چونکە ئەوان لەو بارەوە زۆر بەرەو پێش چوون و ئەزموونی دەوڵەمەندیان هەیە، ئنجا ئایا کاتێك کە ئێمە دێنین بۆ کاراکردنی ڕاوێژو بەرجەستەکردنی لەنێو سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا، لە ئەزموونەکانی دیموکراسیی‌و لە میکانیزمەکانی دیموکراسیی بەهرەمەند دەبین، ئایا ئێمە شتێکی ناشەرعییمان کردوە؟

بێگومـان نـەخێر، چـونکە ئیسـلام دەسـتی نـەگرتووین کـە سـوود ببیـنین لـە ئەزموونی خەڵکی دیکە، وەك دەستی عومەری کوڕی خەتتابیشی نـەگرت (خـوا لێـی ڕازی بێـت) کـە لـە دەوڵـەتی فـارس و ڕۆم بەهرەمەنـد ببێ، بـۆ کۆمـەڵێك اروباری ئیداریی، وەك: دانانی دیوانەکانو پۆستەو حەپسخانەو ...هتد.

کەواتــە: کــە دەڵــێین: سیســتەمی حــوکمڕانیی لــە ئیســلام دا سروشــتێکی تایبەتی خۆی هەیەو، وە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی خۆی هەن، وە زوڵم لەئیسلام دەکەین کاتێـك دەڵـێین: سیستەمی حـوکمڕانیی ئیسلامیی دیموکڕاسییە، یـان دیکتاتۆرییـە، یـان سیۆکڕاسـییە، یـان... یـان... هتـد، بـەڵکو هـەر دەبـێ بڵـێین: (سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی)، ئەوە مانای ئـەوە نیـە کـە خـاڵی هاوبەشـی لەگـەڵ سیسـتەمەکانی دیکـەی حـوکمڕانیی دا نیـەو، کاریـان تێناکـاتو کـاری تێناکەن! بەڵام ئایـا لـە دیمۆکڕاسیی یـەوە نزیـك تـرە یـان لـە دیکتاتۆرییـەوە؟ لەڕاستییدا پشتی لەدیکتاتۆریی یەو خاڵی هاوبەشـی لەگەڵ دیموکراسـییدا زۆر زۆرن، یـان ئایـا سیسـتەمی حـوکمڕانیی ئیسـلامیی سیۆکڕاسـیی یـە؟ دەڵـێین: نەخێر، دیارە حوکمی ئیسلامیی پشت بە ئیسلام دەبەستێ، بـەڵام دروسـت نیـە بڵێین حوکمی ئیسلامیی سیۆکڕاسیی یە، بۆچی؟ چونکە ئـەو وشـەیە چـەمكو واتایـەکی جیـاوازی هەیـە لـە فیکـرو فەرهـەنگی ڕۆژئاواییـەکان دا کـە بریتیـە لەوەی چینێك (طبقة) بەناوی (ئەکلیرۆس) واتە: پیاوانی ئایین (رجـال الـدین) بەسەر خەڵك دا بەناوی خواوە حوکمڕانیی بکەنو، کەسیش قسە لە قسەیان دا نەکاتو بە پیرۆز (مقدّس) دابنـرێن! بـەڵام لـە ئیسلام دا کـەس نوێنـەری خـوا نیەو مسوڵمانان هەموویان نوێنەری خوان، وە هیچ کەس تەخویل نـەکراوە لـە لایەن خواوەو، هیچ کەسێكو هیچ بنەماڵەیەك بۆی نیە، دەسەڵاتی سیاسیی بە دەست خۆیەوە بگرێ و قۆرخی بکات .

کەواتە: بەڵێ، سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی پشت بە ئیسلام دەبەستێو بــە دەقــەکانی شــەریعەتەوە پەیوەســتە، بــەڵام ناشــگونجێ بڵــێین: حــوکمێکی

سیۆکراسیی‌و ئایینی یە، هەروەها لەولاشەوە: سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی پشت بە ئیرادەی خەڵك دەبەستێ، بەڵام دیسان ناشگونجێ بڵێین: لە سەدا سەد (٪ ١٠٠) دیموکراسیی یە، بۆچی؟ چونکە ئیرادەی خەڵك بەستراوەتەوە بە شەریعەتەوەو، وەك ڕۆژئاوا نیە کە لە دیموکراسیی ڕۆژئاوادا دەستی خەڵك ئاوەڵایە بەتەواویی‌و هیچ حەڵاڵ‌و حەرامێکیان لە بەردەم دا نیە ، بەڵام لە ئیسلام دا کۆمەڵێك شتی نەگۆڕ هەن، ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامەو، ئیرادەی خەڵك دەبێ پابەند بێت بەو سنوورانەوەو بۆی نیە لێیان لابدات.

*چۆن سیستەمێکی حوکمڕانیی ئیسلامیی پەیدا بکەین؟!*

لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین.

❖ ئێمە سێ حاڵەتمان لەبەردەمدا هەن:

یەکەمیان/ کە چاوەڕوانی ئەوە بین سیستەمێکی ئامادەکراوو حازر بەدەستمان لەبەردەست دا بێ، کە ئەوە هەیە، بەڵام قاڵبێکە بۆ واقیع‌و هەل‌و مەرجی زەمانێکی دیکە داڕێژراوە !! وە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە داڕێژراوە، ئەویش ئەوەیە کە (**الماوردي**) لە (أحكام السلطانية)دا هێناویەتی، وە باقی کتێبەکانی دیکەی سیاسییش هەر هێناویانە، ئەوە هەیە، بەڵام ئەوە قاڵبێکە کە بۆ واقیعێکی دیکە داڕێژراوەو میکانزمێکە بۆ حاڵەتێکی دیکە دانراوەو، بە کەڵکی ئێستا نایەت، ئنجا بەڕاستیی من زۆر بەزەییم بەو کەسانەدا دێتەوە کە باسی دەوڵەتی ئیسلامیی‌و باسی گۆڕینی واقیع دەکەن‌و باسی دروستکردنی قەوارەی ئیسلامیی دەکەن، بەڵام زاراوەکانی: (خليفة)و (وزير التفويض)و (وزير التنفيذ)و (والي)و (عامل)و ....هتد بەکاردێنن، بێ خەبەر لەوەی کە ئەو فۆڕم‌و میکانیزم‌و زاراوانە بۆ واقیعێکی دیکە دانراون، بەڵێ لە ئیسلام دا دەبێت کەسی یەکەم هەبێت، بەڵام ناوی بنێین (خليفه) یان (أمیر

**المؤمنين)** یان (سوڵتان) یان هەر ناوێکی دیکە: سەرۆك كۆمار، سەرۆکی دەوڵەت، سەرۆك وەزیران، هەر دروستە، گرنگ ئەوەیە تۆ حوکمڕانێکت هەبێ شەریعەت پیادە بکات بەسەر کۆمەڵگا دا، ئەمما ناوی چییە؟ ئەوە شەرع دەستی ئێمەی نەبەستوە، بەڵکو دەستی ئێمەی کردۆتەوە، پاشان دەبێ کەسی یەکەمی حوکمڕان ستافێکی هەبێ‌و کۆمەڵێك هاوکاری هەبن، بەلاّم ناوو نیشان و سنووری دەسترۆیشتوێتیی (صلاحیة)یان چۆن بێ؟ پاشان کاتێکی دیاری کراوی بۆ دادەنێین چوار ساڵ چوار ساڵ، دوو دەورە، سێ دەورە، یان حەوت ساڵ حەوت ساڵ، یان بۆی دانانێین، دیسان شەریعەت دەستی ئێمەی نەبەستوەو هەردووك لامان بۆ هەیە، ئەوە ڕێیەکیان، کە ئەگەر بمانەوێ قاڵبێکمان لە بەردەست دا بێ، بەڵێ ئەو قالبە هەیە، بەڵام قاڵبێکە بە کەڵکی ئێستا نایەت!.

دووەمیان/ ئەوەیە کە ئێمە بە یەکجاریی حیساب بۆ ئیسلام نەکەین، مادام قاڵبێکی حوکمڕانیی ئامادەی نیە، کەواتە با هەر واز لە ئیسلام‌و شەریعەت بێنین‌و بچین قاڵبێکی خەڵکێکی دیکە بێنین، کە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە دانراوە، کە ئەوەی یەکەمیان چەند هەڵە بوو، ئەوە دووەمیان زیاتر هەڵەیە! کە یەکسەر سیستەمێکی ڕۆژئاوایی، یان ڕۆژهەلاّتیی بێنین‌و لە ولاّتی خۆمانی فەرز بکەین!! کە بەتەئکید ئەوەش هەر هەڵەیە.

سێیەمیان/ چارەسەری سێیەم‌و ڕاست ئەوەیە، کە ئێمە بێنین لەبەر ڕۆشنایی ئەو چوار چێوە فراوانەی کە شەریعەت دیاریی کردوە بۆ سیستەمی حوکمڕانیی، وە لەبەر ڕۆشنایی ئەو بنەما بنەڕەتییانەدا کە داینـاون، بێنین عەقڵی خۆمان بخەینە کارو ئیجتیهاد بکەین بۆ دانانی میکانیزمەکان‌و وردەکارییەکانی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو قەوارە سیاسییەی کە دەمانەوێ بنیاتی بنێین.

هەڵبەتە ئیجتهادیش –کە بۆ زانیارییتان ئیجتیهاد واتە: کۆشش کردن و بەکارهێنانی عەقڵ- لە ڕاستییدا شوێنە سروشتییەکەی، بواری هەڵسوکەوتەکانە کە شەریعەت بە بۆشیی هێشتوویەتەوە، جگە لە هەندێك هێڵی گشتی، بەڵێ شوێنی بەکارهێنانی عەقڵو ئیجتیهاد ئێرەیە، نەك بواری عەقیدەو عیبادەت، وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، کە بە داخەوە زۆر لە زانایانی ئیسلام، هەر لەو بوارەدا ئیجتیهادیان کردوە، ئەو بوارەی کە دەرفەتی کۆشش کردنی تێدا کەمە، لەبەر ئەوەی دەقەکانی شەریعەتی تێدا زۆرن، وە لەبەر ئەوەی کە عەقڵ لەوێدا زۆر بڕ ناکات، ئاخر عەقیدەو ئیمانو بووناسییو عیبادەت بۆ خوای پەروەردگارو ئەخلاقو باری کەسێتییو ئەوانە، عەقڵ زۆر تێیاندا بڕ ناکات، بۆیە شەریعەت نوختەی تێدا خستوونەتە سەر پیت، کەچی ئەگەر تەماشای بەرهەمو کەلەپووری زانایانی خۆمان بکەین، دەبینین بەزۆریی لەو بوارانەدایە، کە نەدەبوو زۆر ئیجتهادیان تێدا بکرێ، بەلام ئەوەی کە ئێمە زۆر پێویستە ئیجتیهادی تێدا بکەین، ئەوەیە کە شەریعەت لە ڕووی حیکمەتەوە بە بۆشیی هێشتوویەتەوە، چونکە زانیویەتی کۆمەڵگاکان لەو بوارانەدا زۆر دەگۆڕێنو بەرەو پێش دەچن، وە پێویستە کە ئیجتیهادی تازەیان بۆ بکرێ، کە بواری سیاسەت و حوکمڕانیی گرنگترینی ئەو بوارانەیە.

کەواتە چارەسەر ئەوەیە کە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی ڕوونو بێ چەند چوونی ئیسلام، کە بریتیە لە قورئانو سوننەت، وە بەهرەیش وەربگرین لە کەلەپووری زانایان، بەلام لە خۆمانی نەکەین بەدین، بەڵکو سوودی لێ وەربگرینو پەندی لێوەربگرین، چ لە هەڵەکانیان، چ لە چاکەکانیان، هەروەها سوودیش لە ئەزموونو شارەزایی خەڵکی دیکەش وەربگرین، لەبەر ڕۆشنایی بازنەی فراوانی شەریعەت دا.

## ٤- بناغەی فیکریی و عەقیدەیی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی:

خوێنەری بەڕێز!

بێگومان سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی (نظام الحكم في الإسلام) واتە: ئەو شێوەیە کە ئیسلام ڕەچاوی کردوە بۆ دەوڵەتداریی‌و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، کەم‌و زۆر خاڵی هاوبەشی هەن لەگەڵ سیستەمەکانی دیکەی حوکمڕانیی دا، بەڵام بە تەئکید خاڵی جیاوازیشی هەن، وە تایبەتمەندیی خۆیشی هەن.

ئنجا ئێمە لە ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە ناگونجێ سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، هیچ نازناوێکی دیکەی بۆ بەکار بهێنرێ‌و هیچ ناوونیشانێکی دیکەی هەبێ جگە لە: (سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی).

ئێستاش ئێمە لەم بڕگەیەدا باسی بناغەی فیکریی‌و عەقیدەیی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دەکەین، چونکە هەر سیستەمێکی حوکمڕانیی بگرین‌و هەر شێوەیەك لە شێوەکانی دەوڵەتداریی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کۆمەڵگا بگرین، پشت بە سەرچاوەیەکی فیکریی دەبەستێ‌و چەند بنەمایەکی فیکریی هەن: چۆن بوون (وجود) دەبینێ؟ چۆن ژیان دەبینێ؟ چۆن تەماشای دنیاو دوارۆژ دەکات؟! ئەوە هەمووی کاریگەریی هەیە لەسەر شێوەی ئەو سیستەمە حوکمڕانییە، بۆ وێنە: ئەگەر تەماشای سیۆکراسیی بکەین، کە بەحوکمی دینییش ناوبراوەو، کاتی خۆی لە سەدەکانی نێوەڕاست داو هەتا پێش سەدەی (١٧) و (١٨) لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا باو بووە، دەبینین کە جۆرێك لە فەلسەفەو بونناسیی لە پشتەوەیە، ئەویش ئەوەبووە کە حوکمڕان و دەسەڵاتدار بە پەرستراو زانراوە، یان بە سێبەری خواو بە نوێنەری خوا (جا نوێنەری ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆی خوا) (سبحانه وتعالى)!!.

هەروەها سیستەمی حوکمڕانیی پادشایەتیی یان میراتیی، بەهەمان شێوە ئەویش فەلسەفەیەکی لە پشتەوەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بنەماڵەیە، لە هەموو خەڵکەکەی دیکە زیاتر شایستەی ئەوەن کە حوکمڕان بن، بۆیە لە بابەوە بۆ کوڕو لە کوڕەوە بۆ نەوە، حوکمڕانیی بە میرات گیراوە، واتە: وەك چۆن مەڕ و ماڵات بە میرات دەگیرێ‌و، زەوی و زار بە میرات دەگیرێ، بە هەمان شێوەش خەڵك و کۆمەڵگایش بە میرات گیراوە.

وەسیستەمی حوکمڕانیی دیکتاتۆریی یاخود تاکیی، بەهەمان شێوە جۆرێك لە فەلسەفەی لە پشتەوەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسەی حوکمی ڕەهای کەوتۆتە دەست، وەك کاتی خۆی (هیتلەر ) لە ئەڵمانیاو (مۆسۆلۆنی) لە ئیتالیاو (ستالین) لە یەکیەتی سۆڤیەت، جۆرێك لە پیرۆزیی‌و تایبەتمەندیی جیا لە خەڵك بە باڵای ئەو حوکمڕانە بڕاوە، کە شایستەی ئەوەیە هەر خۆی حوکمڕان هەمە کارە بێ‌و، هەموو شتێکی بەدەست بێ، نەك بگەڕێتەوە بۆ ئیرادەی خەڵك و بۆ ڕای خەڵك، کە دیارە هەموو ئەو جۆرە سیستەمانە ئیسلام لە دژیانەو لەگەڵیان دا ناکۆکە.

بەڵام ئێمە وەك نموونە هێنامانەوە، بۆ ئەوە کە هەرکامێك لەوانە فەلسەفەیەکی لە پشتەوەیە، دیارە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییش بە تەئکید جۆرێك لە بوونناسیی‌و جیهانبینیی و ئیمان و عەقیدەی لە پشتەوەیە. ئنجا ئایا بناغەی فکریی سیتەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی چییەو چۆنە؟ دەتوانین بەکورتیی بڵێین: سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی هەم پەیوەستە بە بوونناسیی ئیسلامییەوەو، هەم پەیوەستە بە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە کەدیارە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییش لە بونناسیی یەکەیەوە سەرچاوە دەگرێ.

کەواتە: ئێمە دەبێ باسی ئەوە بکەین بوونناسیی ئیسلامی چییە؟ پێناسەیەکی کورتی بکەین، پاشان هێڵە گشتییەکانی بخەینەڕوو، وە دوایش

چۆنیەتی پەیوەست بوونی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بە بووناسیی یەوە بخەینە ڕوو، دواتریش باسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بکەین و چۆنیەتی پەیوەست بوونی سیستەمی حوکمڕانیی، بە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی یەوە بخەینە ڕوو، لە هێڵە گشتییەکان و لە پایە سەرەکییەکانی ئیمان و عقیدەدا.

*پێناسەی بووناسیی ئیسلامیی:*

بووناسیی[1] کە لە زمانە ڕۆژئاواییەکان دا (ئەنتۆلۆژیا antology)ی بۆ بەکار دێنن، بەعەرەبیی (معرفة الوجود) بریتییە لە تەماشاکردنی بوون (الوجود) واتە: بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (الخالق والمخلوق)، بووناسیی ئیسلامییش، جۆری تێڕوانینی ئیسلامە بۆخوا (سبحانە وتعالی) وەك تاکە بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگارو پەرستراوی شایستەو، مرۆڤو ژیان و دنیاو دوارۆژو ئاسمان و زەوی و ڕووح و جەستەو...هتد.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، پێنج هێڵی گشتی دەبینین بۆ چۆنیەتی تێڕوانینی ئیسلام بۆ ( بوون)[2]:

*هێڵی یەکەمی بووناسیی ئیسلامیی:*

خوا (سبحانە وتعالی) تاکە بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و سەپەرشتیارو، پاشان تاکە زاتێکە کە شایستەی پەستران و بەندایەتیی بۆ کران بێت، ئەمە هێڵی یەکەم بەڵکو بەردی بناغەی بووناسیی ئیسلامییە، با

---

[1] زاراوەی بووناسیی (معرفة الوجود) داهێنانی خۆمەو پێم چاکترو ڕاستترە لە جیهانبینیی و دنیابینی، چونکە چەمك و واتای ئەوان زۆر بەرتەسك و گچکەیەو بێگومان (بووناسیی) لەماناو تەرجەمەی (ئەنتۆلۆژیا antologyi)ش نیزیکترە.

[2] لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان دا) بە درێژیی باسی بووناسیی ئیسلامیی مان کردوە.

تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین، کە من بەنموونە هێناومنەوە لە نێو زۆر لە ئایەتەکانی قورئان دا، ئەگەر سەرنجیان بدەین، ئەو حەقیقەتە لە قورئان دا زۆر بەرجەستە و درەوشاوەیە:

١- لە سوورەتی (الزمر) ئایەتەکانی ژمارە (٦٢) و (٦٣)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ...﴿٦٣﴾﴾ واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەموو شتێکی بەدیهێناوەو بەسەر هەمو شتێکیشەوە چاودێرو سەرپەرشتیارە، خەزێنەکانی ئاسمانو زەوی هی وین، یاخود کلیلەکانی ئاسمان و زەوی هی وین، چونکە وشەی (مقالید) کە کۆی (مقلاد)ە، هەم بەمانای عەمبارو خەزێنەو، هەم بەمانای کلیلیش دێ[1]، واتە: خەزێنەکانی ئاسمانەکان و زەوی، وە کلیلەکانی هەموویان هی خوای پەوەردگارن.

٢- وە لە ئایەتی (١٦٤)ی سوورەتی (الأنعام)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖ ...﴿١٦٤﴾﴾ واتە: بڵێ: ئایا جگە لە خوا ڕەوایە شتێکی دیکە بکەمە پەروەردگاری خۆم لە کاتێك دا ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە، ئەمەیان باس لە پەروەردگارێتیی خوا دەکاتو خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری خۆی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێ: بڵێ: ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دیکە بخوازم کە ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە؟ پەرومردگاریش واتە: سەرپەرشتیارو خاوەنو بەخێوکەر مشوور خۆر، خوای بێوێنەو تاك پەروەردگاری

[1] المعجم الوسيط. ص٧٥٤.

هـەموو شـتێکەو هـەموو دروسـتکراوەکان بـەس خـوا سەرپەرشـتیارو پەروەردگارو بەخێوکەرو مشوورخۆریانە.

٣- وە دەربارەی خاوەنـداریێتیی خـوای پـەوەردگاریش بـۆ هـەموو شـتێك، لـە ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (آل عمران)دا دەفـەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ لێرەشـدا دیسـان خـوای تـاك و پـاك خیتاب لەگەڵ پێغەمبـەردا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) دەکـات یـان لەگـەڵ هـەر کەسـێك کـە قورئـان دەخـوێنێ، دەفـەرموێ: بڵـێ ئـەی خوایـە! خـاوەنی موڵـك، موڵـك بەهـەر کەسـێك دەدەی کـە بتـەوێ، وە لـە هـەر کەسـێکی وەردەگری و دادەڕنی کە بتـەوێ، وە هـە رکەسـێك کـە بتـەوێ باڵادەسـتی دەکەی و دەسەڵاتداری دەکەی، وە هەر کەسێك کە بتـەوێ، زەبـوون و بـێ دەسـەڵاتی دەکەی، چاکە هـەر بـە دەسـت تۆیـە، بێگومـان لەسـەر هـەموو شـتێك بـە توانـای، کەواتـە: خـوا خـاوەنی بوونـەوەرو خـاوەنی هـەموو شتێکە.

٤- وە لەوبارەوە کە خوای بەبەزەیی سەرپەرشتیارو مشوورخۆری هەموو شتێکە، لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ واتـە: شوێن ئەوە بکەون کە بۆتان دابەزێنراوە (واتـە: ئەو پەیام و بەرنامەیەی کە لە خواوە بۆتان هاتۆتە خوار) وە بەدوای سەرپەرشتیارانی دیکەی جگە لە خوا مەکەون.

واتە: خوا (سبحانە وتعالى) کە پەیام و بەرنامەی دابەزانـدوە، لـەڕێی ئـەو پەیام و بەرنامەیەوە سەرپەرشتییتان دەکات و مشوورتان لـێ دەخـوات و،

کاروبارتــان بــە ڕێــوە دەبــات، ئنجــا ئەگــەر بــە دوای کەســێکی دیکــەو بەرنامەیــەکی دیکــە بکــەون، کەواتــە کەســێکی دیکــەو لایــەنێکی دیکــەی جگــە لــە خواتــان کــردوە بــە سەرپەرشــتیارو مشــوورخۆری خۆتــان، کــە ئەوەش شیرك و کوفرە بە خوا.

٥- وە لەو بارەوە کە خوای گەورەو مەزن تاکە کەسێکە کە شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کران بێت، لەئایەتی ژمارە (١٦٣)ی سووڕەتی **(البقرة)**دا خوا دەرفەرموێ: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾ پەرستراوی ئێوە خوایە، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، خاوەنی بەزەییە وە میهرەبانە ، کەواتە: مادام خوای گەورە تاکە بەدیهێنەرەو تاکە پەروەردگارەو تاکە خاوەنەو تاکە سەرپەشتیارە، هەر ئەویش شایستەی ئەوەیە کە پەرستراو بێ و تاکە کەسێك بێ کە بەندایەتیی بۆ بکرێ.

*هێڵی دووەمی بووناسیی ئیسلامیی:*

خــوا ئاسمانــەکان و زەویو ئــەوەی کــە دەکەوێتــە نێوانیانــەوە، بــۆ ئــەوە دروســتکردوون، کــە مرۆڤیــان تێــدا تــاقی بکرێتــەوە، پاشــان دوای مــەرگ مــرۆڤ زیندوو بکرێتەوە، وە بە پێی شێوەی ژیانی کە لـە دونیـا دا گوزەرانـدوویەتی، سزا یان پاداشت بدرێتەوە.

زۆر لە ئایەتەکانی قورئانیش ئەم حەقیقەتەیان تێدا بەرجەستەیە، بۆ وێنە:

١- لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سووڕەتی (هود)دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ

ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ واته: خوا ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا هێناونە دی {واتە: بە شەش قۆناغ، چونكە ئەو كاتە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا نەبووە، تاكو ڕۆژەكانی هەفتە، لە شەممە تا هەینی پەیدا بن، كەواتە: وشەی (أيام) كە كۆی (يوم)ە واتە: ماوەیەك لە كات، ئیدی نازانین چەندە؟} وە لەو كاتەدا بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، (ئنجا ئایا بۆچی خوا ئاسمانەكان و زەوی هێناونە دی؟) (لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا) تاكو تاقیتان بكاتەوە كە كامەتان كردەوەی چاكترە ، (وشەی كردەوە (عمل)یش لە بەكارهێنانی قورئان دا، هەم نیەتی نێو دڵ دەگرێتەوەو، هەم دەربڕینی زمانو، هەم جموجۆڵی ئەندامەكان، كەواتە: ئەو حیكمەتو ئامانجەی كە ئاسمانەكان و زەوی بۆ هێنراونەتە دی، بریتیە لە تاقیكرانەوەی ئینسان). دوایی دەفەرموێ: (...وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ) وە ئەگەر تۆ بڵێی: لە دوای مەرگ زیندوو دەكرێنەوە، ئەوانەی بێ بڕوان دەڵێن: ئەوە جادوویەكی ئاشكرایە، (واتە: ئەو قسەیەی كە دەیڵێ جادوویەو حەقیقەتی نیە).

كەواتە: ئاسمانەكانو زەوی، كە وشەی بوونەوەر لەڕاستییدا تەنیا تەعبیر لەگۆشەیەكی بوون (وجود) دەكا، لە گۆشەیەك لەوەی كە خوا دروستی كردوە، كە بریتیە لەوەی هەتا ئێستا بە دوور بینەكان دەبینرێو بینراوە، بەڵێ خوا ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بۆیە دروست كردوە، كە ئینسانیان تێدا تاقی بكاتەوە، وە دوای مەرگیش ئینسان زیندوو دەكرێتەوە، بۆ ئەوەی سزا و پاداشت بدرێتەوە.

٢- وە لە ئایەتەكانی ژمارە (١١٥) و (١١٦)ی سوورەتی (المؤمنون)دا خوای بێ هاوەڵ مەسەلەی زیندووكرانەوەی دوای مەرگ، وە سزا و پاداشت درانەوەی مرۆڤ، زۆر جوان ڕوون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾ بە نكوولێی لێكردنەوە خوای كاربەجێ ڕوو لە بێ بڕوایەكان دەكاتو دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە بە گاڵتە خوڵقاندوومانن، بێ حیكمەتو بە هەوەنتە ئێوەمان دروست كردوە؟ وە بۆلای ئێمە ناگێڕدرێنەوە!! بەرزیی بۆ خوای پادشای حەق، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، خاوەنی بارەگای پڕ ڕێز و حورمەتە، واتە: زۆر لە حیكمەتی خوا دوورەو، زۆر لە بەرزیی خوا دوورەو، زۆر لە كاربەجێی خوا دوورە، كەئینسان بخوڵقێنێ، بەلأم دوایی زیندووی نەكاتەوەو، لێپرسینەوەی لەگەڵ دا نەكات ، خوا زۆر لەوە بەرزترە كە كردەوەی وا لە خۆی بوەشێنێتەوە، واتە: بەتەئكید مرۆڤ دوای ئەوەی كە قۆناغی ژیانی دنیا دەگوزەرێنێ، زیندوو دەكرێتەوەو لێی دەپرسرێتەوە، وە سزا و پاداشتی دەدرێتەوە، بە پێی ئەو جۆرە ژیانە كە لە دنیادا گوزەراندوویەتی.

٣- هەروەها لە سوورەتی (سبأ) ئایەتەكانی ژمارە: (٣ و ٤ و ٥)دا خوا (سبحانه وتعالى) زیاتر تیشك دەخاتە سەر ئەو ڕاستییەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ

لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ سَعَوْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾) واتە: وە ئەوانەی بێ بڕوان گوتیان: قیامەتمان بۆ نایەت (یانی: ئەو کاتەی کە دنیای تێدا وێران دەبێ‌و بوونەوەری تێدا تێك دەچێ، یان ئەو کاتەی کە تێیدا زیندوو دەکرێینەوە بۆ سزاو پاداشت) تۆ بڵێ: با، سوێند بە پەروەردگارم، بەمسۆگەریی ئەو کاتە دێ، خوا زانای پەنهانە، هیچ شتێکی لێ ون نابێ، تەنانەت ئەگەر بەقەدەر قورسایی گەردیلەیەکیش بێ، نە لە ئاسمان و نە لە زەوی دا، وە نە لەوە بچووکترو نەگەورەتر، ون نابێت و هەمووی لە نووسراوێك ڕووندا سەرژمێر کراوە، تاکو ئەوانەی ئیمان و کردەوەی باشیان هەبووە، پاداشتیان بداتەوە، ئەوانە لێبوردن‌و بژێوێکی پڕ ڕێزو حورمەتیان هەیە، وە ئەوانەش کە تێکۆشاون لە دژی ئایەتەکانی ئێمە، کە ئایەتەکانی ئێمە پەك بخەن‌و دەسەوستانیان بکەن، ئەوانەش ئازارێکیان بۆ هەیە لە ئێشێکی ڕیسواکەر.

### هێڵی سێیەمی بوونناسیی ئیسلامیی:

خوا (تبارك وتعالى) مرۆڤی بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی داناوە، لە چاکترین شێوە دا دروستی کردووە، سپاردەی خۆی پێ سپاردووە، ڕێزی لێناوە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، بۆی مەیسەر کردوە.

لەو بارەشەوە ئایەتی قورئانی بەڕێز زۆرن، بۆ نموونە:

١- خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمووی: من

جێنشینێك لە سەر زەویدا دادەنێم، فریشتەكان گوتیان: ئایا كەسێكی تێدا دادەنێی كە خراپەی تێدا دەكاو خوێنی تێدا دەڕێژێ، لە حاڵێك دا كە ئێمە هەمیشە تۆ بە پاك دەگرین و ستایشت دەكەین وە تۆ خاوێن ڕادەگرین {لەوەی كە نوقصانیی و كەم و كورتییت پاڵ بدەینە لا؟!} (خوا) فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نازانن، هەڵبەتە ئەم ئایەتە زۆر ڕوونە، كە مەبەست پێی ئادەمە سەلامی خوای لەسەر بێ، ئادەمیش بابی بەشەریەتە، خوا ئادەمی بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی داناوە، وە فریشتەكانیش بۆ ئەوە كە حیكمەتەكەی بزانن، پرسیویانە: بۆچی لەسەر زەوی ئادەمێك دادەنێی كە لە بارانیدا هەیە خوێن بڕێژێ و خراپە بكا؟ خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن، ڕاستە ئینسان دەتوانێ خراپە بكاو خوێن بڕێژێ، بەڵام كۆمەڵێك ئیمتیاز و تایبەتمەندییشی هەن، كە لە ئێوەدا نین، ئەی فریشتەكان! وە هەر ئینسان شایستەی ئەوەیە كە ئەو ئەركەی پێ بسپێردرێ.

٢- هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (التین) ئایەتی ژمارە (٤)دا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەخاتە ڕوو، كە چۆن ئینسان لەباشترین شێوەدا خولقێنراوە، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾ واتە: بێگومان ئینسانمان لە باشترین شێوە پێكهاتەی دەروونیی و ڕواڵەتییدا دروست كردوە، واتە ئەو شێوە دروستبوونەی ئینسان باشترین شێوەیە كە لە بوون دا هەیە.

٣- وە دەربارەی ئەوە كە ئینسان هەڵگری ئەمانەتی خوایە، ئەو ئەمانەتەی كە بە ئینسان نەبێت هەڵ نەگیرا، لە ئایەتی ژمارە (٧٢)ی سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ

وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا (٧٢)﴾ واتە: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیبگرن، وەلێی ترسان، بەڵام ئینسان هەڵیگرت، بێگومان ئەویش زۆر ستەمکار و زۆر نەفامە، واتە: ئینسان ئەگەر بەندەی خوا نەبێ و پابەندی بەرنامەی خوا نەبێ، سەری لە ستەم و نەفامیی زۆرەوە دەرەچێ، دیارە ستەم بریتیە لە لادانی ئینسان لەڕووی کردەوەییەوە، وە نەفامییش بریتیە لە لادانی ئینسان لە ڕووی فیکرییەوە، واتە: چ لە ڕووی فیکرییەوە، چ لە ڕووی کردەییەوە، ئینسان لە بارانیدا هەیە تووشی لادان و هەڵدێرانی زۆر ببێ، لە حاڵێك دا کە پابەندی بەرنامەی خوا نەبێت .

کەواتە: ئینسان ئەرکێکی پێ سپێردراوە، کە نە لە توانای ئاسمانەکاندا بووە، وە نە لە هی زەوی، وە نە لە هی چیایەکان، بەڵام ئینسان لە توانایدا هەبووە، ئەو ئەمانەتە هەڵ بگرێ، ئەو ئەمانەتەیش بەڕای زۆر لە توێژەرەوانی قورئان، ئەوەیە ئینسان بە ویستی ئازادانەی خۆی بژی و بکەوێتە ژێر تاقیکردنەوەی خوای پەروەردگار، وە بە ئیرادەی خۆی چاکە بکات، یان خراپە بکات، بەندایەتیی بۆ خوا بکات، یان نەیکات.

٤- هەروەها لەو بارەوە کە خوا ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی لە مرۆڤ ناوە، لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی ژمارە (٧٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا (٧٠)﴾ واتە: وە بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتووە و لە وشکانیی و دەریا دا هەڵمان گرتوون، وە لە ڕزقە بەتام و خۆشەکان بەشمان داون، وە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانی دیکەدا

هەڵمان بژاردوون، کەواتە: ئینسان وەك ئینسان، لە لایەن خواوە ڕێزی لێ گیراوە، ئنجا ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن: ئینسانێك ڕێز لێگیراوە کە ئیمانی هەبێت! دەڵێین: ئەوە لە ڕاستییدا بۆ دوا ڕۆژە، بەڵێ لە دوا ڕۆژدا جگە لە ئیمانداران بە تەئکید ڕێز لە کەس نانرێ، وە هیچ کەس ناخرێتە ئەو شوێنەوە کەجێی ڕێزلێگیراوانە، کە بەهەشتە، بەڵام لە دنیادا وانیەو لەم ژیانەدا هەموو ئینسانەکان وەك ئینسان ڕێز لێگیراون، چونکە خوای دادگەر بە گشتی دەفەرموێ: ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، ئیدی جیای نەکردۆتەوە ئەوانەی بڕوادارن، یاخود بێ بڕوان، بەبەڵگەی ئەوەش کە دەفەرموێ: ﴿.....وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ....﴾ وەلە وشکانیی و دەریادا هەڵمان گرتوون، واتە: هۆکارو ئامرازی وامان بۆ ڕەخساندوون کە هاتوچۆی پێ بکەن لە وشکانیی و دەریادا، کە دیارە ئەو هۆکار و ئامرازانەش مسوڵمان و کافر تێیان دا بەشدارن، بەڵکو ئێستا زیاتر بە دەستی کافرانەوەن، وە دەفەرموێ: لە ڕزق و ڕۆزییە بەتام و خۆشەکان بەشمان داون، کە ئەویش کافر و مسوڵمان تێیدا بەشدارن، کەواتە: ڕێزلێگیرانەکەش و بەچاکتر دانرانەکەش، هەموو وەچەی ئادەم و مرۆڤەکان بە گشتی تێیدا بەشدارن.

وە لە فەرموودەیەکی ڕاست(صحیح)دا هاتوە کە ڕۆژێك جەنازەی کابرایەکی جوولەکەیان هێنا، پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبەری هەڵسا، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) ئەوە جوولەکەیە، ئەویش فەرمووی: (أَوَ لَيسَ نَفساً) ئەدی نەفسی ئینسان نیە؟!![1] کەواتە: ئینسان وەك ئینسان ڕێز لێگیراوە.

٥- وەلە سووڕەتی (الجاثية) ئایەتی (١٣)دا، لەو بارەوە کە خوا هەموو شتێکی بۆ مرۆڤ مەیسەرو دەستەمۆ کردوەو، وای لێکردوە کە بتوانێ لێی بەهرە مەندبێ، دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾ واتە: وە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە (خوا) لە لایەن خواوە هەمووی بۆ ئێوە مەیسەر کردوە، بێگومان لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە.

کەواتە مرۆڤ جێنشینی خوایەو لە چاکترین شێوە دا دروستکراوەو ئەمانەتی خوای پێ سپێردراوەو ڕێزی لێ گیراوە، وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆی دەستەمۆو مەیسەر کراوە.

*هێڵی چوارەمی بوونناسیی ئیسلامیی:*

خوا (عز وجل) هەمو مرۆڤەکانی بە نێرو مێ وە لە دایك و بابێکەوە بەدیهێناون، پاشان بە مەبەستی ئاشنایەتیی هاوکاریی لە نێو خۆیان دا، بۆ چەند گەل وتیرەیەك دابەشی کردوون، وە بۆ پێوانی بەرزیی نێوانیشیان، پارێزکاریی کردۆتە تەرازوو و پێوەر.

ئەم ڕاستییەش خوای تاكو پاك لە ئایەتی ژمارە (١٣) ی سووڕەتی (الحجرات) زۆر بە ڕوونیی ڕایدەگەیەنێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ خوا بانگی بەشەر دەکاتو دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك

[1] صحيح البخاري

وەدیهێناوە، وە گێڕاومانن بەچەند گەل و تیرەیەك، تاكو یەكدی بناسن‌و پێك ئاشنا بن، بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزكارترتانە، وە بەڕاستی خوا زانای شارەزایە، كەواتە: مرۆڤەكان لە لایەن خوای پەروەردگارەوە وەك یەك دروستكراون‌و هەموویان دەچنەوە سەر نێر و مێیەك، كە ئادەم و حەووان، سەلامی خوایان لێ بێت، دابەشبوونیشیان بۆ چەند گەل و تیرەیەك، بە ئیرادەی خوایە، لەو دایك و باب‌و خێزانەوە، گەل و تیرەكان پەیدا بوون، حیكمەتەكەیشی ئەوەیە كە ژیانی بەشەر، وە پێكهاتەكانی بەشەر لەسەر زەوی جۆراو جۆر بن، وە پاشان پێكەوە ئاشنا بن و پێكەوە هاوكار بن، وە تەرازووی گرانیی و سووكیی و گەورەیی و بچووكیی بریتییە لە پارێزكاریی (التقوی) دیارە تەقوایش وەك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە فەرموودەیەكی ڕاست دا سێ جار ئاماژە بۆ سینەی پاك‌و چاك‌و موبارەكی دەكاو بە داكۆكیی كردنەوە دەفەرموێ: كە پارێزكاریی لە سینەدایە: {**اَلتَّقْوَى هَا هُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ**}[1]، واتە: تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، ئاماژەی بۆ سینگی موبارەكی كرد، واتە: ڕیشەی تەقواو هاندەری تەقوا لە سینەو دڵی ئینسانەوەیە، بێجگە لە خوا كەس پێی شارەزا نیەو كەس پێی زانا نیە، بەڵام شوێنەواری تەقوا لە ژیانی ئینسان دا دەردەكەوێ، بۆیە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خوا زانای شارەزایە، دیارە تەقوایش بۆ دوا ڕۆژ دەكرێتە تەرازوو، ئەگەرنا بۆت نیە بەكەس بڵێی: تۆ بێ تەقوای، كەواتە: بێ حورمەتی، لەو ڕووەوە كە مرۆڤی! بەڵێ، كێ تەقوای زیاتر بێ، حورمەت و ڕێزی زیاترە لەلای خوا، بەڵام ئەو ڕێز و حورمەتە لە دوا ڕۆژدا دەردەكەوێ، چونكە ئەوێ شوێنی سزا و پاداشتە.

---

[1] أخرجه أحمد برقم: (٧٧١٣)، ومسلم برقم: (٢٥٦٤).

*هێڵی پێنجەم و کۆتایی بووناسیی ئیسلامیی:*

خـوا پێغەمبـەرانی خـۆی لـە نێـو مرۆڤایەتییـدا گوڵبـژێر کـردووەو کتێـبو بەرنامـەکانی خـۆی لـە ڕێـی فریشتەکانەوە پـێ دا نـاردوون، تـاکو پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) مـوژدەدەر و ترسـێنەربن، وە بیـانوو بەدەسـت خەڵکەوە نـەهێڵن، وە خـەڵکی بـەرەو ڕاسـتە شـەقامی خـوا بـە یـەکگرتن (توحیـد) و دادگەریی بێنن، وە سەرەنجام مرۆڤەکان بەختەوەری دنیا و سەرفرازی دوا ڕۆژ بن.

بـەڵێ خـوای زانـاو توانـا کـە مرۆڤـی لەسـەر زەویـدا دانـاوەو، هەرچـی لـە بوونـەوەر دایە بۆ مرۆڤی مەیسـەر کـردووەو هـەموو دروسـتکراوەکانی بـۆ ئـەوە هێناونـە دی کـە ئینسـان تـاقی بکرێتـەوە، ئینسـانی وێـڵ نـەکردوە، بـەڵکو بـە پێغەمبەرانی خۆیدا (علـیهم الصـلاة والسـلام) لـە ڕێـی فریشـتەکانەوە -سـەلامی خوایان لێ بێت- پەیام و بەرنامەی خۆی پـەیتا پـەیتا بـۆ ڕەوانـە کـردوون، کـە ئـەویش لـە کتێبـەکانی خـوا دا بەرجەسـتەیە، بۆچـی؟ تـاکو مرۆڤـەکان بـزانن خوای بـەرزو مـەزن چ جـۆرە ژیـانێکی بـۆ ئـەوان پـێ چاکەو، چ جـۆرە بـەڕێوە بردنێکی وڵات وسەرزەوی بۆ ئەوان پـێ چاکە، بەوشـێوەیە ژیـان بگـوزەرێننو، بەو شێوەیە وڵاتی خۆیان ئیدارە بکەن، وە سەرەنجام شایستەی ئەوە بن کـە لـە دنیادا بەختەوەر بن، وە لە دوا ڕۆژدا سەر فراز بن.

١- خوای پەروەردگار لەو بارەوە کە پێغەمبەران گوڵبژێری نێـو بەشـەریەتن لـــە لایـــەن خـــوای پـــەروەردگارەوە، وە فریشـــتە پەیامهێنـــەرەکانیش هەڵبـژێردراوی خـوان، لـەنێو سـەرجەم فریشـتە پـاکو بـێ گوناهـەکانی خـوادا، فەرموویـەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ٧٥ ﴾ الحـج. واتـە: خـوا ڕەوانـە کـراوان لـەنێو فریشـتەکان دا، وە لەخـەڵکیش دا هەڵدەبـژێرێ، بێگومـان خـوا بیسـەری

بینەرە، واتە: خوا دەبیستێ و دەبینێ، کە ژیانی بەشەر بە بێ وەحی خواو بەبێ پەیامی خوا، ژیانێك نابێ کە لە مرۆڤ بوەشێتەوە، وە تێیدا بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوارۆژ بێ، بۆیە بەفریشتە هەڵبژێردراوەکانیدا، کە جبریل (علیه السلام) سەرۆکیانە، پەیام وبەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤە هەڵبژێردراوەکان ڕەوانە کردوە، کە پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لەسەر بێ.

٢- هەروەها لەو بارەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە هاتوو موژدە بدەن بە خەڵك، وەخەڵك بترسێنن، وە بیانوو بەدەست خەڵکەوە نەهێڵن لە دوارۆژدا، لە بەرامبەر خوادا، فەرموویەتی: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ١٦٥﴾ النساء. لە پێش دا ناوی ژمارەیەك پێغەمبەران دێنێ و دوایی دەفەرموێ: پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەر، یاخود دڵخۆشکەرو ورياکەرەوە، تاکو خەڵك لە دوای هاتنی پێغەمبەران بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، وە خوا زاڵی کاربەجێیە، (واتە: بیانوو و بەڵگەی نەبێ، بڵێ: خوایە! جا خۆ من نەمدەزانی تۆ چۆنت پێ خۆشە بژیم، ئەگەرنا بەو شێوەیە دەژیام، بەڵام تۆ منت ئاگادار نەکردەوە! دوای ڕەوانەکرانی پێغەمبەران بە کتێب و بەرنامەکانی خواوە، هیچ کەس ئەو بیانوو و پاساوەی نیە، چونکە دیارە کە خوا چ جۆرە ژیانێکی پێ خۆشە، ئەو شێوە ژیانەی کە لە پەیام و بەرنامەو کتێبەکانی خۆی دا ڕوونی کردۆتەوە، کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هێناویانن، لە ڕێی فریشتە پاك و بێگەردەکانی خواوەوە).

ئاشکراشە کە مەبەست لە موژدەدان و ترساندن، موژدەدان بە چاکەکاران و ئیمانداراننە کەلە دنیاش دا بەختەوەر دەبن و لە دوا

ڕۆژیشدا سەرفراز دەبن، وە مەبەست لە ترساندن و ورپاگردنەوەش، ترساندنی ئەوانەیە کە ڕێی خوا ناگرن و ڕاستە شەقامی خوا ناگرن، کە نە دنیایان باش دەبێت و نە دواڕۆژیان، وەتووشی پەشێمانیی و بەدبەختیی و وە سزا و جەزرەبەی خوای دادگەر دەبن.

٣- هەروەها لەو بارەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەمووی هاتوون کە مرۆڤەکان بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، وە تەنیا خوا بپەرستن خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾ الأنبياء، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واتە: وەلە پێش تۆدا هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە مەگەر وەحییمان بۆ ناردوە کە بێجگە لە من هیچ پەرستراو نین، من بپەرستن و بەندایەتیی تەنیا بۆ من بکەن، بەڵێ هەموو پێغەمبەران هاتوون کەدەستی ئینسانەکان بگرن بەرەو ڕاستە شەقامی خوا بەیەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردنیش ئەوەیە، کە ئینسان دڵ و دەروونی و ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، بە شێوەیەك بێ، کە خوا پێی خۆشەو لە شەریعەت و بەرنامەی خۆی دا دیاریی کردوە.

٤- وە لەو بارەوە کە خوا (سبحانه وتعالى) هەموو پێغەمبەرانی ناردو دادگەریی بچەسپێنن لە زەوی دا، لە هەمو ڕووەکانی ژیانی مرۆڤەوە خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢٥﴾﴾ الحديد.

واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بەبەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە

ناردوە (هیچ پێغەمبەرێك نەبووە موعجیزەیەكی نەبێ كە خەڵك دەسەوستان بكات‌و خەڵك بیانوو بڕ بكات) وە كتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار {(كتێب) واتە: بەرنامە، وە (میزان) واتە، ئامرازێك كەدادگەریی پێ بچەسپێنرێ} تاكو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن‌و بە دادگەریی هەڵسن، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوار (دادگەریی بە بێ هێز ناچەسپێ، چونكە ستەمكاران چاویان لە ستەمەو چاویان لە پێشێلكردنی مافی هەژار و نەدار و بێ دەستەڵاتەكانە، لەبەر ئەوە دەبێ دەسەڵاتێك هەبێ لە پشت دادگەرییەوە كە بیچەسپێنێت) ئەوئاسنەش هێزێكی توندی تێدایە، وە چەندان سوود و كەڵكی خەڵكیشی تێدان، (كەئەوە ئاماژەیە بە تەكنۆلۆژیای سەردەم: سەربازیی‌و مەدەنیی، واتە: لەو ئاسنە دەگونجێ كە هەم تەكنۆلۆژیای عەسكەریی دروست بكرێ، هەم هی مەدەنیی، تەكنۆلۆژیای عەسكەریی وەك پاڵپشتكردنی ئەوانەی كە دەیانەوێ دادگەریی بچەسپێنن، وە تەكنۆلۆژیای مەدەنییش بۆ ئەوەی ژیانی خەڵك ڕوو لە گەشە كردن بكات، وە خەڵك لە نیعمەتەكانی خوا بەهرەمەند بێ)، وە بۆ ئەوەی بزانێ (واتە: لەسەر ئەرزی واقیع بیزانێ، ئەگەرنا خوا هەموو شتێك دەزانێ) كە ئایا كێ خۆی‌و پێغەمبەرانی سەردەخات‌و پشتگیرییان دەكات، وە پشتگیریی بەرنامەكەیان دەكات، لەكاتێك دا كە خوا نابینێ‌و بەهەشت و دۆزەخ نابینێ؟ بێگومان خوا بەهێزی بالأدەستە، واتە: وەنەبێ خوا لە بێ دەستەڵاتییەوە بێ (پاكیی بۆ وی) كە داوا لە مرۆڤەكان دەكات پاڵپشتی پێغەمبەرانی بن، وە بەرگریی لە پەیام و بەرنامەكەیان بكەن كە دەیەوێ دادگەریی بچەسپێنێ، بەڵكو دەیەوێ خەڵك تاقی بكاتەوە، وە خەڵكی بۆ دەركەوێ‌و بە زمانی حاڵ و كرداری خۆیان‌و خۆیان بە خوا بناسێنن.

٥- وە لەوبارەشەوە کە مرۆڤ بە پابەندیی بە بەرنامەی خواو بەڕێو چوونی بەپێی شەریعەتی خوا، دەبێتە بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوا ڕۆژ، خوا دەفەرموێ: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾النحل. واتە: وە هەرکەسێك کردەوەی باش بکات لە نێر یان مێ وە بڕواداریش بێ، بێگومان بە ژیانێکی بەتام و چێژ دەیژیەنین، وە (لەدوارۆژیش دا) بە پێی باشترین کردەوە پاداشتیان دەدەینەوە. پێشتریش باسمان کرد کە کردەوەی باش، هەم نیاز و مەبەستەکانی دڵ، هەم وتەکانی زمان، هەم کردەوەی ئەندامەکانیش دەگرێتەوە، خوا کە دەفەرموێ: کەسێك کردەوەی باش بکات، کردەوەی باش یانی چی؟ یانی هەموو جم و جوڵ و چالاکییەکان کە لە قازانجی مرۆڤ دان و لە قازانجی تاك و خێزان و کۆمەڵگادان، وەبەتەئکید بەرنامەی خوای پەروەردگاریش هانی ئینسانەکان دەدات و فەرمانیان پێ دەکات کە هەموو ئەو جموجوڵ و چالاکییانە ئەنجام بدەن، کە لە دنیاو دوا ڕۆژ دا لێیان بەهرەمەند دەبن، ئنجا هەر کەسێك کردەوەی باش ئەنجام بدات، لە نێرو مێ، لەئیسلام دا، لە تەرازووی بەرنامەی خوادا جیاوازیی نەخراوەتە نێوان نێر ومێ، چونکە نێر بوون و مێ بوون، بە دەست خودی ئینسانەکان نیەو، خوای کاربەجێ ئینسانەکانی کردۆتە نێر یان مێ، لە بەر ئەوە ڕەگەز (جنس) ناکرێتە پێوەر و تەرازوو و هەر کام لە نێر و مێ، هەرکەسێك کردەوەی باش ئەنجام بداو بڕواداریش بێ ئەوە بەتەئکید بە ژیانێکی پاك و چاك، ژیانێکی بەتام و چێژ دەیژیەنین، واتە: لە دنیادا، وە لە دوارۆژیشدا بە تەئکید بەگوێرەی باشترین کردەوەیان، پاداشتیان دەدەینەوە.

کەواتە: بەختەوەریی دنیا لە گرەوی ئیمان و کردەوەی باش دایە، ئنجا ئایا ئیمان و کردەوی باش کێ دیاریی دەکات؟ بە دڵنیاییەوە خوا دیاریی دەکات، لە ڕێی چییەوە دیاریی دەکات؟ لە ڕێی بەرنامەکەیەوە، ئنجا لێرەدا مادام خوای تاك بە گشتی دەیفەرموێ، کەواتە: هەم تاك دەگرێتەوە، هەم خێزان، هەم کۆمەڵگا، هەم دەوڵەت، کاتێك خەڵك بە تاك و کۆمەڵیانەوە خاوەنی ئیمان بن و، خاوەنی کردەوەی باش بن، بەهۆی پابەندییان بەشەریعەتی خوای پەوەردگارەوە، وە وڵاتی خۆیان بەو شێوەیە بەڕێوە بەرن کە شەریعەتی خوا دەفەرموێ، ئەوە هەم بەختەوەریی ژیانی دونیایان بۆ دەستەبەر دەبێ، هەم سەرفرازیی دوا ڕۆژیشیان بۆ مسۆگەر دەبێت.

## چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بە بوونناسیی ئیسلامییەوەو پایەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی:

سەرەتا دەڵێین: مەبەستمان لە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ئەو هەڵوێستە فیکرییەیە کە لە بوونناسییەوە سەرچاوە دەگرێ‌و، تاکە هەڵوێستی ڕاست‌و دروستی فیکریی کە لەو بوونناسییەوە کە لە باسی پێشوودا باسمانکرد، هەڵدەقوڵێ‌و پەیدا دەبێ، بریتیە لە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، واتە: هەر کەسێك‌و هەرکۆمەڵێك قەناعەتی وابێ کە خوا (سبحانە وتعالی) تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوور خۆرو تاکە پەرستراوی مرۆڤەکانە، وە قەناعەت و بڕوای وابێ کە خوا زەوی‌و ئاسمانەکانی بۆیە دروست کردون، تاکو ئینسانەکانیان تیدا تاقی بکاتەوە، وە خوا (سبحانە وتعالی) ئینسانی کردۆتە جێنشین لەسەر زەوی، وەخوا هەموو مرۆڤەکانی لە دایك و بابێکەوە دروستکردوەو دابەشیکردوون بۆ گەل و تیرەکان، بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، وە پارێزکاریی (تقوی) تەرازوو و سەنگی مەحەکی، گرانیی و سووکیی مرۆڤەکانە، وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پەیام و بەرنامەکانی خوایان هێناوە،

تاكو ئینسانەكان فێری ئەوە بكەن بەو شێوە بژین كە جێگای پەسەندی خوایەو خوا لێی ڕازی یە، وەسەرەنجام بەختەوەریی دنیا و سەر فرازیی ڕۆژی دوایی وەدەست بێنن، بەڵێ هەر كەسێك ئەوە تێروانینو قەناعەتی بێت، مسۆگەر ئەو قەناعەتو تێڕوانینە، ئەو شێوە بوونناسییە، وای لێ دەكا، كە ئیمانی پەیدا بێت، عەقیدەی پەیدا بێت ئەو ئیمان و عەقیدەیەی كە ئیسلام دەیڵێ ، ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییش پێنج پایەی سەرەكی هەیە، كە بریتین لە: ئیمان بەخواو بەفریشتەكانی خواو بەكتێبەكانی و بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وە بەڕۆژی دوایی.

ئنجا دیارە كە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بە هەر پێنج پایەكەیەوە نێوەڕۆكێكی هەیە كە لە قورئان و سوننەت دا ڕوون كراوەتەوە، بۆیە ئێمە دەچینە خزمەت قورئان، وە پێنج پایەكانی ئیمان و نێوەڕۆك و چۆنیەتی ئیمان، لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێك دا دەخەینە ڕوو:

خوا (سبحانه وتعالى)لە ئایەتی ژمارە (١٧٧) سورەتی (البقرة) دا بۆمان باسی پێنج پایەكانی ئیمان دەكاتودەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ۖ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾البقرة، واتە: چاكە كاریی ئەوە نیە كەڕووی خۆتان وەر سووڕێنن بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا، بەڵكو چاكە كاریی (یاخود دینداریی و مسوڵمانەتیی) (هی) هەر كەسێكە ئیمان بە خواو ڕۆژی دواییو فریشتەكانو كتێبو پێغەمبەران بێنێ. ئەم پێنجە پێنج پایەی سەرەكیی ئیمان و عەقیدەن لە

ڕوانگـەی ئیسـلامەوە ، هەڵبەتـە فەرمایشـتی صـەحیحی پێغەمبـەر کـە بـە فـەرمووودەی جبریـل ناسـراوە، باسـی پایەیـەکی دیکـەی شەشـەمیش دەکـات، کـە بریتیـە لـە ئیمـان بـە قـەدەر: {أَنْ تُـؤْمِنَ بِالْقَـدَرِ خَيْـرِهِ وَشَـرِّهِ}[1] بـەلاَم لـە ئایەتەکاندا ئیمان بە قەدەر باسنەکراوە، بۆچی؟ چونکە ئیمان بەقەدەری خـوا، هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بەخوا، چونکە هەر کەسێ ئیمانی بـە خـوابێ، دەبـێ ئیمانی بەوەش بێت کە خوا هەموو شتێك دەزانێ و هەموو شتێك دەتوانێ ، وە کار بەجێ یە، وە خوا هیچ شتێکی لێ عاصێ نـابێ، کەواتـە: ئیمـان بـە قـەدەر، دەچێتەوە نێو ئیمان بە خواو بە سیفەتەکانی خوای پـەروەردگار، ئنجا ئەگـەر ئـەم پێـنج پایـە پێـنج پایـە کـانی ئیمـانن، ئـەدی ئیمـان بـۆ خـۆی چـییە؟ وە نێوەڕۆکی ئیمان چییە؟ وە ئیمان لە چی پێکدێ؟ لە زۆر لە ئایەتـەکانی قورئان دا خـوای پـەروەردگار پێناسـەی ئیمانمـان بـۆ دەکـات، بـەڵام نـەك بەشـێوەیەکی داڕنراویی (تجريدي) بەڵکو خـوا پێناسـەی ئیمانـداران مـان بـۆ دەکـات، چـونکە ئیمان وەك خۆی، وەك حەقیقەتێك بوونی نیە، هەتا ئینسانێك هـەڵی نـەگرێ، بۆیە خوای پەروەردگار باسـی ئیمـان داران مـان بـۆ دەکـات، واتـە: ئەوانـەی کـە ئیمانیان هەیە، کە دەبێ چۆن بن؟ وەکێن؟ وە چۆنـن؟ بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (الحجرات) ئایەتی (١٥)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ واتە: بێگومـان بڕواداران تـەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، پاشان نەکەوتوونە گومانەوە، وە بە سامان و گیانیان لە پێناوی خوادا تێدەکۆشن، ئا ئەوانە ڕاستن، واتە: ڕاستە کە دەڵێن: ئیمانمان بە پەروەردگار هەیە، (إنما) لە

[1] متفق عليه.

زمانی عەرەبی دا پێی دەگوترێ: (أداة الحصر والإثبات) ئامرازی کورت هەڵێنان و چەسپاندن، واتە: وشەی (إنما) کاتێك دەکەوێتە سەر ڕستەیەك کە حوکمێکی تێدا دێ، ئەو حوکمە دەچەسپێنی و کورتی هەڵ دێنێ، لەو کەسەدا کە بۆی باسکراوە.

کەواتە: لێرەدا ئەم ئایەتە پێمان دەفەرموێ: ئیمانداران تەنها ئەو کەسانەن کە ئیمانیان بە خوا و بە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) هەبێ، وە هەر چی پێغەمبەری خواش لە خواوە بیهێنێ، ئیمانیان پێی هەبێ، وە پاشان هیچ دوو دڵیی ولەرەلەرێکیان نەبێ، وە بەسەرو ماڵیشیان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، ئائەوانە ڕاستن، کەواتە: غەیری ئەوانە نە ئیماندارن، وە نەڕاستیش دەکەن لە دەعوای ئیمان دا.

٢- لەشوێنێکی دیکەدا خوا (سبحانه وتعالى) پێناسەی ئیمانداران مان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٢) ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (٣) أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (٤) ﴾ الأنفال.

لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) بە پێنج سیفەت ئیماندارانمان بۆ پێناسە دەکات، دەەفەرموێ: بێگومان بڕواداران ئەوانەن کە:

یەکەم: کاتێك یادی خوا دەکرێ و باسی خوا دەکرێ، دڵیان ڕا دەچڵەکێ

دیارە لە مەقامێکدا کە داخوازیی ئەوە بکات دڵیان ڕابچڵەکێو شوێنە کە شوێنی ئەوە بێ، بۆ وێنە: باسی ترس لە خوا بێ، یان باسی سزای خوا بێ، یان باسی بەرزیی و گەورەیی و مەزنیی خوا بێ، دڵیان ڕا دەچڵەکێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾.

دووەم: وە کاتێك کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، ئیمانیان پێیان زیاد دەکات، واتە: هەتا بە ئایەتەکانی خوا ئاشناتربن ئیمانیان زیاتر دەکات: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾.

سێیەم: وە تەنها پشت بە خوای خۆیان دەبەستنو پشتیان تەنیا بەخوا قایمە، بەڵێ هۆکارەکان ڕەچاو دەکەن، بەڵام دڵیان هەر بە خواو پەیوەستە ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾.

چوارەم: ئەوانەی نوێژەکانیان بەرپا دەکەن، نەك بەس نوێژ بکەن، بەڵکو بەرپای دەکەن، واتە: بەو شێوەیەی کە خوا دەیەوێ دەیکەنو حەقیقەتی نوێژ دێننەدی: ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾.

پێنجەم: وەلەوەی کە پێمان داون دەبەخشن، یانی هەرچی کە پێمان داون، بژێوی مەعنەویی، یاخود ماددیی، هی مەعنەویی وەك: ئەو عەقڵ و هۆشیارییەی کەهەیانەو، ئەو زانیارییە هەیانە، بەکاری دێنن، هی ماددییش واتە: ئەو سەروەت و سامانەی کە هەیانە، بەکاری دێنن لەبەرژەوەندیی خەڵك دا بۆ ئەوەی کەڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنن ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾﴾. واتە: ئا ئەوانە بەڕاستیی ئیمان دارن لەلایەن خوای پەروەردگارەوە لێبوردنێکی تایبەتیان هەیە، وە بژێوێکی پڕ ڕێزو حورمەتیان هەیە، هەم لێیان دەبووریٚ، هەم بژێوێك کەڕێزو حورمەتی تێدایە، بەس خواردن و خواردنەوە نا، خواردن و خواردنەوە بۆ جەستە ، بەڵام ڕێزو حورمەت بۆ ڕووح، چونکە ئینسان بەر لەوەی جەستەبێ ڕووحە.

٣- لە جێیەکی دیکەشدا دیسان خوا (سبحانه وتعالی) جارێکی دیکە پێناسەی ئیماندارانمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾ النور. واتە: بێگومان بڕواداران تەنیا ئەو کەسانەن کە ئیمانیان بەخوا و بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، وەهەر کاتێك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوون بۆ کارێکی کۆکەرەوە، (واتە: کارێك کە پێویست بکا مسوڵمانانی بۆ کۆبکەنەوە) ئامادەی ئەو کارە دەبن، مەگەر موڵەتی لێ وەربگرن {واتە: لە پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یان بەرپرسیان، ئەگەرنا ئەو کارە بەجێناهێڵنو بیانوو نادۆزنەوە و بەملاو لادا ناڕۆن} دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بێگومان ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرن، ئنجا بەملاو لادا دەچن، ئەوانە ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هەیە ﴿فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ﴾ جا هەر کاتێ مۆڵەتیان لێ وەر گرتی بۆ هەندێ کاروباری خۆیان ﴿فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ﴾ هەر کات ویستتو بەرژەوەندییت تێدا بینی، مۆڵەتیان بدە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) ڕاستییەکی زۆر گەورەمان بۆ بەیان دەکات، کە پەیوەندیی هەیە بە لایەنی سیاسیی ولایەنی کۆمەڵایەتییەوە، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەر هەیە، وێڕای ئەوەش هەر کارێك کە پێویستە مسوڵمانانی بۆ کۆببنەوەو دەبێ بە هەرەوەزیی بێ، ئنجا جەنگ‌و جیهادە، کارێکی سیاسی یە، چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە، ئابوورییە، هەرچی بێ، هەرکارێ پێویست بکا مسوڵمانان بۆی کۆببنەوە، ئەوان کۆ دەبەنەوە و بەملاولادا ناچن، پێغەمبەری خواو قیادەی خۆیان جێ ناهێڵن، تا مۆڵەت وەرنەگرن، دیارە لێرەدا مەبەست تەنیا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نیەو دەبێ مسوڵمانان بەبێ مۆڵەتی بەرپرسی خۆیان دەرنەچن‌و سەرپێچیی نەکەن، کەواتە: بەقسەی براگەورەو بەرپرسان کردن لە سنووری شەریعەت دا، بۆ جێبەجی کردنی ئەرك‌و فرمانەکان، مەرجە بۆ هاتنەدی ئیمان.

## چۆنیەتی هەڵقوڵینی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لە بوونناسی و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە:

خوێنەری سەنگین! با سەرنج بدەین بزانین چۆن چۆنی بوونناسیی ئیسلامیی‌و تێڕوانینی ئسلامییانە بۆ بوون (وجود)، وە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بەو شێوەیەی کەباسمان کرد، چۆن دەبن بەسەرچاوە بۆ هەڵقوڵینی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، وەچۆن چۆنی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی پەیوەست دەبێ بە بوونناسیی ئیسلامییەوەو بە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە؟!

ئێمە پێشتر باسمانکرد کە ئیمان و عەقیدەی ئسلامیی هەڵقوڵاوی بوونناسیی ئیسلامیی‌و تێڕوانینی ئیسلامییانەیە بۆ بوون (وجود)، هەر کەسێ

بەو شێوەیە تەماشای (بوون) بکاو، بەو شێوەیە خوا بناسێو، بەو شێوەیە تەماشای ژیان بکاو، تەماشای ئینسان بکا کە ئیسلام دەڵێ، ئەوە یەکسەر ئەو جۆرە بوونناسییە پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئیمان هێنانو، هەڵوێستێکی فیکریی پەیدا دەبێو، دوایی ئەو هەڵوێستە لەکردارو ڕەفتاردا بەرجەستە دەبێ، چونکە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بریتی نیە تەنیا لە حاڵەتێکی تیۆریی و زەینیی، بەڵکو ئیمان چوار پێکهێنەری سەرەکی هەن: پێك هێنەرێکی زەینی، پێکهێنەرێکی دەروونیی، پێکهێنەرێکی تەعبیریی، وە پێکهێنەرێکی کردەیی و جەستەیی، ئیمان بریتیە لە چەند ڕاستییەك بەرانبەر بە خوا (سبحانە وتعالی)و فریشتەکانیو پێغەمبەرانیو کتێبەکانیو ڕۆژی دوایی، کە لە عەقڵ دا جێگیر دەبن، واتە: ئیمان پێش هەمو شتێ مەعریفەتو هۆشیاریو زانیاریو پەیپێبردنە، بەڵام دوای ئەوەی کە عەقڵ دەرکی پێ کردوونو پێیان هۆشیارو ڕۆشن بۆتەوە، لەدڵیشدا جێگیر بوون، بۆ ئەوەی دڵیش پێیان بێدار بێتەوە، ئەو حەقیقەتانە دەبێ دڵیش پەسەندیان بکات، ئنجا دوای ئەوە دەبێ زمانیش تەعبیریان لێ بکات، واتە: پاش ئەوەی لە زەینەوە گوازرانەوە بۆ دڵ، دڵیش دەبێ بیاندا بەزمان، ئەویش تەعبیریان لێ بکات، کەواتە: دان پێدانانی زمانیش پێکهێنەری سێیەمی ئیمانە ، وە پاشان کردەوەی ئەندامەکانەو، هەر کات حەقیقەتەکان لە عەقڵو دڵدا جێگیر بوونو، بەزمان تەعبیریان لێ کرا، ئینسان دەبێ بە پێی توانا بەکردەوەش پێیان هەڵسێ.

بۆ وێنە: ئیمان بە خوا، بریتیە لە ئیمان بە بەدیهێنەرایەتیی خواو بە پەرستراوێتیی خواو بە خاوەنداریێتیی خوا، ئنجا هەر کات عەقڵ دەرکی بەو ڕاستییە کردو، دڵ پەسندی کردو، زمان دانی پێدا هێناو، بەکردەوەش ئەنجام دراو بەرجەستەکرا، ئەو جار ئەوە پێی دەگوترێ ئیمان .

ئنجا با تەماشا بکەین بزانین، چۆن چۆنی نەك هەر سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بەڵکو هەموو ئەرکەکانی ئیسلام، پەیوەست دەبنەوە، بە شێوەی تێڕوانین بۆ بوون (وجود)و بە ئیمان و عەقیدەوە:

١- ئایەتەکانی ژمارە: (٣٩و٤٠) لە سووڕەتی (یوسف)دا خوا لە سەر زمانی (یوسف) (علیه السلام) دەفەرموێ: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾ واتە: ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەکەم! ئایا چەند پەروەردگارێکی پەرتەوازە باشترن، یاخود خوای تاکی مل پێ کەچکەر؟! لێرەدا (یوسف) پرسیار لە دوو هاوەڵەکەی دەکا کە: ئایا واباشە چەند پەروەردگارێکی پەرتەوازەی دژ بەیەکی ناکۆك بپەرستین، یاخود یەك خوا (سبحانه وتعالى) کەتاكو بالاّ دەستەو بەسەر جگە لە خۆیدا؟ دوایی دەفەرموێ: ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ﴾ واتە: ئێوە هیچ ناپەرستن لەجیاتی خوا، بێجگە لە هەندێك ناو کە خۆتان و باب و باپیرانتان بەکارتان هێناون، واتە: تەنیا ناوی بێ نێوەڕۆك دەپەرستن، کە لەلایەن خواوە هیچ بەڵگەیان لەسەر نیە، کە ئەوانە پەروەردگارو پەرستراون، دوایی دێتە سەر ئەسڵی مەبەستو دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ حوکم تەنیا دەبێ هی خوا بێ، حوکم لێرەدا یانی: یاسا دانانو، حەلاڵ و حەڕام دیاریی کردنو، چاکەو خراپە دیاریی کردن، تەنیا مافی خوایە، کە فەرمانی کردوە جگە لەو کەس نەپەرستن، واتە: ئەگەر جگە لە خوا کەسێکی دیکە بکەنە بەرنامە دانەرو حاکمتان،

ئەوە مانای وایە جگە لە خواتان پەرستوە، بەلاّم خوا فەرمانی کردوە کە جگە لەو کەس نەپەرستن، چ وەك پێشکەش کردنی درووشمەکان (تقديم الشعائر): نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج، وە چ وەك وەرگرتنی بەرنامەکان (تلقّي الشرائع) دەبێ لە هەردوو بوارەکەدا، تەنیا خوا پەرستراوبێ، ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ ئا ئەوە دینداریی ڕاستە، دینداریی ڕێك و ڕاست، ئەوەیە کە تەنیا خوا پەرستراو بێ، خواش کاتێك تاکە پەرستراو دەبێ، کە وەك چۆن دروشمەکانی خواپەرستیی تەنیا بۆ ئەو پێشکەش دەکرێن، سەجدەو ڕکووع و نوێژ و حەج و قوربانیی ڕۆژوو دوعا، تەنیا بۆ ئەو پێشکەشدەکرێن، بەهەمان شێوە دەبێ بەرنامەکانیش‌و یاساکانیش کە ژیانیان پێ بەڕێوە دەبرێ، بەس لە خوا وەربگیرێن، بەلاّم زۆربەی خەڵکی نازانن دینداری ڕاستە ڤینە ئەوەیە کە تەنیا خوا حاکم بێ، وەك چۆن تەنیا خوا پەرستراو (معبود)ە، لە بواری دروشمەکاندا، دەبێ تەنیا خواش حاکم بێ لە بواری شەریعەت‌و حوکم دا.

٢- وە لە سووڕەتی (فاطر) ئایەتی ژمارە (٣)دا، خوا (سبحانه وتعالى) تەنیا پەرستراوێتیی خۆی، پەیوەست دەکاتەوە بەوەوە کە تەنیا ئەو خاوەنی نیعمەتەو تەنیا ئەو بەدیهێنەرە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣﴾ واتە: ئەی خەڵکینە! چاکەی خوا بە سەر خۆتانەوە یاد بکەنەوەو لەبیرتان بێ، ئایا جگە لە خوا بەدیهێنەرێکی دیکە هەیە لە ئاسمان و زەوی، ڕۆزییتان پێ بدا؟ (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ) واتە: مادام جگە لە خوا هیچ ڕۆزیی دەرێکی دیکەتان نیەو، تەنیا خوا ڕۆزیی دەرەو، تەنیا خوا

خاوەنی نیعمەتەکانە، جێی خۆیەتی تەنیا ئەویش پەرستراوبێ‌و، جگە لەو پەرستراوی بەهەقی دیکەتان نیە ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ ئەدی بەرەو کوێ لا دەدرێن؟! واتە: وەك بڵێی ئیرادەتان لە دەستی خۆتاندا نەماوەو کەسێك ڕووتان پێ دەسووڕێنێ.

٣- وە لەسووڕەتی (الغافر) لەئایەتەکانی: (٦١و٦٢و ٦٣)دا ئەو ڕاستییەمە زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ الَّذِينَ كَانُوا بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾﴾ واتە: خوا ئەو کەسەیە کە شەوی بۆ گێڕاون بەوە کەتێیدا ئارام بگرن ، وە ڕۆژگاریشی بۆ گێڕاون بە بینەر، (واتە: تێیدا دەبینن‌و کەسابەتی تێدا ئەنجام دەدەن) بێگومان خوا خاوەنی چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەلاّم زۆربەی خەڵکی ناسوپاسن ، ئائەو خوایە پەرستراوتانە، بەدیهێنەری هەموو شتیکە جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین، بەرەو کوێ لا دەدرێن! ئەوانەی بڕوا بەئایەتەکانی خواناکەن، ئا بەو شێوەیە ڕوویان پێ لادەدرێ، واتە: شەیتان کۆنترۆڵیان دەکاو لەبەندایەتیی بۆ خوا دووریان دەخاتەوەو دەیانکاتە بەندەو خزمەتکاری خۆی، شەیتانی جندو مرۆڤو، تاغووتەکان زەفەر بەکەسانێك دەبەن کە دڵیان لەخوا بەیەك گرتن (توحید) خاڵییە، دڵیان لە خواناسیی (معرفة الله) بەتاڵەو بەندەی خوا نین، بۆیە دەبن بە کۆیلەو خزمەتکاری ئەم‌و ئەو.

٤- وە خوای بێ وێنە لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٥٩)دا دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ

فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن، وەفەرمان بەریی پێغەمبەر بکەن، وە هی کاربەدەستانێك و مشوور خۆرانێك کەلە خۆتانن، وە ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە مشتو مڕەوە بیگێڕنەوە لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئائەوە بۆ ئێوە چاکترەو سەرنجامیشی باشترە، لێرەدا خوا (سبحانه و تعالى) ڕوو لە ئیمانداران دەکات، کە ئەگەر ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، دەبێ فەرمانبەری خوابن واتە: شوێنکەوتەی قورئان بن، وە فەرمان بەری پێغەمبەربن، واتە: شوێنکەوتەی سوننەتو ڕێبازی بن، کە بەتەئکید فەرمان بەریی بۆ پێغەمبەریش هەر بریتیە لە پراکتیزە کردن و جێ بەجێ کردنی قورئانو، بریتیە لەوەی کە پێغەمبەری خوا، قورئانی بەو شێوەیە جێ بەجێ کردوە، واتە: سوننەتی پێغەمبەر شتێکی جیا لە قورئان نیە، بەڵکو بریتیە لە چۆنیەتی جێ بەجێ کردن و پراکتیزەکردنی قورئان.

پاشان دەفەرموێ: فەرمانبەریی کاربەدەستانێك بکەن کەلەخۆتانن، واتە: خۆتان هەڵتانبژاردوون و دیارییتان کردوون، وە لە خۆتانن لەڕووی ئیمان و عەقیدەتانەوە، دواتر دەفەرموێ: وە ئەگەر کەوتنە کێشەوە لەگەڵ کاربەدەست و بەرپرسەکانتان دا بیگێڕنەوە بۆ لای خواوپێغەمبەری خوا، واتە: بیگێڕنەوە بۆ لای قورئان و سوننەت، قورئان و سوننەت تەرازووی لەیەك جیاکردنەوەی چاکەو خراپەو، ڕاستو چەوتو، حەڵاڵو حەرامن، بۆیە ئەو حوکمە شەرعییانەی لە قورئان و سوننەت وەردەگیرێنو زانایانی ئیسلام لەسەریان یەکدەنگن، دەبێ دەستووری مسوڵمانان پێك بهێنن. وەکاتێك کۆمەڵگای مسوڵمانان

لەنێو خۆیاندا یان لەگەڵ کاربەدەستانی دا دەگەونە کێشەو مشتو مڕو ڕاجیایی یەوە، دەبێ ئەو ناکۆکیی و کێشەیە بگێڕنەوە بۆ قورئان و سوننەت، ئەگەر خۆیان بە ئیماندار دەزانن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ ئەوە چاکترەو وەسەرەنجامیشی باشترە.

٥- وە لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٥١)دا خوا هەڵوێستی بڕوادارانمان مان بۆ دەخاتە ڕوو، لەبەرانبەر حاڵەتێکدا کەبانگ دەکرێن تاکوشەریعەتی خوایان بەسەردا جێ بەجێ بکرێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾ واتە: بێگومان قسەی بڕوادان کاتێك بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی کە دادوەرییان لەبەیندا بکرێ، هەڵوێستو قسەیان هەر ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان وە گوێڕایەڵین، یانی: وەری بگرن و پاشان جێ بەجێی بکەن، کەسێ خۆی بەبڕوادار بزانێ، نابێ لەبەرانبەر شەریعەتی خوادا لام و جیمی هەبێو، نابێ دڵ لەدڵ دانی هەبێ، دوای ئەوەی دەزانێ کە خوا ئەوەی فەرمووەو، پێغەمبەری خوا ئەوەی فەرمووەو، وەحی خوایە، نابێ ڕێگا بەخۆت بدەی سەر پشك بی، جێبەجێی دەکەی، یان نایکەی؟ قبووڵی دەکەی یان نایکەی؟ هەڵبەتە قبووڵ کردن و نەکردنی، سنووری نێوان ئیمان و کوفرە، چونکە هەر کەسێك فەرمانێکی خوا قبووڵ نەکاو بشزانێ ئەوە فەرمانی خوایە، لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەر، بەلاّم بەجێ نەکردنی لەبازنەی ئیمان و ئیسلام ناچێتە دەر، مادام دانی پێدا بێنێ کەحەقە، بەلاّم بەتەئکید بەئەندازەی سەرپێچییەکەی تاوانباری دەکات ،جاری واش هەیە سەرپێچییەکەی لەبازنەی ئیمانیشی دەباتەدەر.

٦- وە لەسوورەتی (الأحزاب) لەئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ واتە: وە هیچ پیاوێکی بڕوادارو هیچ ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نیە، کاتێك خواو پێغمبەری خوا بڕیارێك دەردەکەن، سەر پشك بن و مافی هەڵبژرادن بە خۆیان بدەن، وە هەر کەسێ سەرپێچیی لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوادا بکا، بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا ڕێی لێ ون بووە.

٧- وە لەسوورەتی (الأنعام) ئایەتەکانی: (١٤و ١٥ و ١٦)دا خوا (سبحانه وتعالى) اریێکی دیکە ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەو و پشتڕاستی دەکاتەوە، کەچۆن بوونناسیی ئیسلامیی پەیوەستە بەعەقیدەی ئیسلامییەوە، وە عەقیدەی ئیسلامییش سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لێوە سەرچاوە دەگرێ، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾﴾ بە پێغەمبەر دەفەرموێ: تۆ بڵێ: (واتە: بە کافرەکان بڵێ:) ئایا جگە لە خوا کەسێکی دیکە بکەمە سەرپەرشتیاری خۆم، لەکاتێکدا کە خوا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە (ئەو پەیدای کردوون) وە ئەو ڕۆزیی دەداو ڕۆزیی نادرێ، (هەر ئەو ڕۆزیی دەرەو پێویستی بەوە نیە ڕۆزی بدرێ)!!؟ بڵێ: فەرمانم پێکراوە کە یەکەم کەس بم گەردن کەچ بم بۆ خوا (سبحانه و تعالى) وەتۆ لە هاوبەش دانەران مەبە، (هاوبەش بۆ خوا دامەنێ لەپەرستنییداو، هاوبەشی بۆ دامەنێ لەوەدا کە بەقسەی جگەلە خوا بکەیو، بەدوای

جگـە لـە بەرنامـەی خـوا بکـەوی) هـەروەها بڵـێ: مـن دەترسـێم کەسەرپێچیی خوا بکەم، لە سزای ڕۆژێکی مـەزن (کە ڕۆژی دواییـە)، وە هـەر کەسـێك ئـەو ئـازارەی لـێ لا بـدرێ، بەڕاسـتی خـوا بـەزەیی پێیـدا هاتۆتەوە، وەئەوەش بە موراد گەیشتنێکی زۆر ئاشکرایە .

٨- هەروەها لە سووڕەتی (الأنعام) ئایەتەکانی: (١١٤و ١١٥)دا، ئەگەر لە ئایـەتی پێشێدا باسی ئەوەی کرد کە جگەلە خوا نابێ بکرێتە سەر پەرشـتییکار، لەم دوو ئایەتـەدا باسـی ئـەوە دەکـات کـە دەبـێ جگـە لـە خـوا نەکرێتـە نەکرێتـە دادوەر (حکم)، وەك دەفـەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾، دیـارە خـوا لەسـەر زمـانی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفـەرموێ: ئایاجگـە لـە خـوا کەسـێکی دیکە بکەمە حەکەم !!؟ (وە بـەمانای بەرنامـە دانـەریش دێ) لەحاڵێکدا کە ئەو کتێبی بۆ ئێوە ناردۆتە خوار زۆر ڕۆشنەو حەقیقەتەکانی ڕۆشـن کردۆتەوەو یاساکانی تێدا ڕوون کردوونەوە، (واتـە: مـادام خـوا کتێبێکی نـاردوە بەرنامـەی ژیـانی تێـدا ڕوون کردۆتـەوەو یاسـاکانی تێـدا ڕوون کردوونـەوە، چۆن جگـە لـەو بکەمـە حەکـەمی خـۆم و بیکەمـە حـاکمی خۆم؟! وەئەوانەش کە پێشتر کتێبمان پێـداون (کـە بەتایبـەت مەبەسـتی جوولەکـەو نەصـڕانییەکانە، وە هـەموو خـاوەن کتێبـە ئاسمانییەکانـە، بەگشـتی)، دەزانـن کـە ئـەم قورئانـە بەحـەق لـە پەروەردگارتـەوە دابەزێنراوە، (چونکە نیشانەکانی موحەممەد (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) لـە کتێبـە پێشـووەکاندا هـەن، هـەر بۆیـەش خـاوەن کتێبـەکان چاوەڕێیان

دەكرد بێ، وە هەندێكیش لەوانەی كە ئینصافیان هەیە، وەك (عبدالله بن سلام) ئیمانیان پێ هێنا، گوتیان: نیشانەكانی تۆ لە كتێبەكانی ئێمەدا هەن، بەلاّم ئەوانی دیكە كە كینەو حەسەدیان هەبووو دەیانزانی بەرژەوەندییان لێ تێك دەچێ، ئیمانیان پێ نەهێنا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ دەیان ناسی وەك چۆن كوڕەكانی خۆیان دەناسی، بەلاّم ئیمانیان پێ نەهێنا بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەكانیان لێ تێك نەچن‌و، ئەو بازاڕەی سازیان كردبوو، لێیان تێك نەچێ، بۆیە ئیمانیان پێ نەهێنا). پاشان دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ﴾ واتە: تۆ لەوانە مەبە كەدەكەونە گومانەوە جا دیارە پێغەمبەر گومانی نەبووە، بەلاّم مەبەست ئەوانەن كە لە پشت پێغەمبەرەوەن، چ لە ئیمان داران، چ لە خەڵكی دیكە، لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗا﴾ واتە: وشەی پەروەردگارت تەواوە، لەڕووی راستییەوە، وە لەڕووی دادگەرییەوە، لادەر نیە بۆ وشەكانی، وە ئەو بیسەری زانایە.

ئایەتەكانی خوا دوو بەشن: بەشێكیان هەواڵن، وە بەشێكیان یاسان، ئنجا خوا دەفەرموێ: وشەكانی پەروەردگارت ئەگەر هەواڵن لەڕاستییدا تەوایان كردوەو، هیچ هەواڵێكی نەداوە، چ لەبارەی ڕابردووەوە، چ لەبارەی داهاتووەوە كە ڕاست نەبێ، وە ئەگەر حوكمیشن لە دادگەریی دا تەواویان كردوە، وە هیچ حوكمێكیشی دانەناوە كە دادگەر نەبێ.

لێرەدا زۆر بەڕوونیی‌و ڕاشكاویی دەیبینین: وەك چۆن ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەگەڵ بوونناسیی ئیسلامیی دا تێكهەڵكێشەو پێیەوە پەیوەستە، واتە: هەركەسێك هەڵگری تێڕوانینی ئیسلامییانە بێ، ناچار دەبێ كە هەڵگری عەقیدەی ئیسلامیی بێت، ئەگەر لە حوكمی عەقڵ لانەدا، وە ئیمان و

عەقیدەی ئیسلامیی ئەنجامێکی مەنتیقیی یە کە لە بوونناسیی ئیسلامیی پەیدا دەبێ، بە هەمان شێوەش هەر کەسێ هەڵگری بوونناسیی ئیسلامییو ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی بێ، دەبێ سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییش تەبەننیی بکات، کە بریتیە لەوەی تەنیا خوا بە یاسادانەرو بەرنامە دانەری خۆی دابنێ، وە وەك چۆن لەبواری دروشمەکاندا، تەنیا ڕوو لە خوا دەکاتو، تەنیا سەجدەو ڕکووعی بۆ خوایە، بەهەمان شێوەش لەبواری خێزانییو کۆمەڵایەتییو سیاسییشدا، بەرنامەکانی ژیان تەنیا لە خوای پەروەردگار وەربگرێ، حەڵاڵ و حەرام تەنیا لەو وەربگرێو، وە تەنیا شەریعەتی خوا بەسەر خۆی و خەڵکییەوە بکاتە دادوەر، بۆئەوەی هەم بەختەوەری دنیاو هەم سەر فرازیی دواڕۆژیش بێ.

خوا ئێمەو میللەتی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە تەنیا خوا بە حاکم و دادوەرو یاسادانەری ڕەها دەزانن، وە تەنیا شەریعەتی خوای پەروەردگار بەبەرنامەی خۆیان دەزانن.

# بەشی چوارەم

# پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك

دەوڵەت (الدولة)

حكوومەت (الحكومة)

دەستوور (الدستور)

یاسا (القانون)

سیستەمی حوكمڕانیی (نظام الحكم)

خوێنەری سەنگین!

خـوا پشـتیوان بـێ لـەم بەشـی چـوارەمو کۆتـایی یـەی ئـەو تەوەرەیـەدا پێناسەیەکی کورتو پوختی پێنج وشەو زاراوە دەکەینو تیشکیان دەخەینە سەر، چونکە هەر پێنجیان پەیوەندیی ڕاستەوخۆو توندو تۆڵیان بەم کتێبەو کۆی باسو بابەتەکانییەوە هەیە، ئەو پێنج وشەو زاراوەیەش بریتین لە:

دەوڵەت، حکوومەت، دەستوور، یاسا، سیستەمی حوکمڕانیی.

ئنجا هەر لەبەراییەوەش دەڵێم:

بێگومان پسپۆڕو شارەزایانی فیقهی سیاسییو دەستووریی، ڕاجیاییو مشتو مڕی زۆرو جۆراو جۆریان لەبارەی چەمکو واتای هەر کام لەو وشەو زاراوانەوە هەیەو، ناگونجێ لێرەدا بچینە نێو وردەکارییەکانی ئەو ڕاجیاییو مشتو مڕانەوە، بەڵکو بەوەندە واز دێنین کە ئەوەی ڕای زۆرینەیانی لەسەرەو، لە واقیعی پڕاکتیزە کراوی ئەو وشەو زاراوانەشەوە نیزیکترە، بیخەینە ڕوو.

## ١- دەوڵەت (الدولة):

وشەی (دولة) بەو چەمکو واتایەی ئێستای کە بریتیە لە قەوارەیەکی سێ کوچکەیی: سەرزەمینێك، خەڵکێك، دەستەلاتێك، کاتی خۆی بەکارنەهێنراوە، هەرچەندە وشەی (دُولة) لە قورئاندا هاتوە: ﴿ ...كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ ... ﴿٧﴾ ﴾ الحشر. واتە: ... بۆ ئەوەی ماڵو سامان تەنیا لەنێو دەوڵەمەندەکانتان دا کورت هەڵنەیەت..

ئنجا هەرچەندە وشەی (دُولة) لە ئایەتەکەدا مانای خستنە ژێر ڕکێفی خۆو دەست بەسەر داگرتن (إستیلاء) دەگەیەنیّو، ئەوەش لەمانای دەوڵەتەوە نیزیکە، بەلاّم ئەوە جیایە لەو چەمكو واتایەی ئێستا وشەی دەوڵەت دەیگەیەنیّ.

شایانی باسیشە وشەی ناوبراو لە ڕابردوودا نە لەنێو مسوڵمانانو نە لەنێو نامسوڵمانانیش دا، بەمانای قەوارەی سیاسیی بەکار نەهێنراوە.

ئنجا هەرچەندە هەتا ئێستا بەتەواویی بۆم ڕوون نەبۆتەوە کە ئایا سەرەتای بەکارهێنانی وشەی ناوبراو بەو چەمكو واتایای ئێستای، کە بریتیە لە قەوارەی سیاسیی، کەی بووە؟ بەلاّم دڵنیام کە ئەوەی مێژوو زانانی هاوچەرخ لە کتێبەکانیان دا دەینووسن بۆ وێنە:

(الدولة النبوية)، (الدولة الراشدية)، (الدولة الأموية)، (الدولة العباسية)، (الدولة الأيوبية)، (الدولة السلجوقية)، (الدولة البويهية).

مانای وانیە کە کاتی خۆی ئەو وشەو زاراوەیە بۆ ئەو قەوارە سیاسییانە بەکارهاتوە، بەلّکو مێژووزانانی هاوچەرخ لە ڕۆژگاری خۆیانەوە وشەی ناوبراویان وەك ناوونیشان بۆ ئەو قەوارە سیاسییانە بەکارهێناوە.

ئێستاش با سەرنجی بیروڕای هەندێك لە پسپۆڕو شارەزایانی بواری فیقهی سیاسییو دەستووریی‌و یاسایی بدەین، بزانین چۆن پێناسەی (دەوڵەت) دەکەن؟

یەکەم: (د. محمد کامل ليلة) لە کتێبی (النظم السياسية: الدولة والحكومة)[1] دا چەند پێناسەیەك بۆ دەوڵەت دێنێتەوە، یەکێکیان هی (بلنتشلي) سویسرپیە کە دیارە ئەو بە عەرەبیی تەرجەمەی کردوە، دەڵیّ: (**الدولة: جماعة مستقلة من الأفراد يعيشون بصفة مستمرة على أرض مُعَيَّنة**

[1] ص ٢٥، ٢٦.

**بينهم طبقة حاكمة وأخرى محكومــة)**. واتــه: دەوڵـەت بریتیـه لـه کۆمەڵـه تــاکێکی ســەربەخۆ کــه بەشــێوەیەکی بــەردەوام لەســەر ســەرزەمینێکی دیاریکراودا دەژین، لـه نێویـان دا چینێکی حوکمڕان هەیـەو چینێکیش کە حوکمیان بەسەردا دەکرێ.

دووەم: یەکێکی دیکە لەو زانایانەی بواری سیاسیی کە پێناسەی دەوڵەتی کردوە (هۆلاند)ی ئینگلیزییە، ئەویش پێناسەکەی لەوەی پێشوو نزیکە، دەڵێ: **(الدولة مجموعة من الأفراد يقطنون إقليمــاً معينــاً ويخضــعون لسـلطان أغلبية أو سلطان طائفة منهم)**[1] واته: دەوڵەت بریتیە لە کۆمەڵە تاکێك کـه لەســەر هــەرێمێکی دیــاریکراو نیشــتەجێن، وە ملکـەچ دەکـەن بـۆ دەسەلاتی زۆرینە، یاخود دەسەلاتی کۆمەڵێك لەو کۆمەڵگایەدا.

سێیەم: یەکێکی دیکە لەو زانایانە (وێلسن)ی ئەمریکییـە، کـه یـەکێك بـووە لـە سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا، ئەویش دەوڵەت ئاوا پێناسە دەکاتو دەڵێ: **(شعبٌ منظم خاضــعٌ لقــانون يقطنــون أرضــا مُعيَّنــة)**[2] واتـه: گـەلێکی ڕێکخــراون ملکەچــکەرن بــە یاســا، لــە ســەر زەمینێکــی دیــاریکراودا نیشتەجێن.

چوارەم: (المعجم الوسيط)یـش کـه فەرهـەنگێکی نـاوداری هاوچـەرخی زمـانی عەرەبییە، ئەمیش هەر بەو شێوەیەی پێشوو پێناسەی دەوڵەت دەکاتو دەڵێ: **(الدولة: مجموع كبير من الأفراد يقطن بصفة دائمة إقليمياً معينــاً ويتمتع بالشخصية المعنوية و بنظام حكومي و بالإستقلال السياســي)**[3] واته: دەوڵـەت بریتیـه لـه کۆمـەڵێکی زۆر لـه تاکەکان، کە بەشێوەیەکی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] المعجم الوسيط، ص ٣٠٤.

بەردەوام لە نێو هەرێمێك دا (واتە: لەسەر زەمینێكی دیاریكراودا) نیشتەجێن، وە خاوەنی كەسایەتییەكی مەعنەویی یە، وە خاوەنی سیستەمێكی حوكمڕانییە، وە خاوەنی سەربەخۆیی سیاسییە.

ئەگەر تەماشای سەرجەم ئەم چوار پێناسەیە بكەین، كە دیارە پێناسەی دیكەیش زۆرن، بەڵام هەموویان لەو چوار چێوەیەدا كۆدەبنەوە، كە دەوڵەت پێویستی بە سێ بنەما هەیە:

١) كۆمەڵە خەڵكێك، كە هەندێك جار بە گەل (شعب) ناو دەبرێ‌و هەندێك جار بە كۆمەڵ (أمَّة)و هەندێك جاریش بە كۆمەڵە تاكێك (مجموع من الأفراد).

٢) سەرزەمینێكی دیاریكراو.

٣) دەسەڵاتێكی سیاسیی، یانی: دەوڵەت دەبێ ئەو سێ پێكهێنەرەی هەبن: سەرزەمینێك هەبێ‌و، خەڵكێك لەو سەرزەمینە هەبێ، وە دەسەڵاتێكی سیاسیی هەبێ، كە ئەو خەڵكەی ڕێكخستبێ، وە لەو سەر زەمینەدا خۆیان كارو باریان بەڕێوە بەرن.

پێنجەم: كۆتایی ئەم پێناسانەش بە پێناسەیەكی مەوسووعەی ناوداری (ویكیبیدیا) دێنین، كە زیاتر تیشك دەخاتە سەر چەمك‌و واتای (دەوڵەت)و دەڵێ: (**دولة: هي مجموعة من الأفراد يمارسون نشاطهم على إقليمٍ جغرافي محدَّد ويخضعون لنظام سياسي مُعيَّن يتولَّى شؤون الدولة، وتُشرف الدَّولّةُ على أنشطة سياسية وإقتصادية وإجتماعية التي تهدف الى تقدُّمها وازدهارها وتحسين مستوى حياة الأفراد فيها. وينقسم العالم إلى مجموعة كبيرة من الدول، وإن اختلفت أشكالها وأنظمتها السياسية**).

واتە:

دەوڵـەت: کۆمەڵـە تـاکێکن کـە چـالاکی خۆیـان ئـەنجام دەدەن لەسـەر هـەرێمێکی جـوگرافیی دیـارییکراو، ملکـەچ دەکـەن بـۆ سیسـتەمێکی سیاسیی تایبەت، کە کاروباری دەوڵەت بە ئەستۆوە دەگرێ.

وە دەوڵـــەت سەرپەرشـــتیی ئـــەو چـــالاکیە سیاســـیی‌و ئـــابووریی‌و کۆمەلأیەتییانە دەکات، کە دەیەوێ بەرەو پێشـەوەیان بـەرێ‌و، گەشـەیان پێ بداتو، ئاستی ژیان‌و گوزەرانی تاکەکانی تێدا باش بکات.

وە دنیـا بـۆ ژمارەیـەکی زۆر لـە دەوڵـەتان دابـەش دەبـێ، هەرچـەند شێوەکانیان‌و سیستەمەکە سیاسییەکانیان جیاواز بن.

شایانی باسیشە ئێستاکە (٢٣١) دەوڵەت لە دنیادا هەیە[١] کە هەیانە وەك:
کۆماری چینی گەلیی (جمهورية صين الشعبية) ژمارەی دانیشتووانی لە ملیار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠)ێك کەس تێپەڕیوەو، هەشیانە زۆر بچووکەو ژمارەی دانیشتووانی ناگاتە ملیۆنێك، وەك هەندێك لە دەوڵەتانی کەنداو.

## ٢- حکوومەت (الحکومة):

وشـەی حکوومـەت کـە لـە زمـانی کـوردی دا وشـەی (میریـی) بـۆ بـەکاردێ‌و، ئەگەر ناخۆشویستراویش بێ وشەی (ڕژێم).

شایانی باسـە کـە وشـەی (حکومـة)یش لـە قورئانـدا نـەهاتوە، بـەلأم وشـەی (حُکْم)و زۆر لە ڕێژگە (صیغة)کانی زۆر دووبارە بۆتەوە وەك:
**(حَکَمَ، یحکم، یَحْکُمان، حکمت، فاحکم، حَکَمْ،، حَکَمَیْن، حاکمین)**، بەلأم بە سـەرنجدانی ئـەو وشـانە لـەو سـیاقانەدا کـە تێیانـدا هـاتوون‌و سـەرنجدانی سـەرنجدانی مانـاو چـەمکی ڕیشـەیی وشـەکەش لـە زمـانی عـەرەبیی دا، بۆمـان دەردەکەوێ کە زیاتر مەبەست پێی:

---

[١] بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٩٨)، وەك لە سایتی (شبکة رحمة) دا هاتووە.

دادوەریی کردن (القضاء)و بڕیاردانو[1] لێزانیی (حیکمەت) دێ، گرنگ ئەوەیە وشەی (حکومة) بەو چەمكو واتا زاراوەیی یە باوەی ئەم ڕۆژگارە، کاتی خۆی بەکارنەهێنراوەو بەمانای: دادوەریی کردنو لەیەك جیاکردنەوەی ناکۆکیەکان (القضاء والفصل بين الخصومات) بەکارهاتوە.

بەڵام لەم ڕۆژگارەدا وشەکانی: (حکومة)و (حُکم) ماناو چەمکێکی تایبەتییان هەیە، با سەرنج بدەین:

١- خاوەنی (المنجد) گوتوویەتی:

**(حَكَمَ يحكم حُكْماً وحكومة في البلاد: تولّى إدارة شؤونها، فهو حاكم ج: حُكّام... الحكومة: (مص): أرباب السياسة والحكم// الهيئة الحاكمة المؤلَّفة مِمَّن يتولّون إدارة شؤون البلاد)**[2] وەك دەبینین خاوەنی (المنجد) هەرکام لە وشەکانی: (حکم و (حکومة)ی بەمانای بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، یان:دەستەی حوکمڕانی پێکهاتوو لە بەئەستۆوە گرانی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، تەفسیر دەکات.

٢- خاوەنی (الإسلام والدستور) لەبارەی پێناسەی (حکومة)ەوە گوتوویەتی:

**(الحكومة: هي الهيئة التي تمتلك القوة الشرعية لفرض الترتيبات والأحكام والقوانين اللازمة للحفاظ على الأمن والإستقرار في المجتمع وتنظيم حياة الأفراد المشتركة).**[3]

واتە: حکوومەت ئەو دەستەو پێکهاتەیە کە هێزی شەرعییەتی هەیە بۆ سەپاندنی ڕێكو پێکیی و ڕێساو یاسا پێویستەکان بۆ پاراستنی هێمنیی و ئارامیی لە کۆمەڵگاداو ڕێکخستنی ژیانی هاوبەشی تاکەکان.

---

[1] المعجم الوسيط، ص ١٩٠، والمنجد، ص ٢٤٦.

[2] المنجد، ص ١٤٦.

[3] الإسلام والدستور، لتوفيق بن عبدالعزيز السديرى.

٣- (د. أحمد عطية الله) خاوەنی: (المعجم السياسي الحديث) لەبارەی پێناسەی حکوومەتەوە گوتوویەتی: **(الحكومة (أ): المؤسسة ( the institution) تلك المؤسسات التي تضع القواعد وتُنَفِّذُها في شكل قرارات مُلْزِمة لجماعة سياسية: سواء كانت دولة أو مدينة أو إقليماً أو قبيلة أو أو أية منظمة أخرى وكما تعني الكلمة: نشاط الحكم، أي: وضع القواعد وتنفيذها وتقديم التحكيم بشأن تنفيذها، ونشاطات الحكومة هذه توصف غالباً بأنها وظائف تشريعية وتنفيذية وقضائية، وفي معنىً أضيق قد تعني الكلمة الفرع التنفيذي وحده...)**.[1]

واتە: حکوومەت بریتیە لەو دامەزراوانەی کە بنچینەکان لە شێوەی بڕیارە پابەندکەرەکاندا بۆ کۆمەڵێکی سیاسیی دادەنێن و جێبەجێشیان دەکەن: چ دەوڵەت بن، یان شار، یان هەرێم، یان هۆز، یان هەر ڕێکخراوێکی دیکە، هەروەها ئەو وشەیە بەمانای چالاکیی حوکمڕانیی دێ، واتە: دانانی یاساکان و جێ بەجێکردنیان و دادوەریی کردنیش لەبارەی جێبەجێکردنیانەوە.

ئنجا ئەو چالاکییانەی حکوومەتیش بە زۆریی وا وەسف دەکرێن کە بریتین لە: ئەرکەکانی: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی کردن، جاری واشە وشەکە بەمانا تەسکەکەی، تەنیا لقی جێبەجێکردن دەگرێتەوە.

شتێکی ئاشکراشە کە بەهۆی بەرەو پێشچوونی ژیانی سیاسی کۆمەڵگاکانی بەشەرو بەردەوام لە گۆڕاندا بوونییەوە، ئەو وشەو زاراوە سیاسییانەش کە پێیەوە پەیوەستن، زۆر سەقامگیر نین و کەم و زۆر گۆڕانکارییان بەسەردادێ و

[1] ص ١٨٨، ١٨٩.

ڕاجیایی زۆریشیان تێدا پەیدا دەبێ، شایانی باسیشە لەم ڕۆژگارەدا وشەی حکوومەت بەچەند واتایەك بەکاردێ:

١- تەشکیلکردنی وەزارەتەکان(تشكيل الوزارة): واتە: جیا لەسەرۆ وەزیران و سەرۆك کۆمار -ئەگەر هەبێ-.

٢- هەروەها وشەی حکوومەت بەکاردێ بۆ دەستەڵاتی جێبەجێکرد بەتایبەت (السلطة التنفيذية) واتە: سەرۆك وەزیران و وەزیرەکانی، واتە: خۆی و کابینەکەی.

٣- وە بە واتایەکی فراوانتریش بەکاردێ بۆ هەرسێ دەستەڵاتەکان واتە: دەستەڵاتی یاسادانان و، دەستەڵاتی جێبەجێکردن و، دەستەڵاتی دادوەریی، بۆ کۆی هەرسێ دەسەڵاتەکان بەکاردێ.

٤- هەندێك جارانیش خەڵك حکوومەت بە مانای دەوڵەتیش بەکاردێنن، بەڵام دیارە لەلای شارەزایان و پسپۆڕان ئەوە هەڵەیەو دەوڵەت جیایە.

دەتوانین بۆ لەیەك جیاکردنەوەی چەمکی دەوڵەت و حکوومەت بڵێین: ئەگەر سەیارەیەك هەبێت، هەموو سەیارەکە دەوڵەتە، وە ئەو مەکینەیەی کە ئیش بە سەیارەکەدەکات و دەیجووڵێنێت حکوومەتە، یان بۆ نموونە ئەگەر وەك ئینسان دایبنێین: دەوڵەت وەك هەموو جەستەی ئینسان بە هەموو ئەندامەکانییەوە وایە، وە ئەو عەقڵ و هۆشە کە جەستەکە دەجووڵێنێ و ئەندامەکانی بەکاردێنێ، بریتیە لە حکوومەت.

٣- دەستوور:

وشەی (الدستور) فەرهەنگی (المعجم الوسيط) ئاوا پێناسەی کردوە:

**(الدستور: القاعدة يعمل بمقتضاها، والدستور: الدفتر تكتب فيه أسماء الجند ومرتباتهم، والدستور في الاصطلاح المعاصر: مجموعة القواعد**

**الأساسية التي تتبين شكل الدولة ونظام الحكم فيها ومدى سلطتها إزاء الأخرى، ج: دساتير)**[1]

واتە: دەستوور بنچینەیەکە کە کاری پێدەکرێ، وە دەستوور ئەو دەفتەرەیە کە ناوی سەربازان و مووچەکانیانی تێدا تۆمار دەکرێ، وە لە زاراوەی هاوچەرخ دا دەستوور: ئەو کۆمەڵە بنچینە بناغەیی یانەن کە شێوەی دەوڵەت و سیستەمە حوکمڕانییەکەی دیاریی دەکات، وە ئەندازەی دەستڕۆیشتوویی بەرانبەر بە تاکەکان دیاریی دەکات، کۆیەکەی دەستووره ن.

٢- وە مەوسووعەی (ویکیبیدیا) ئاوا پێناسەی دەستووری کردوە:

**(الدستور(Constitution) هو القانون الأعلى الذي يتحدد القواعد الأساسية بشكل الدولة (بسيطة أم مُركّبة)، ونظام الحكم (ملكي أم جمهوري)، وشكل الحكومة (رئاسية أم برمانية)، ويُنظم السلطات العامة فيها من حيث التكوين والإختصاص والعلاقات التي بين السلطات، وحدود كل سلطة، والواجبات والحقوق الأساسية للأفراد والجماعات، ويضع الضمانات لها تجاه السلطة، ويشمل اختصاصات السلطات الثلاث: السلطة التشريعية والسلطة القضائية والسلطة التنفيذية، وتلتزم به كل القوانين الأخري مرتبة في الهرم التشريعي.....)**

واتە: دەستوور: کۆنستیتیۆشن: ئەو یاسا باڵایەیە کە بنەما بناغەییەکانی دیاریی دەکات، شێوەی دەوڵەت (سادە یان لێکدراو بێ) وە سیستەمی حوکمڕانیی (پادشایی یان کۆماری) بێ، وە شێوەی حکوومەت (سەرۆکایەتی یان پەرلەمانی بێ) وە دەستەڵاتە گشتییەکانی تێدا ڕێکدەخات لە ڕووی پێکهاتەو صەڵاحییەتەوە، وە لە ڕووی پەیوەندی

---

[1] ص ٢٨٣.

یـەکانی نێـوان دەسـتەڵاتەکانو سـنووری هـەر دەسـتەڵاتێك، وە ئـەركو مافـە بنەڕەتییـەکانی تاکـەکانو کۆمەڵـەکان، وە زەمانەتـەکانیان لـە بەرانبەر دەستەڵات دا بۆ دادەنێ.

وە دەستوور صەڵاحیەتی هەرسێك دەستەڵاتەکە دەگرێتـەوە: دەسـتەڵاتی یاسـادانان و دەسـتەڵاتی دادوەریـیو دەسـتەڵاتی جـێ بـەجێ کـردن، وە سەرجەم یاساکانی لە ڕووی ڕیزبەنـدیی یاسا دانانـەوە، لـەخوارەوەینی و پێیەوە پابەند دەبن.

٣- (د. أحمد عطية بن سعيد) له (المعجم السياسي الحديث) ئاوا پێناسەی دەستوور دەکات:

**(الدسـتور (Constitution) بيـان جـوهري بـالقوانين الـتي تحكـم وظائف المؤسساة السياسية في مجموعة سياسية والعلاقات بينها، أو بيان بالقيود الموضوعة على صلاحيات المؤسسات من هذا القبل وتحتوي عادة قائمة بحقوق المواطنين وفي معظم الحالات يكون الدسـتور وثيقـة مدونـة مصنفة واحدة، غير أن لبعض الدول مثل المملكة المتحـدة دسـتوراً غـير مدون، لأنه لا توجد وثيقة مصنفة واحدة تتضمن الدستور، ولأن الدستور يعد مكوّناً على نحو جزئي من أعراف غير مدوَّنة).**[1]

واتە: دەستوور ڕوونکردنەوەیەکی بنـەڕەتیی ئـەو یاسایانەیە کە ئەرکـە دامـەزراوەیی یـە سیاسـییەکانو پەیوەنـدیی نێوانیـان ڕێـك دەخـەن لـە کۆمـەڵێکی سیاسـی دا، یـان دەسـتوور: ڕوونکردنـەوەی ئـەو کـۆتو بەندانەیـە کـە دەخرێتـە سـەر صـەڵاحیەتی ئـەو جۆرە دامەزراوانـە، وە عادەت وایە کە لیستی مافەکانی هاووڵاتیانیشی تێدایە.

---

[1] ص٩٨.

وە بـە زۆریـی وایـە کـە دەسـتوور دیکـۆمێنتێکی نووسـراوی یەکپارچـە دەبێ، بەڵام هەندێك دەوڵەتیش وەکە شانیشینی یـەکگرتوو (بـەریتانیا) دەستوورێکی نە نووسراوی دەبێ، چونکە نووسراوێکی یەکپارچـەی نـابێ کە دەستوور بگرێتـە خـۆی، وە لەبـەر ئـەوەی دەسـتوور (لـەو حاڵەتـەدا) بەشێوە جوزئیی لە چەند عورفو باوێکی نەنووسراوە پێك دێ.

پێم وایە دوای ئەو سێ پێناسەیەش پێویستی بە ڕوونکردنەوەی دیکە ناکات لە بارەی چەمكو واتای دەستوورەوە.

٤- قانوون (القانون):

١- (المعجم الوسيط) ئاوا پێناسەی (قانون)ی کردوە، کە لە کوردیی دا (یاسا)ی پێ دەڵێن:

**(القانون: مقياس كل شيء وطريقُهُ (رومية وقيل: فارسية) والقانون في الإصطلاح أمر كلي ينطبق على جميع جزئياته التي تتعرف أحكامُها منه، والقانون: الأصل)**[1]

واتـە: قـانوون پێـوەرو ڕێبـازی هەرشـتێکە (لـە ئەسـڵ دا ڕۆمـی وە گوتراویشە: فارسییە)، وە قانوون لە زاراوەدا: حوکمێکی گشتی یە بەسەر تێکرای بەشـەکانی دا دەچەسپێ، ئـەو بەشـانەی کـە حوکمیـان لـە وەوە دەزانرێ، وە قانون یانی: ئەسڵو بناغە.

٢- مەوسووعەی (ویکیبیدیا)ش لە بارەی ڕیشـەی وشـەی (قانون)و چـەمكو واتایەکەیەوە گوتوویەتی:

**(القانون: كلمة يونانية الأصل تلفظ كما هي (Kanun) وانتقلت مـن اليونانية الى اللغات الأخرى وهي تعني: العصا المستقيمة فانتقلـت الى**

---

[1] المعجم الوسيط، ص ٧٦٣.

الفارسية بنفس اللفظ (كانون) بمعنى أصل كل شيء وقياسهُ، ثُم عُرِّبت عن الفارسية بمعنى الأصل، ودرج استخدامها بمعنى أصل الشيء الذي يسير عليه أو المنهج الذي يسير بحسبه، أو النظام الذي على أساسه تنظم مفردات الشيء وتكون متكررة على وتيرة واحدة بحيث تكون خاضعة لنظام ثابت، فيقال: قانون الجاذبية، وقانون العرض والطلب...

ولتعريف القانون اصطلاحاً ثلاثة تعريفات:

١- تعريف اصطلاحي عام: وهو القواعد التي تنظم سلوك الأفراد في المجتمع تنظيماً ملزماً، ومن يخالفها يعاقب وذلك كافية لاحترامها.

٢- تعريف اصطلاحي اعتباراً بالمكان: وهو مجموعة القواعد النافذة في بلد ما فيقال: القانون الفرنسي والقانون المصري مثلاً.

٣- تعريف اصطلاحي باعتبار الموضوع: وهو مجموعة القواعد المنظمة لأمر معين وضعت عن طريق السلطة التشريعية، فيقال: قانون الملكية العقارية، أو قانون المحاماة، أو قانون الجامعات).[1]

واتە: قانوون وشەیەكی بە ئەسڵ یۆنانییە وەك خۆی دەبینرێ قانو (kanun)، پاشان لە یۆنانییەوە پەڕیوەتەوە بۆ زمانەكانی دیكە، وە بەمانای گۆچانی ڕاست دێ، پاشان بەهەمان بێژە (قانون) گوازراوەتەوە بۆ زمانی فارسی بەمانای: بناغەو پێوەری هەرشتێك، پاشان لە فارسییەوە گوازراوەتەوە بۆ عەرەبی بە مانای بناغە، وە كرا بە عادەت كە بە مانای بناغەی شتێك یان بەرنامەیەك كە لە سەری دەڕوات، یان سیستەمێك كە بەگوێرەی وی تاكە دووبارە بووەكانی شتێك ڕێك

[1] ویكیبیدیا لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

دەوەستن، وەك ملكەچ بـن بـۆ یاسـایەكی چەسپاو، دەگـوترێ: قـانوونی كێش كردن... قانوونی ڕانواندنو داواكردن...

وە لە ڕووی زاراوەیی یەوە قانوون سێ پێناسەی هەن:

١- پێناسـەیەكی زاراوەیـی گشـتی: كـە بریتیـە لـەو بنچینانەی بـە شێوەیەكی پابەندكەرانە ڕەفتاری تاكەكانی كۆمەڵگا ڕێك دەخـەن، كـە هەركـەس سەرپێچـییان لـێ بكـا سـزا دەدرێ، ئـەویش بـە مەبەستی ڕێز لێگیرانی ئەو بنچینانە.

٢- پێناسەیەكی زاراوەیی لـە ڕووی شوێنەوە: كـە بریتیـە لـە كۆمەڵـە بنچینەیەكی كارپێكراو لە وڵاتێك دا، بۆ وێنە: دەگوترێ: قانوونی فەڕەنسییو قانوونی میصریی.

٣- پێناسەیەكی زاراوەیی لە ڕووی بابەتییەوە: كە بریتیە لـە كۆمەڵـە بنچینیەكی ڕێكخەر بۆ كارێكی تایبەت كە لە ڕێی دەستەڵاتی یاسا دانانـەوە دانـراون، دەگوترێ: یاسای زانكۆیەكان.

٣- (المنجد)یش ئاوا پێناسەی (قانون) دەكات:

**(قانون ج قوانين..... مجموعة الشرائع والنظم التي تنظم علاقات المجتمع سواء كان من جهة الأشخاص أو من جهة الأحوال).**[1]

واتە: قانوون كۆیەكەی قانوونەكانە، كۆی ئەو بریارو یاسایانەیە كە پەیوەندییەكانی كۆمەڵگا ڕێكدەخەن چ لەلایەنی كەسەكانەوەو، چ لەلایەنی سامانەكانەوە.

---

[1] المنجد في اللغة والأعلام، ص ٦٥٦، ط ٤٣.

٥- سیستەمي حوكمرِانيي (نظام الحكم):

مەوسووعەی (دیکیبیدیا) ئاوا پێناسەی سیستەمی حوکمڕانیی دەکات:
**(النظام السياسي في صورته الهيكلية: هو عبارة عن مجموعة المؤسساة التي تتوزع بينها عملية صنع القرار السياسي، وهي المؤسساة التشريعية والتنفيذية والقضائية)**[1] واتە: سیستەمی حوکمڕانیی لە شێوەی پەیکەرییەکەی دا: بریتییە لەو کۆمەڵە دامەزراوەیەی کە پڕۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسییانی بەسەردا دابەش دەبێ، کە بریتییە لە دامەزراوەکانی یاسادانان و جێ بەجێ کردن و دادوەریی کردن.

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی سادەو ئاسان پێناسەی سیستەمی حوکمڕانیی (النظام الحکم) بکەین، بە هەموو جۆرو شێوەکانییەوە، وەك تۆزێکی دیکە باسیان دەکەین، دەتوانین بڵێین:

سیستەمی حوکمڕانیی بریتییە لە چۆنیەتی و شێوەی حوکم کردن و بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگاو وڵات، واتە: ئەو دەستەڵاتە سیاسییە چۆن خەڵك و وڵات بەڕێوە دەبات و کاروبارەکانیان ڕێك دەخات، لە هەرسێك بوارەکانی یاسا دانان و جێ بەجێ کردن و دادوەریی دا؟

شایانی باسیشە سیستەمەکانی حوکمڕانیی (أنظمة الحکم) زۆر جۆرن، بەڵام دەگونجێ بیانخەینە ژێر شەش ناوونیشانەوە:

یەکەم: لە ڕووی چۆنیەتی دانانی بەرپرسی یەکەمی ئەو قەوارە سیاسییەوە، لەو ڕووەوە، دوو جۆرن:

١- پادشایەتی (ملکي).

٢- کۆماریی (جمهوري).

---

[1] بڕوانە: (ویکبیدیا) لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

پادشایەتیی کە میراتیی (وراثي)یش پێ دەڵێن، ئەوەیە کە حوکمڕان پشتاو پشت بەو دەستەڵاتە دەگات، لە بابەوە بۆ کوڕ (یان کچ) لەوە وە بۆ نەوەو ..... هتد.

دیارە ئەو کەسە یەکەمە دەگونجێ نازناوی پادشا (ملك) هەڵبگرێ، یان ئەمیر، یان سوڵتان، یان ئیمپڕاتۆڕ یان قەیصەر.. یان هەر نازناوێکی دیکە، وەك خەلیفە، شا...

بەڵام کەسی یەکەم لە سیستەمی حوکمڕانیی کۆمارییدا کە پێی دەگوترێ: (رئيس الجمهور) بە کوردیی سەرۆك کۆمار، سەرۆك جەماوەر، تایبەتمەندییەکەی ئەوەیە کە خەڵك هەڵیبژاردوەو میراتیی نیە، ئنجا خەڵك بە چ شێوەیەك دیاریی دەکات؟ ئەوەش مەرج نیە تەنیا جۆرێك بێ، دەگونجێ لە پەڕلەمان دا دیاریی بکرێ، دەشگونجێ کە ڕاستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێ.

دووەم: ناوونیشانی دووەم بۆ دیاریکردنی سیستەمەکانی حوکمڕانیی، لە ڕووی ملکەچبوون یان ملکەچ نەبوون بۆ یاساوەیە، لەو ڕووەوەش دەبنەوە بە دوو جۆر:

١- سیستەمی حوکمڕانیی یاسایی.

٢- سیستەمی حوکمڕانیی نایاسایی.

ئەوەی کە پابەندە بە دەستوورو قانوونەوەو ملکەچ بکات بۆ دەستوورو قانوون، پێی دەگوترێ: یاسایی، ئەوەش کە خۆی لە سەرووی دەستوورو یاساوە حیساب دەکات، پێی دەگوترێ: نایاسایی، یاخود نادەستووریی.

سێیەم: لە ڕووی دەستەڵاتەوە، کە ئایا دەستەڵات لەدەست کەسێك دا چڕ دەبێتەوە، یان لەدەستەیەك دا، یاخود دابەش دەبێت بەسەر چەند لایەنێك دا؟ لەو ڕووەشەوە دوو جۆرن:

١- سیستەمی حوکمڕانیی ڕەها، یان گشتگیر (شمولي).
٢- وە سیستەمی حوکمڕانیی بەستراوە (مقيّد).

چوارەم: وە لەڕووی گەڕانەوەی سەرچاوەی دەسەڵاتەوە، ئایا دەستەڵات بۆ کێ دەگەڕێتەوە، بۆ تاك؟ یان بۆ دەستەیەك؟ یان بۆ گەل‌و خەڵك بەگشتی؟! لەو ڕووەشەوە سێ جۆر سیستەممان هەیە بۆ حوکمڕانیی:

١- سیستەمی حوکمڕانی تاکیی (نظام الحكم الفردي) کە (ئۆتۆکڕاسیی)یشی پێدەڵێن.
٢- سیستەمی حوکمڕانیی توێژیی (نظام الحكم الطبقي).
٣- سیستەمی حوکمڕانیی جەماوەریی (نظام الحكم الجمهوري).

پێنجەم: وە سیستەمەکانی حوکمڕانیی لەڕووی جۆری دیموکڕاسییەوە، سێ جۆرن:

١) دیموکڕاسیی ڕاستەوخۆ (الديمقراطية المباشرة)، کە خەڵك هەمووی سەرۆك‌و شەخصی یەکەم هەڵدەبژێرن وەك لە یۆنانی کۆن دا بووە، یان وەك ئێستا لیبیا ئیددیعای ئەوە دەکات.[1]

٢) سیستەمی دیموکڕاسیی نیمچە ڕاستەوخۆ (الديمقراطية شبه المباشرة)، کە لەلایەکەوە خەڵك‌و جەماوەر نوێنەران هەڵدەبژێرن‌و پەرلەمانێك پێك دێ، لەلایەکی دیکەشەوە لە مەسەلە چارەنووس سازەکان دا دەگەڕێنەوە بۆ ڕای خەڵك، لە ڕێی دەنگدانی گشتییەوە.

---

[1] پێش سەر بەفەتارەت چوونی قەززافی گوتراوە.

٣) دیموکڕاسیی نوێنەرایەتیی (الديمقراطية النيابية) ئەویش ئەوەیە کە خەڵك‌و جەماوەر پەرلەمان هەڵدەبژێرن‌و، دواتر پەرلەمان بەرپرسەکان هەڵدەبژێرێ، بە هەموو پێگەکانیانەوە.

شەشەم: وە لەڕووی جۆری پەرلەمانەوە دەبنەوە بە سێ جۆر:

١- سیستەمی پەرلەمانیی، کە ئەوەیە سەرۆك، پەرلەمە هەڵیدەبژێرێ، یان سەرۆك کۆمار هەر نیە، یان ئەگەر هەشبێ لە پەرلەمان دا دیاریی دەکرێ‌و، سەرۆك لەبەردەم پەرلەمان دا بەرپرسیارە.

٢- سیستەمی سەرۆکایەتیی، وەك لە ئەمریکاو لە هەندێك ولآتانی دیکەدا هەیە، کەسەرۆك کۆمار ڕاستەوخۆ لەلایەن خەلکەوە هەڵدەبژێردرێ‌و، دەستەلآتی زیاترەو دەستی کراوەتر دەبێ.

٣- سیستەمی کۆمەڵەیی(نظام الجمعية) وەك لە سویسرا هەیە، کە ڕاستەوخۆ بە هەرەوەزیی دەستە جەمعیی حوکم دەکرێ، واتە: تاك حوکم ناکات، نە تاکێك کە پەرلەمان هەڵیدەبژێرێ، وە نە تاکێك کە ڕاستەوخۆ جەماوەر هەڵیدەبژێرێ، بەلکو کۆمەڵە کەسێك هەڵدەبژێررێن‌و وێکڕاو پێکەوە حوکمی ولآت دەکەن.

ئەمانە بە گشتی جۆرەکانی سیستەمی حوکمڕانیین، کە لەم ڕۆژگارو سەردەمەی ئێمەدا هەن.

خوێنەری سەنگین!

وەك بینیت، ئێمە لە خستنەڕووی جۆرەكانی سیستەمی حوكمڕانیی دا هەروەها پێشتریش لەكاتی پێناسەی: دەوڵەتو حكوومەتو دەستوورو یاسادا، كەمو زۆر باسی هەڵوێستی ئیسلامو شەریعەتەكەیمان نەكرد!

هۆكاری ئەوەش هەر ئەوەیە كە ئێمە لەم بەشی چوارەمەدا تەنیا مەبەستمان ئەوەبوو، كە هەموو لایەك بەرچاوڕوونیی مان هەبێ، لەبارەی چەمكو واتای ئەو پێنج وشەو زاراوە سەرەكییەوە، كە كۆی باسو بابەتەكانی ئەم كتێبەمان بە هەر چوار تەوەرە سەرەكییەكەیەوە، پێیانەوە پەیوەستن.

ئاشكراشە كە هەرسێك تەوەری داهاتووی ئەم كتێبە، ئامانجی سەرەكیی لێیان تیشك خستنە سەر سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامییە، بۆیە لەم بەشەدا بە پێویستمان نەزانی هیچی لەبارەوە بڵێین.

لێرەش دا كۆتایی بەم تەوەری یەكەمە دێنینو، ڕوو دەكەینە تەوەری دووەمی ئەم كتێبە، لە بەرگی دووەم دا، كە گەورەترینو گرنگترین تەوەرو زۆرترین پانتایی (مساحة)ییشی بۆ تەرخان كراوە.

# نێوەرۆك

## بەشی سێیەم: سیستەمی حوکمڕانیی (نظام الحکم) لە ئیسلام دا............ ١٧٧



## بەشی چوارەم پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك ............ ٢٤٣

ISLAM AND THE STATE

## ئەم کتێبە

بەهەرچوار تەوەرەکەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی نەفەس درێژانەیە لەبارەی دەوڵەتداریی و حوکمرانییەوە لەئیسلامدا و، وەڵامی چەند پرسیارێکی گرنگی لەوبارەیەوە گرتۆتە خۆی:

١| ئایا ئیسلام بەسروشت دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دەخوازێ؟

٢| ئایا تایبەتمەندییەکانی قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا چی و چین؟

٣| ئایا بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئسلامیی چەندن و چۆنن؟

٤| ئایا سێ دەستەڵاتەکانی: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی لەئیسلامدا چۆنن و سنوورو صەڵاحەتیان چییەو چۆنە؟

٥| ئایا نامسوڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا چۆن تەماشایان دەکرێ و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ؟

ئەمانەو گەلێک پرسیارو ئیشکالی دیکەش لەم کتێبەدا، وەڵام دراونەتەوەو چارەسەر کراون.









نوسینگەی تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com


